

دەزگای
چاپ و
پەخشی
سەردەم

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# ڕێزمانی کوردی

بەرگی یەکەم

## (وشەسازی)

بەشی پێنجەم

## - کردار -



سلێمانی - ٢٠٠٠

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# ڕێزمانی کوردی

بەرگی یەکەم

## (وشەسازی)

بەشی پێنجەم

## - کــردار -

سلێمانی - ٢٠٠٠

# پێشەکی

لە زمانی کوردیدا ناو و کردار بە چەندێتی و هەروەها لە ڕەوەندی کاتدا دوو بەشی هەرە گرنگی ئاخاوتنن ، لەگەڵ ئەوەشدا ناو و کردار لە زۆر ڕووەوە لە یەك جوداوازن :

١- لە ڕووی دەنگەوە .
٢- لە ڕووی وشەڕۆنانەوە .
٣- لە ڕووی وشەسازی‌یەوە .
٤- لە ڕووی ڕستەسازی‌یەوە

جیاوازیی دەنگ لەوەدایە ، کە لە حاڵەتی گەردانی کرداردا تواندنەوە (Assimilation) بەدی دەکرێ ، وەك : (پاراستن : پاراستم > دەپارێزم ...) ؛ (ڕشتن : ڕشتم > دەڕێژم ...)

... بەڵام لە کاتی دۆخی جیاوازی ناودا ئەو جۆرە دەنگانە ناکەونە پاڵ یەك ، لەبەر ئەوە تواندنەوە ڕوونادات [1]

[1] لێرەدا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ، ئەوەیە کە ئەم دیاردەیە لە زمانی ڕووسیدا بە پێچەوانەی کوردی‌یەوەیە - واتە لە کاتی دۆخی جیاوازی ناودا تواندنەوە پەیدا دەبێ و کەچی لە گەردانی کرداردا نی‌یە .

جیاوازی لە وشەڕۆناندا لەوەدایە ، کە کردار لە بوونی پێشگردا زۆر دەوڵەمەندە . گەلێ پێشگری جۆربەجۆر هەن ، دەچنە سەر کردار و واتا و شێوەی دەگۆڕن ، وەك (گرتن – هەڵگرتن) ؛ (بوون – دابوون) ؛ (ماڵین – ڕاماڵین) ؛ (چوون –تێچوون) ؛ (کردن – ڕۆکردن)... و گەلێکی دی . پاشگر زۆر یاریدەی ڕۆنانی کردار نادات . لە ناودا بە پێچەوانەوە ، پاشگر دەوری چالاك دەبینێ لە ڕۆنانیدا . بڕوانە (ئاسن – ئاسنگەر) ؛ (نان – نانەوا) ؛ (نیسك – نیسکێنە) ... هەرچەندە پێشگریش هاریکاریی ڕۆنانی ناو دەکات ، بەڵام زۆر کەمە و ئەو دەورە چالاکە نابینێ ، کە لەگەڵ کرداردا دەیبینێ .

جیاوازیی وشەسازیی نێوان ناو و کردار لە دۆخ و گەرداندایە ، واتە گۆڕانی کردار بە گوێرەی کەس و کات ... و ناو بەسەر ڕاستەوخۆ و تیان... دا . پێویستە ئەوەش لەبیر نەکرێ ، کە لە کرداردا دوو بنەما هەیە : قەد و ڕەگ...

لە ڕووی ڕستەسازی‌یەوە جیاوازییان لەوەدایە ، کە کردار بەشێوەیێکی سەرەکی وەك گوزارە خۆی دەنوێنێ ، بەڵام ناو وەك نیهاد دەردەکەوێ ...

* * *

کردار لە زمانی کوردیدا خاوەنی تایبەتێتی حاڵەتی کەس (یەکەم ، دووەم ، سێیەم) ؛ ژمارە (تاك ، کۆ) ؛ کات (ڕانەبوردوو : ئێستا ، ئایندە ؛ ڕابوردوو : نزیك ، بەردەوام ، تەواو ، دوور) ؛ ڕێژە (ئیخباری ، ئینشائی ، داخوازی) ؛ ئەرێتی و نەرێتی : تێپەڕی و تێنەپەڕێتی ؛ کارا دیاری و کارا

بنزی ؛ سادەیی و ناسادەیی (داڕێژراو ، لێکدراو) ؛ ڕەگ و قەدە... و هەوڵ دەدەین لەم کتێبەدا لە سەرپاکی ئەو باسانە بکۆڵینەوە .

بێگومان هیچ زندە ڕۆیی نییە ، ئەگەر بڵێین ، ئەو کارانەی لەو مەیدانە جۆربەجۆرانەی لێکۆڵینەوەی (کوردان)دا کراون ، گەلێك لەوانە زیاترن ، کە دەربارەی بەشە ئاخاوتنەکانی دی هێنراونەتە بەرهەم . سەبارەت بەو باسە ، وێڕای سەدان لاپەڕە و دەیان وتار و چەندین کتێبی سەربەخۆ و نامەی دوکتۆری و نامەی ماجیستێر بڵاوکراونەتەوە . جا لەبەر زۆریی ئەو لێکۆڵینەوانە ، وەك بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەمان "کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی (کردان)دا کراون" نەبووە فەسڵێکی تایبەتی ... ئەو کورتە هەڵسەنگاندنە ، کە پتر لە دوو سەد لاپەڕەی گرتبووەوە ، بەداخەوە ، لەبەر کێشەی چاپ ، ناچار بووین لێی لادەین . ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لە لایەکەوە هەوڵ و کۆششی پێشڕەوانی ئەو بوارە دەرنەکەوێ و ڕووی باشیی کاریان نەخرێتە بەرچاو و کەم و کورتی و ناتەواوییان چارەسەر نەکرێن... [٢]

هیوامە خوێنەری هێژا لەسەر کارێك گلەییم لێنەکا ، کە لە دەستی خۆمدا نەبێ ... ئاواتمە ئەم نیو چەپکە گوڵەم لێ وەرگرێ و بەختەوەرم بکا ... بەڵێن بێ دەسکە گوڵی گەورەتر و جوانتری بۆ بچنم .

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

---

[٢] ڕەنگە هەندێ پەراوێزی ئەم بەرهەمە و لیستەی سەرچاوەکان کەمێ جێی نەبوونی فەسڵی یەکەم - "کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو کارانەی لەمەیدانی لێکۆڵینەوەی (کردان)دا کراون " - پڕ بکاتەوە .

# کێشەی کردار

لەبەر زۆریی ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی کردار لە زمانی کوردیدا کراون ، رەنگە بیر بۆ ئەوە بچێ ، کە کێشەکانی کرداری کوردی باش ساغ کرابنەوە ... بەداخەوە ، بەو چەشنە نییە و گەلێ لایەن لە سیستەمی کرداری زمانی کوردیدا هێشتا بە ناناشکرایی ماونەتەوە . لەگەڵ ئەوەدا کە سەدان لاپەڕە و دەیان وتار و کتێب لەبارەی باسی هەمەچەشنییەوە بڵاوکراوەتەوە ، کەچی هەندێ لایەنی بە هیچ جۆرێ ڕووناکی نەگەیشتووەتێ .

لە ڕاستیدا باش تێگەیشتنی ئەم سیستەمە ڕێگە بۆ تێگەیشتنی سەرپاکی پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانی کوردی و یاسا ناوخۆییەکانی پێشکەوتنی خۆش دەکات ، چونکە کردار لە پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانی کوردیدا جێگەیەکی دیار و گرنگی هەیە ، وەك : مەودای بەرفراوانی بەکارهێنانی و فۆرمی زۆر و جۆربەجۆری و دەوری لە سازکردنی ڕستەدا ... وێڕای بایەخی گەورەی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی پێکهاتنی ڕێزمانی بە گشتی و تێگەیشتنی یاسای ناوەکی و پێشکەوتن و گەشەکردنی بەتایبەتی ،

هەروەها لە پێشخستنی کاری فەرهەنگنووسیشدا جێ پەنجەی لێکۆڵینەوەی کردار بە ئاشکرا دیارە .

ئەو کێشە گرنگانەی لە لێکۆڵینەوەی سیستەمی کرداری کوردیدا تا ئەمڕۆ بە تەواوی نەگەیەنراونەتە ئەنجام ئەمانەن :

١-کێشەی سنووری کردار وەك دانەیێکی لێکسیکی .

٢-کێشەی سیستەمی حاڵاتی کردار .

٣-کێشەی سیستەمی فۆرمی ڕێزمانیی کردار .

٤-کێشەی پێکهاتنی وشەسازی (مۆرفۆلۆژی)ی کردار

-١-

## کێشەی سنووری کردار وەك دانەییکی لێکسیکی

کێشەی سنووری کردار وەك دانەییکی لێکسیکی هەرچەندە لە ڕوویەکەوە وەك کۆمەڵە پێوەندییکیی یەکگرتوو خۆی دەنوێنێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەسەر چەند یاساییکی تایبەتی خاوەن خاسیەتی جیاوازدا دابەش دەبێ :

یەك – مەسەلەی پێوەندیی نێوان پێکهاتنی بنەمای جیاوازی کردار ، کە بەپێی واتای خودی بنەمای کردارەکە ، یاخود بەپێی بەکارهێنانی گیرەکەوە جیاناکرێنەوە .

لەنێو ئەم پێوەندییانەدا پەنجە بۆ پێنج حاڵەتی سەرەکی ڕادەکێشین :

ا) پێوەندیی نێوان ئەو پێکهاتنانەی تەنیا بەپێی حاڵەتی کەس و ژمارەوە جیادەکرێنەوە . بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| من | دەخۆم |
| تۆ | دەخۆی(یت) |
| ئەو | دەخوا(ات) |
| ئێمە | دەخۆین |
| ئێوە | دەخۆن |
| ئەوان | دەخۆن |

ب)

١- پێوەندیی نێوان پێکهاتنی گوزارەیی ، کە جیاوازیی حاڵەتێك لە حاڵەتەکان نیشان بدا (جگە لە حاڵەتی کەس و ژمارە). بەوێنە ، وەك پێوەندیی نێوان کات و ڕێژە :

من دەخۆم ... خواردم ... خواردبام

٢- پێوەندیی نێوان پێکهاتنی نیهادی ، کە لە ڕووی جیاوازیی خاسیەتی ناوەوە جیاوازی نەکا . بۆ نموونە :

دان – دراو ...

نووسین – نووسراو...

ج) پێوەندیی نێوان پێکهاتنی نیهادی ، کە لە ڕووی خاسیەتی ناوییەوە جیاوازی نیشان دەدا . وەك :

دان – دەدە .

نووسین – نووسەر .

د) پێوەندیی نێوان گوزارە و پێکهاتنی نیهادیی‌یێکی زۆر لێوە نزیک . وەك پێوەندیی نێوان چاوگ و ناوی کارا و ناوی بەرکار...

ه) پێوەندیی نێوان پێکهاتنی پێشگر لەگەڵ پێکهاتنی نیهاد . وەك هەڵگر ، پێ‌خۆر ، وەرگێڕ...

بەهۆی بوونی ئەو حاڵەتە جیاوازانەوە ، پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین ، کە دوو حاڵەتی دوایی ( بەتایبەتی حاڵەتی "د" ) لە هەموان گرانتر و پڕکێشەترە .

لە حاڵەتی (ا) دا ئەو پێوەندی‌یە دەبینین ، کە ڕەنگە وەك ڕێگەیێکی کلاسیکی دیاری کرابێ ، کە ئەویش پێوەندیی نێوان فۆرمی جیاوازی یەك وشەیە : لە کرۆکی ئەم پێوەندی‌یەدا ، مەفهوومی گۆڕینی وشە بنەمایە . بە واتاییێکی دی هاوجووتیی وشە لە فۆرمی جیاوازیدا ، یاخود وشە وەك دانەییێکی فۆرمەکانی ڕێزمانی . ئەم پێوەندی‌یە وەك پێوەندیی نێوان دوو وشەی جیاواز نی‌یە و خاسیەتەکانیشی ڕوونتر و ئاشکراتر خۆیان دەنوێنن .

ئەگەر لە حاڵەتی (ا)دا مەسەلەکە نیشانەی نیسبیی ڕووت بێ ، ئەوە لە حاڵەتی (ب)دا مەفهوومی نیسبی چەسپاوە . بەوێنە پێوەندیی واتایی نێوان دوو کاتی جیاوازی کردارێك ، کە هاوجووتی لە مانای بنەمایاندا هەبێ ، وەك (گەڕام – دەگەڕێم) ، بە هیچ چەشنێك لەو پێوەندیی واتایی‌یە ناچن ، کە لە نێوان دوو کرداری خاوەن پێکهاتنی جیاوازی وەك (گەڕام ، کڕیم)دا هەیە . لە کرداری (گەڕام – دەگەڕێم)دا لەتەك پێوەندیی هاوجووتیی و هاوشانیی واتای بنەمای کردارەکەدا ، هەروەها خاوەنی پێوەندیی هاوجووتی و هاوشانیی تەواوکردنی واتان . بۆ نموونە (ئەوان) گەڕان ، (ئەوان) دەگەڕێن ، نەك هەر لە ڕووی یەکێتیی واتاوە – (گەڕان) پێکەوە بەندن ، بەڵکو لەو ڕووەشەوە کە لە ئاخاوتندا خاوەنی گشتیی واتای گوزارەیین ، جا با لە هەر حاڵەتێکی

رێزمانیشدا بێ : (دەگەڕێن) و (گەڕان) لە (ئەوان دەگەڕێن) و (ئەوان گەڕان)دا ، ئاڵ کرا دیارە ، کە وەك یەك گوزارە ڕادەگەیەنن ، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە یەکێتیی ڕادەیان . ئەم مەسەلەیە پێوەندیی بەرانبەر ڕاوەستانی "دەگەڕێم"ی تاکی "دەگەڕێن"ە لەگەڵ یەکتردا و "گەڕام"یش لە هەمان کاتی "دەگەڕێم"دا نی یە .

لە حاڵەتی (ج)و بەتایبەتی لە حاڵەتی (د)دا پێوەندیی نێوان پێکهاتنی جیاواز ، بێگومان پتر لەیەك دوورن ، چونکە ئەو پێکهاتنانە تەواو پێکەوە نەبەستراون . ڕاستە ، چاوگی (دان ، نووسین...) و ناوی بەرکار (دراو ، نووسراو...) تا ڕادەیێك لە یەك نێزیك دەبنەوە ، ئەویش لەوەدا ، کە هەردووکیان بریتین لە فۆرمی نیهاد ، بەڵام ئەو لە یەکتر نێزیك بوونەوەیە لە بوارێکی یەکجار گشتیدایە . هەرچی ئەو لە یەکتر نێزیکییەشە ، گەلێك لەو جیاوازییە کەمترە ، کە وەك بەشە ئاخاوتنی جیاواز خۆیان دەنوێنن : چاوگ خاسیەتی ناوی تێدایە و ناوی چاوگیش خاسیەتی ئاوەڵناوی هەیە . بەو پێیە – واتە چاوگ و ناوی بەرکار وەك بەشە ئاخاوتن لەیەك دوورن و تەنیا لەباری یەکێتیی بناغەوە بەیەکەوە بەندن .

حاڵەتی (د) ، کە جیاوازیی نێوان تاکە تاکەیە ، ئەو پێکهاتنانە دەگرێتە خۆ ، کە بە واتای گوزارەیی ، یان نیهادی یەك ناگرن . لەبەر ئەوەی گوزارە بە زۆری وەك خاسیەتی کردار جیادەکرێتەوە ، بۆیە نیهاد – واتە فۆرمی ناوی گەلێ جار لەگەڵ سیستەمی فۆرمی کردار دانانرێ . ئەمەش سەربەخۆ جیاکراوەتەوە و لە زووشدا وەك بەشە ئاخاوتنێکی تایبەتی تەماشادەکرا ... کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە زمانناسیی پراکتیکیدا ؛ لە ڕێزمانی پراکتیکی و فەرهەنگدا ، چاوگ و ناوی بەرکار و ناوی کارا و ناوی ئامێر و ناوی چاوگ و ناوی جێگا ... وەك فۆرمی کردار تەماشادەکرێن .

هەرچی حاڵەتی (ه)ە ، لێکۆڵینەوە لێی بایەخێکی گەورەی هەیە لە تەماشاکردنی کێشەی گشتیی سنوورەکانی کرداردا وەك یەك وشە ، چونکە ئەو جۆرە پێکهاتنانە ، پێکهاتنی هەرە نزیکن لە کردارەوە .

دوو – مەسەلەی شیکاری (تحلیلی)ی فۆرمی کردار ، یان کێشەی سنوور لە نێوان شیکاریی فۆرمی کردار و یەککگرتنی دوو فۆرم یان پتر .

ئەم مەسەلەیە بەتەواوی جیاوازیی نێوان شیکاریی فۆرمی وشە و یەککگرتنی نامەنتیقی وشە دیاری دەکا .

سێ – مەسەلەی سنووری واتایی وشە لە بواری کرداردا .

ئەم کێشەیە خاسیەتێکی تایبەتی وەردەگرێ و بەسەر چەند بابەتێکدا دابەش دەبێ . بۆ نموونە :

واتای تێپەڕاندن و واتای تێنەپەڕاندن

واتای کارا دیاری و واتای کارا بزری

-٢-

## کێشەی سیستەمی حاڵاتی کردار

کێشەی سیستەمی حاڵاتی کردار بەسەر دوو مەسەلەی بنەڕەتیدا دابەش دەبێ :

١- مەسەلەی حاڵاتی لێکسیکی و حاڵاتی لێکسیکی ڕێزمانیی کرداری کوردی .

لێرەدا مەبەست لە حاڵاتی لێکسیکی ، ئەو جۆرە دانە زمانییانە خاوەن خاسیەتە گشتییانەن ، کە لە بەراوردکردنی تایبەتێتی واتایی دیاری کراوی

دوو وشه ، یاخود پتردا بەدەردەکەون . ئەگەر ئەو بەراوردکردنە ، لە هەمان کاتدا پێوەندیی بە مەسەلەی ڕێزمانیشەوە هەبوو – واتە بە باری گۆڕان و یەك کەوتنی وشە لە ڕستەدا – ئەوە ئەو حاڵەتەی لێی پەیدا دەبێ ، حاڵەتێکی لێکسیکی – ڕێزمانییە . بۆ نموونە ، لە بەرانبەر یەکتر ڕاکرتنی سیستەمی کرداری کوردیدا ، وشەی وەك (خواردن) و (خواردنەوە) ؛ (نوستن) و (نوستنەوە)... حاڵەتێکی لێکسیکیی ئاشکرا دەبینرێ ، کە دەکرێ وەك حاڵەتی گۆڕینی مەفهوومی وشە دووبارە بوونەوەی پرۆتسێس دیاری بکرێ ، چونکە لەم حاڵەتەدا جیاوازیی نێوان وشەکان بە حاڵەتی ڕێزمانییەوە بەند نییە . لەم حاڵەتە ، حاڵەتی لێکسیکی (ڕووت)ە. بەلاّم ئەگەر بڵێین : (من خواردم ؛ (من) ئاوم خواردەوە ... گۆشتەکە خورا ؛ ئاوەکە خورایەوە... ، ئەوە لەم بارە ، حاڵەتی لێکسیکی –ڕێزمانییە ، کە دەشێ بە حاڵەتی دیاری کردنی (کارا و بەرکار) ناوببرێ . لێرەدا جیاوازیی نێوان وشەکان پێوەندی بە جیاوازیی خاسیەتی ڕێزمانییەوە هەیە .

٢–مەسەلەی سیستەمی حالاّتی ڕێزمانیی کردار .

لەم پرۆتسێسەدا دوو باس جیادەکرێتەوە :

ا) مەسەلەی پێکهاتنی حالاّتی ڕێزمانی – واتە دیاری کردنی حاڵەتە ڕێزمانییەکانی زمانی کوردی (بۆ نموونە : لە زمانی کوردیدا حاڵەتی کارا بزر هەیە یان نا ؟ ئەگەر هەیە خاسیەتەکانی چین ؟ ) .

ئەوەی لێرەدا لەبارەی حالاّتی ڕێزمانییەوە مەبەستە ، دەرکەوتنی جیاوازییە لە ئەنجامی بەراوردکردنی فۆرمی جیاوازی تاکە وشەیەکدا ، نەك جیاوازیی وشەی هەمەجۆر .

ب) مەسەلەی پێوەندیی نێوان حالاّتی جیاجیای ڕێزمانی .

لێرەدا مەبەست لەو بارودۆخەیە ، کە حاڵەتێکی ڕێزمانی ، یان دانەیێکی ڕێزمانی لە سیستەمی کرداردا هەمیشە بەپێی پێوەندی بە حاڵەتێکی دیاری

کراوی ڕێزمانییەوە ، یان دانەیێکی دی دیاری کراوەوە نەردەکەوێ و بێگومان حاڵەتێکی ڕێزمانیی سێیەم نیشان دەدا ... بۆ نموونە لە زمانی کوردیدا کردار کە جێناوی لکاو وەردەگرێ پێوەندیی بە کات و هێز (تێپەڕی و تێنەپەڕی)یەوە هەیە .

-٣-

## کێشەی سیستەمی فۆرمی ڕێزمانیی کردار

کێشەی سیستەمی فۆرمی ڕێزمانیی کردار ، یان بە واتایێکی دی نەخشەی کێش و پێوانەی کردار پێوەندییێکی توند و تۆڵی بەو کێشانەوە هەیە ، کە لە سەرەوە باسمان کردن . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، دەشێ وەك کێشەییێکی سەربەخۆ جیا بکرێتەوە ، چونکە خاوەنی خاسیەتی تایبەتی خۆیەتی ، کە بریتییە لە کۆکردنەوە و یەك خستنی ئەنجامی ئەو کێشانەی پێشتر لێیان دواین ... بۆیە باسی فرەواتایی (Polysemantic) و هاوبێژی (Homonym) فۆرمی ڕێزمانیی کردار مەسەلەی بنەڕەتیی ئەم کێشەیەیە . بۆ نموونە (دەچن) لە (ئێوە دەچن بۆ قوتابخانە)دا و (دەچن) لە (ئەوان دەچن بۆ قوتابخانە)دا . ئەگەرچی وتنی (دەچن) لە هەردوو ڕستەکەدا یەکە ، بەڵام گومانیش لەوە ناکرێ ، کە لێرەدا مەبەست یەك فۆرمی ڕێزمانی نییە ، بەڵکو دوو فۆرمی ڕێزمانیی جیاوازە و پێوەندییان لەگەڵ یەکتردا هەر ئەوەندەیە ، کە هاوبێژی یەکدین . (دەچن)ی ڕستەی یەکەم ، کەسی دووەمی کۆیە و (دەچن)ی ڕستەی دووەمیش بۆ کەسی سێیەمی کۆیە .

-٤-

# کێشەی پێکهاتنی وشەسازیی کردار

کێشەی پێکهاتنی وشەسازیی کردار ، ئەم باسانە دەگرێتەخۆ :

أ) باسی کەرەستەی گۆڕینی کردار .

ب) باسی کەرەستەی ڕۆنانی کردار .

لە تەماشاکردنی بەشە ئاخاوتنەکانی دیدا بینیمان ، کە هەر بەشە ئاخاوتنێک هەمیشە بە ڕوونی بەم یان بەو حاڵەتی وشەسازییەوە بەندە ، کە بریتییە لە خاسیەت و تایبەتێتی ئەو بەشە ئاخاوتنە : ناو – ژمارە ، نۆخ... ! ئاوەڵناو – پلە... هتد .

بێگومان ، ئەو حاڵەتانەی کردار پێکەوە دەبەستن و دەیانکەنە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ ، پێویستە لە کرداردا بۆی بگەڕێین . جا بەجێ هێنانی ئەو کارە وەنەبێ شتێکی ئاسان بێ .

وەك باوە ، خاسیەتی کردار لە حاڵاتی (کەس) و (کات) و (ڕێژە)دا تەماشا دەکرێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەو حاڵەتانە تەنیا بەشێکی فۆرمی کردارن و بۆیە ناتوانن ببنە کەرەستەی جیاکەرەوەی کردار وەك بەشە ئاخاوتنێك .

لە ڕاستیدا ، ئەگەر بۆ نموونە وا دابنرێ ، کە حاڵەتی کەس خاسیەتی وشەسازیی کردار دیاری ئەکا ، ئەوە دەبێ بەرانبەر بە جاوگ و ئەو وشانەی لە جاوگەوە وەردەگیرێن و فۆرمی کەس جیایان ناکاتەوە ، چی بڵێین ؟ وێڕای ئەوە ، حاڵەتی کەس وەنەبێ لە [illegible] نێکدا هەبێ .

حاڵەتی کات زۆر جار وەك خاسیەتی تایبەتی کردار تەماشا دەکرێ ، لەبەر ئەوەی کردار پرۆتسێس رادەگەیەنێ و پرۆتسێسیش لە سنووری کاتدا کاردەکا . بەڵام ئەمە ، ئەوە ناگەیەنێ ، کە بوونی حاڵەتی رێزمانیی کات هەمیشە دەبێ لە کرداردا هەبێ .

وەك دەزانین ، حالاتی رێزمانی لە رێی بەرانبەر یەك رگرانتنی هەندێ (بەلای کەمەوە دوو) ئەمەوە دەردەبڕێ . بەبێ ئەو بەرانبەر یەکتر راگرتنە ناشێ حالاتی رێزمانی دیاری بکرێ . بە نموونە ، حاڵەتی دۆخ ، دەمێ پەیدا دەبێ ، کە فۆرمی دۆخی حالاتی جیاواز هەبێ . ئەگەر لە زماندا تەنیا یەك (دۆخ) هەبێ ، ئەوە لە راستیدا ناکرێ ناوبنرێ دۆخ . بەو پێیە ، ناشێ باسی حالاتی رێزمانیی دۆخ بکرێ . بەو جۆرە ، ئەگەرچی بیری کات راستەوخۆ کەوتووەتە مەفهوومی کردارەوە و لەبەر ئەوەی لە کرداردا هەیە ، دەکرێ لە حاڵەتی رێزمانیی کات بکۆڵرێتەوە و بۆ ئەمەش پێویستە چەند فۆرمێکی کات بەرانبەر یەك رابگیرێن . ئەو جۆرە بەرانبەر یەکتر راگرتنەی سێ فۆرم – ئێستا و رابووردوو و داهاتوو – خاسیەتی رێژەی ئیخبارییە . لە رێژەی داخوازیدا ئەو بەرانبەر یەکتر راگرتنە ناکرێ و حاڵەتی رێزمانی کات لە رێژەی داخوازیدا نییە . لە رووی حاڵەتی کاتەوە ناکرێ بوترێ (بنووسە) کاتی داهاتوویە یان ئێستایە ( لێرەدا واتای فۆرمی حاڵەتی داخوازیی کاتی رابووردوو لادەبا ) . لە رێژەی تیانیشدا حاڵەتی رێزمانیی کات نییە . هەموو ئەمانە ، لە راستیدا شاهیدی ئەوە دەدەن ، کە حاڵەتی کات نەك هەر لە حاڵەتی ناو(ی)دا نییە ، بەڵکو لە هەندێ باری گوزارەیی‌یشدا وەك حاڵەتی گشتیی کردار دەرناکەوێ .

هەرچی حاڵەتی رێژەیە پێوەندیی تەواوی بە فۆرمی گوزارەیی‌یەوە هەیە . ناوەرۆکی بنەرەتیی گوزارەیی بریتی‌یە لە پێوەندی دیاردەیێك بە واقیعەوە –

گوزارەوە ئەو جۆرە پێوەندییانە لە فۆرمی نیهادی (ناوی)دا نییە ، کە تەنیا ناوی پرۆتسێس ، یان دیاردە دەبەن .

بەم چەشنە ، حاڵەتی ڕێژە لە فۆرمی گوزارەییدا دەوری بنەڕەتی دەبینێ ، بەڵام لە حاڵەتی نیهادیدا دەرناکەوێ . لەبەر ئەوە حاڵەتی ڕێژەش ، هەروەك حاڵەتی کەس و کات ناکرێ بە خاسیەتی سەرجەمی کردار دابنرێ .

ئەوەی پتر گشت فۆرمی کردار بگرێتە خۆ ، حاڵەتی کارا دیاری و کارا بزرییە ، کە بە شێوەیێکی یەکجار توند پێوەندی بە دەربڕینی پێوەندیی نێوان پرۆتسێس و بابەتی ئەو پرۆتسێسەوە هەیە هەر فۆرمێکی کردار ، یان کارا دیارە ، یان کارا بزرە . لە هەر فۆرمێکی کرداردا بە ئاشکرایی دیارە ، چۆن ئەو پرۆتسێسە ، یان ئەو دیاردەیە ، بەو بابەتەوە بەندە و چۆن خاسیەتی نیشان داوە . ئەگەر بابەتە دیارخراوەکە وەك سەرچاوەی پرۆتسێس نیشان درابێ ، ئەوە کردار لە فۆرمی کارا دیاریدا خۆی دەنوێنێ بەڵام ئەگەر بابەتە دیارخراوەکە بریتیبێ لە بەرکاری ڕووداو ، کە لە دەرەوە ئاراستە کرابێ ، ئەو دەمە کردار فۆرمی بزر وەردەگرێ .

# چاوگ

لە زمانی ئاوێستادا کردار فۆرمی تایبەتی و گشتی‌ی چاوگی نی‌یە . بۆ ڕاگەیاندنی واتا و ئەرکی چاوگ فۆرمی هەمەجۆری دۆخی تیانی ناوی ڕوودان لە کاردان . لە نێو ئەو دۆخانەدا زەحمەتە بتوانرێ فۆرمێك دیاری بکرێت ، کە بووبێتە چاوگ و چووبێتە سیستەمی کردارەوە . یەکەم نیشانەی ئاسایی ئەو جۆرە دیاری کردنە ، بریتی‌یە لە کرداری ئاراستە و ئەویش ناتەواوە : لە زمانی ئاوێستادا گەلێ لەو ناوانەی لە کردارەوە کەوتوونەتەوە ، هێزی کرداری‌یان تێدا پارێزراوە : "یەت بە ڤانی ئەیوی ڤەنیا (ئەبی – ڤەن – یاس)... ئەژیم دەهاکەم" – واتە (بوومە سەرکەوتوو)

یاخود ناوی ڕوودان لە دۆخی بەرکاری‌دا دەبێتە تەواوکەری ڕاستەوخۆ . وەك (ڤەیدیەم) ، (مەنثرەم) .

لەبەر ئەوە دیاری‌کردنی چاوگ کەم یا زۆر لە جغزی گومان و نادیاری‌دا دەمێنێتەوە . جا لە نێو ئەو حاڵەتانەدا ، کە پتر پشتی پێ ببەسترێ ، ئەم فۆرمانەی خوارەوەن :

١–فۆرمی بەرکاری ناڕاستەوخۆی ناوی ڕوودانی هەمەچەشن و بەتایبەتیش ئەوانەی (–تی)یان تێدایە . وەك :

(سەپتەیەی ، سوپتەیەی)

٢–فۆرمێکی تایبەتی ، کە ئەویش هەر لە فۆرمی بەرکاری ناڕاستەوخۆوە کەوتووەتەوە ، بەڵام لە دۆخەکانی دی‌دا هاوڕێنەیان نی‌یە و بۆیە وا

..دەکەینەوە ، حاڵەتی هەرە نێزکیان لە بۆچوونمانەوە بۆ چاوگ ئەوانەن ،
.. لە ڕەگی کردارەوە وەرگیراون و کۆتاییان بە (-دیای) هاتووە :

"جەی دیای" (کوشتن)

"قۆیددیای" (زانین)

... هتد .[1]

چاوگ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بریتییە لە قەدی کرداری ڕابووردوو و + نیشانەی (- ەن) : "کەرتەن" (کردن) ؛ "ڕەفتەن" (ڕۆیشتن) ؛ "گوفتەن" (گوتن) .[2] لە ڕووی واتاوە چاوگ لە هەمان کاتدا (ناوی ڕوودان)یشە و لەبەر ئەوەشە لەگەڵ پێشبەند و پاشبەنددا بێت .

وێڕای ئەوە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا چاوگ فۆرمی کورت (بێ نیشانەی "- ەن")یشی هەیە ، کە لەگەڵ قەدی کرداردا هاوشانن . وەك : "کەرت" (کردن) ؛ "گوفت" (گوتن) ؛ "ڕەفتن" (ڕۆیشتن) ... ئەم جۆرە فۆرمەش بەتەنیا بەکار نایەت و لەگەڵ کرداری دیدا دێت .[3]

---

[1] س. ن. سۆکۆلۆف، زمانی ئاوێستا، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل ١٠٥ -١٠٦.

[2] ئەگەر لەباری مێژووییەوە بۆ ئەو کێشەیە بچین ، نیشانەی چاوگ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پێوستە (-ەن) بێ (لە "تەنەیی"ی فارسیی کۆنەوە) . بەڵام بەپێی یەکسان بوونی پلەی بەهێزی و پلەی بێ هێزیی زووی ڕەگ و جیاکردنەوەی بنەماى کاتی ڕابوردوو وەك مۆرفێمێکی تایبەتی لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بزووتنەوەیێکی وشەسازی سنووری ناوخۆی چاوگ ڕووی دا ؛ دەنگی (ت) هاتە سەر بنەما و کۆتایی چاوگ بوو بە (-ەن) . بەڵگەی ئەم ئەنجامەشمان ئەوەیە ، کە پارچەی (کەر) لە کرداری (کەرتەن)و (ڕەف) لە کرداری (ڕەفتەن) و (گوف) لە کرداری (گوفتەن) و (دا) لە کرداری (دادەن) ... دا لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە خودی خۆیاندا ناتوانن لە وشەگۆڕی و وشەڕۆنانی کرداردا هاریکاری بکەن . خۆ ئەگەر وەك پارچەیێکی وەسفیش تەماشا بکرێن ، ئەوە نابنە دانەیێکی وشەسازیی واتادار.

[3] ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ١١٧ - ١١٨.

لە زمانی موجانی‌دا چاوگ لە قەدی کردلری ڕابوردوو و نیشانەی (– ا) یان (– ان) پێک دێ . وەك : "نێوست + ا / ان - نێوستا / نێوستان" (دانیشتن) .[4]

لە هەموو دیالێکتەکانی کۆمەڵی زمانە شوگانۆ – ڕووشانی‌یەکاندا چاوگ فۆرمی کورت و فۆرمی تەواوی هەیە . فۆرمی کورتی چاوگی زوربەی کردارەکان لەگەڵ قەدی کاتی ڕابوردووی کرداردا وەك یەکن . بەوێنە : "نفشت ، نەفشت" (نووسین) ... هەرچی فۆرمی تەواویشە بەیاریدەی نیشانەی (– ۆو ، – مو) پێک دێ ، وەك : "نفشتۆو ، نەفشتمو " (نووسین) ...[5]

لەزمانی یازگولیامی‌دا چاوگ لە ڕەگی کاتی ئێستای کردلر و نیشانەی (–مژ) پێك دێ . وەك : "لەفمژ" (گوتن) ؛ "مەرمژ" (مردن) ...[6]

لە زمانی ئاخانی‌دا چاوگ بە ئیزافەکردنی نیشانەی (– اك) یان (– ن) بۆ سەر ڕەگی کاتی ئێستای کردلر پێك دێ . وەك : "گز + ا ك - گزاك" (مەلستان) ، "جەمر + اك - جەمراك" (کردن) ؛ "ژۆی + ن - ژۆین" (خوێندنەوە)...[7]

چاوگ لە زمانی بلووجیدا لە ڕەگی کاتی ئێستای کردار و نیشانەی (– مك) پێك دێ . وەك : "گر + ە ك - گرەك" (بردن) ؛ "ژەن + ە گ- ژەنەگ" (لێدان) ...[8]

---

[4] ت. ن. پاخالینا ، زمانە پامیری‌یەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ١٤٩ .

[5] هەمان سەرچاوە ، ل ٤٠ .

[6] هەمان سەرچاوە ، ل ٧١ .

[7] هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٤ .

[8] ف . ا . فورزۆف ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٥٦ .

نیشانەی چاوگ لە زمانی فارسیی نوێدا "- تن" و "- دن"ە و ئەگەر (ن)
لابیرێ کاتی ڕابوردوو پەیدا دەبێ :

بستن ، فروختن ، زیستن ....

بردن ، کندن ، زدن ...[9]

لە زمانی ڕووسیدا چاوگ کۆتایی بە دەنگی (ت) یان (تی) دێ ...[10]



## لەم کورتە گەشتەدا تێبینی دوو دیاردە دەکەین :

**یەك:**

هەندێ نووسەر وا باسەکەیان دامەزراندووە، کە چاوگ لە ڕەگ یان قەد ونیشانەی چاوگ پێك‌هاتبێ و بڕێ نووسەری دی بەپێچەوانەوە دەڵێن ، ئەگەر نیشانەی چاوگ لە چاوگ بکرێتەوە قەد پەیدا دەبێ - واتە ئەوە ساغ نەکراوەتەوە ، کە چاوگ سەرچاوەی کردارە ، یاخود چاوگ خۆی لە کردارەوە وەرگیراوە .

هیچ نووسەرێکی ڕێزمانی کوردی‌یش نەیتوانیوە ئەوە ساغ بکاتەوە ، کە چاوگ سەرچاوەی کردارە یاخود چاوگ خۆی لە کردارەوە وەرگیراوە ، چونکە ئەم باسە تابڵێی گرانە و وێڕای ئەوەش ئاسۆیێکی ڕوون نی‌یە بتوانرێ لەبەر

---

[9] ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٢٦٤ .

[10] ن . س . ڤالگینا ، د . ئ . ڕۆزنتال ، م . ئی . فۆمینا ، ڤ . ڤ . تساپکێڤیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٣٧ .

ئیشکیدا ئەو گرێ کوێرەیەی پێ بکرێتەوە ... بەداخەوە هەندێ نووسەری ڕێزمانی کوردی، بێ ئەوەی، هیچ بەڵگەیێکی مێژوویی یان مەنتیقی هەبێ ، بە تەئسیری زمانێکی بێگانە بڕیاری بێ سێ و دووی بۆ ئەو کێشەیە داوە[11] .

---

[11] مامۆستا محەممەد مەعرووف فەتاح لە وتاری "کار پۆلێن کردن بەپێی ڕۆنان " (گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ ۱۲۱ ، بەغدا ، ۱۹۸۹ ، ل ٤٠ - ٥٩)دا نووسیویە ، دەڵێ : "کاری سادە لە زمانی کوردیدا نییە" (ل٤٠).

ئەگەر نووسەری ئەم وتارە وا دابنێ ، کە زیادی خراوەتە سەر ڕەگ و قەدی لێ پەیدا بووە و بە زیادی خستنەسەر قەدیش چاوگ پێک هێنراوە ، ئەوە دەبێ ئەو ڕایەی بە بەڵگەی مێژوویی یان هیچ نەبێ زیربێژی ئیسپات بکات . وێڕای ئەوە ، دیاردەی وای نێوان ڕەگ و قەد هەیە ، ئەم و مژی ئەواو بخەنە سەر ئەو جۆرە ڕایە ، کە مامۆستا محەممەد دەریبڕیوە . وەک :

أ) هاوجووتی و هاوشانیی کۆمەڵێک ڕەگ و قەد . وەک :

| چاوگ | ڕەگ و قەد |
|---|---|
| درووێن | دروو |
| سووێن | سوو |
| گرووێن | گروو |
| جووێن | جوو |
| بەستن | بەست |
| پەرستن | پەرست |
| ... هتد . | |

ب) دووریی فۆرمی هەندێ ڕەگ و قەد لە یەکەوە . وەک :

| چاوگ | ڕەگ | قەد |
|---|---|---|
| گوتن / وتن | لێ | گوت / وت |
| زاین | زێ | زا |
| نان | نێ | نا |

| | | |
|---|---|---|
| دان | دە | دا |
| مان | مێن | ما |
| ویستن | وێ | ویست |
| بیستن | بێ | بیست |
| ڕستن | ڕێس | ڕست |
| پالاوتن | پالێو | پالاوت |
| بژاردن | بژارد | بژێر |

... هتد .

ئەگەر مامۆستا محەمەد وا بیربکاتەوە ، کە لە زمانی کوردیدا کرداری سادە نەبێت ، دەبێ لێم ببوورێ چەند سەرنجێکی قایل نەبوونی بخەمە پێش چاو و هەندێ پرسیاری لێ بکەم :

١- (دروو ، سوو ، گروو ، جوو ، بەست ، پەرست ...) ، کە لە یەک کاتدا ڕەگیش و قەدیش بن ، ئەوە بێ بیرکردنەوە دەزانین لە یەک مۆرفێم پێک هاتوون . هەر شتێکی یەک مۆرفێمیش سادەیە و هەرگیز ناشێ ناسادەبێ ، کەچی مامۆستا محەمەد دەڵێ : "کار لە کوردیدا دەبێت بە لای کەمەوە لە دوو کەرت (مۆرفێم) پێک بێت" (ل٤٤) .

٢-ئێمە دەزانین (لێ) ڕەگە و (وت) قەدە ، بەڵام نازانین کام مۆرفێم خراوەتە سەر (لێ) و کردوویەتی بە (وت) . خۆزگە مامۆستا محەمەد ئەو مۆرفێمەی پێ دەوتین ، تا بڕوای پێ بکەین ، کە (وت) مۆرفێمێکی سادە نییە و ناسادەیە ... بەڵێ لەوە تێدەگەین ، خاوەنی ئەو ڕایە کێشەکە دەباتەوە سەر بەکارهێنانی کردار لە ڕستەدا و دەیبەستێ بە وشەی دوویەوە ، بۆیە بۆ ئەمەش دەپرسین : ئایا لە ڕستەی (ئازاد بە منی وت ، بڕۆ ... )دا ، دەشێ (وت) بە مۆرفێمێکی بە (ئازاد) یان بە (من)ەوە گرێ دراو دابنرێ ؟... بێگومان نەخێر .

٣- (زێ) ڕەگی (زایین)ە و قەدەکەشی (زا)یە . جیاوازیی ڕەگ و قەد لە یەکتر گۆڕینەوەی دەنگی (ێ) و (ا) دایە - واتە زیادییێک نەچووەتە سەر (زێ) تا بیکا بە (زا) . بەو پێیە (زا) سادەیە و ناسادە نییە . بێتو بە... بەرنامەی نووسەری وتاری "کار پۆلێن کردن

بەپێی ڕێزمان " بگەڕێینەوە بۆ ڕستە و بڵێین (ئەگەر ماینەکەت خۆش دەوێ ، کە زا جوانووەکەی بە کەس مەدە) ، ئەوە سەرلەنوێ (زا) بە هەمان سادەیی بەکارهاتووە . هەر بەو شێوەیە (نـن) ڕەگی (نان)ە و قەدەکەشی (نا)یە ؛ (دە) ڕەگی (دان)ەو (دا)قەدێتی ... لەمانیشدا جیاوازی تەنیا لە گۆڕینەوەی دوا دەنگیاندایە و هیچ پاشگرێك لە ناواندا نییە بۆ کردنی مۆرفیمێك بە دوو مۆرفیم ...

٤- لە زۆر حاڵەتدا زیادییەك دەخرێتە سەر ڕەگ و قەدی لێ پەیدا دەبێ ، یاخود دەتوانین بڵێین هەندێ دەنگ لە قەد دەکرێتەوە و ئەوەی دەمێنێتەوە دەبێتە ڕەگ ... بەڵام ئەوانەی قەد بە مۆرفیمێکی ناسادە دادەنێن و لەو ڕایەدان کە لە (ڕەگ + پاشگر) پێکهاتووە ، دەبێ بۆ (مێــن)ی ڕەگ و (مـا)ی قەدی (مـان) چی بڵێن ؟ (مێـن) ، کە ڕەگە لە سێ دەنگ پێکهاتووە ، کەچی (ما) ، کە قەدە لە دوو دەنگ ساز بووە. بێگومان ڕێ بەخۆم نادەم بڵێم لەبەر ئەوەی ژمارەی دەنگەکانی (مێن) لە هی (ما) زیاترە ، دەبێ (مـا) لە (مێـن)ەوە وەرگیرابێ ، بەڵام گلەیم لێ ناگرێ ، ئەگەر بڵێم سێ لە دوو زیاترە و بپرسم چی خراوەتە سەر (مێـن) بۆ ئەوەی (ما)ی لێ دابڕێژرێ ؟

ئەگەرچی بواری هێنانەوەی ئەو جۆرە نموونانە زۆر فراوانە ، ئێمە لەو ڕایەداین ، ئەو چەند بەڵگە کەمە بەس بن بۆ ڕەت کردنەوەی ئەو لێکدانەوەیەی دەڵێ ، "کاری سادە لە زمانی کوردیدا نییە" .

مامۆستا محەممەد لە بەردەوامی ئەو باسەیدا دەڵێ ، "دەبێ لە پۆلێنکردنی کاردا جیاوازی نەکرێ لە نێوان گەرەکی ڕێزمانی و نارێزمانی و هەموویان هەر بە مۆرفیمی بەند دانرێن . هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم بنەمایەدا بەلای ئێمەوە کاری سادە لە کوردیدا نییە ، بە واتای ئەوەی کە کار لە کوردیدا دەبێت بە لای کەمەوە لە دوو کەرت (مۆرفیم) پێك بێت " (ل ٤٤) و، بەمە هەنگاوی پتر بەرەو نادروستی هەڵێناوە .

وەك لە سەرەوە ڕوونمان کردەوە ، تەنانەت ئەگەر بەپێی بەرنامەی مامۆستا محەممەدیش تەماشای کرداری کوردی بکەین ، گەلێ قەدی کرداری سادە بەدی دەکەین ، کە لە ڕستەشدا وەك کردارێکی ڕابوردووی سادە کاردەکەن . کەواتە چۆن بتوانین ئەو ڕایەی وەربگرین ، کە

دەڵێن : "هەموو کارێك لە هەر دەم و تاقیکدا بێت بەلای کەمەوە دەبێ لە دوو مۆرفیم پێك بێت " (ل٤٦) .

ئێستاش دێینە سەر چاوگ و ڕەگی کردار ، کە نووسەر (-ن)ی چاوگ بە پاشگر دادەنێ و (دە)ی پێش ڕەگ بە پێشگر و دەڵێ : "دەبێ لە پۆلێنکردنی کاردا جیاوازی نەکرێ لە نێوان گیرەکی ڕێزمانی و ناڕێزمانی و هەموویان هەر بە مۆرفیمی بەند دانرێن ..." .

بەر لە هەر شت ئەوە دێنینەوە یاد کە ، نە هیچ نووسەرێکی ڕێزمانی کوردی و نە مامۆستا محەممەد خۆیشی ، ئەوەیان ساغ نەکردووەتەوە ، کە چاوگ سەرچاوەی کردارە ، یاخود چاوگ خۆی لە کردارەوە وەرگیراوە . لەمانەش کاتێکیش ناشێ ئەو قسانە بکرێ ، کە ئەوە یەکالا بکرێتەوە ، چاوگ لە کردار وەرگیرابێ ... چونکە ئەگەر ئەو گومانەش بڕەوێنرێتەوە ، کێشە سەرەکییەکە هەر دەمێنێتەوە ، کە جیاوازیی گەورەی گیرەکی ڕێزمانی و نا ڕێزمانییە .

بچووکترین بنکەی وشە ، کە واتای سەرەکیی وشە هەڵگرێ ، لە زانستی زماندا بە مۆرفیمی ڕیشەیی – (Root Mopheme) ناسراوە . هەرچەندە بنەمای وشە مانای سەرەکی هەڵدەگرێ ، بەلام ئاسان نییە زمان لەنیا بە بنەمای وشە و وشەی سادە مەبەست دەربڕێ .

ڕەگ و قەدی کردار بە یارمەتی پێشگر و پاشگر دەتوانن سەدان وشە دروست بکەن و سەدان مانا و مەبەست دەربڕن . بۆوێنە :

پێشگر + ڕەگ . وەك :

بوێر ، بیر ، بگوێز ... نەبەز ، نەمر ، نەترس ... پێخەف ، پێنووس ...

ڕەگ + پاشگر . وەك :

خوێنەر ، نووسەر ... زانا ، توانا ... کڕیار ، فرۆشیار ... گەڕۆك ، خشۆك ... ترسنۆك ، گرینۆك ... نوسەك ، کوتەك ... کوشندە ، بەخشندە ... دیدە ، گەریدە ... کوکە ، نالە ... فرکە ، کێڵکە ... سووتەن ، ڕێژەن ...

قەد + پاشگر . وەك :

ـ

ـدونوو ، حەونوو ... مردە ، بووە ... مرندموار ... گردگار ...

... هتد . (بۆ زانیاریی زیاتر لەو بارەیەوە ، بڕوانە : أ-ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ١٩٧٦ ، ل ٢٤٣ - ٢٦٧ ؛ ب- ڕەفیق محەمەد شوانی ، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن ، نامەی ماجیستێر ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٨ . )

دەبینین ئەو پێشگر و پاشگرانە کە دەچنە سەر ڕەگ یاخود قەدی کردار (ناوی کارا ) ، (ناوی بەرکار) ، (ناوی چاوگ ) ، (ناوی جێگا) ، (ناوی ئامێر ) سازدەکەن . بەم جەشنە ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەوری (وشەڕۆنان) دەبینن ، جۆرێکی تایبەتین لە مۆرفیم و لە زانستی زماندا بە (مۆرفیمی وشەدارێژ - Derivational Morpheme) ناسراون .

لە سەرەوە لە مۆرفیمی وشەدارێژ دواین و نیشانمان دا ، کە چۆن لە کاتێکدا دەچنە سەر بنمایێک وشەیێکی نوێی دارێژراو دێنە کایەوە ... بەڵام پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین کە وشەکانی زمان لەناو خۆیاندا پێوەندیی هەمیشەیییان هەیە . ئەو وشانەی دەستەواژە و ڕستە پێک دەهێنن پێوەندیی ئاشکرا و دیاری کراویان لەگەڵ یەکتردا هەیە .بۆ دەربڕینی هەر مەبەستێک ، وشەکان بە گوێرەی دەستووری ئەو زمانە دەچنە پاڵ یەک و فۆرمی پێویستی خۆیان وەردەگرن و ڕستە پێک دەهێنن و مەبەستی دیاریکراو دەگەیەنن . وەک :

١-

(-وو) : ئازاد دەمێکە هاتووە .

(-با) : ئەگەر بڕۆیشتبام باشتر بوو .

(-ایە) : خۆزگە بچوومایە ...

... هتد .

٢-

(دە - / ئە-) : دەچم / ئەچم بۆ قوتابخانە

(بـ -) : بڕۆ بۆ قوتابخانە

ـ

(بـ -) : بچم بۆ قوتابخانە

... هتد .

بەو نموونانـەی سـەرەوەدا ، ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێ کـە یـەکێک لـە هـۆ کاریگـەرەکانی ڕێکخستنی وشە ، مۆرفێمی وشەگۆڕە . مۆرفێمی وشەگۆڕ دەچێتە سـەر وشـە و حـاڵەتی جیـاوازی ڕێزمانی پێک دێنێ . مۆرفێمی وشەگۆڕ کە بریتییە لە نیشانە ، وەک پێشگر و پاشگر بە سـەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێن . لە بەشی یەکەمی ئـەو نموونانـەی سەرەوەدا ، نیشـانەی (-وو ، -با ، -یە ...) بە کۆتایی کردارەوە لکاون و حاڵەتی جیاوازی ڕێزمانییان دەربڕیـوە . لـە وشـەکانی بەشی دووەمیشدا (دە - / ئە - بـ - ، بـ - ...) کە لە سەرەتاوە هاتوون هەمان ئەرکیان بـەجێ هێناوە .

بەم جەشنە بۆمان ڕوون بووەوە ، کە لەزمانی کوردیـدا دوو جـۆر مۆرفێمـی وشـەگۆڕ هەیـە و دەشێ پێیان بوترێ (نیشانە) . ئەو نیشانانەی بە کۆتاییەوە دەلکێن بە (Inflexion) ناسراون . نیشانەی کۆتایی لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا باوە . هەرچی جۆری دووەمی نیشـانەیە ، کـە لـە سەرەتاوە دێت و لە زمانی کوردیدا باوە، لە زانستی زماندا (Augment) ی پێ دەوتـرێ . ئـەم جۆرەیان لە کەم زماندا بەدی دەکرێ . بەوێنە لە زمـانی ئینگلـیزی و ڕووسـی ...دا نییـە ، لـە "زمانی یۆنـانیی کـۆن و سانسـکریتی‌دا دەبێتـە نیشـانەی کـرداری ڕابـوردووی سـادە و دوور" (بڕوانە : گ. س. کاچکینا ، کێشەی والای مۆرفێم ، لینینگراد ، ١٩٦٣ ، ل ٤٠ ).

مۆرفێمی وشەدارێژ و مۆرفێمی وشەگۆڕ ، وەک مۆرفێمی ڕیشـەیی سەربەخۆ کارناکـەن و واتـا نابەخشن . لەبەر ئەوە هەندێ جار لە زانستی زماندا بـە هـەردووکیان دەڵێـن (مۆرفێمـی بـەند ، یاخود مۆرفێمی ئەفیکسی ) .

وێڕای هەموو ئەوەی لێی دواین ، پەنجە بۆ چەند خاڵێک ڕادەکێشین :

١- پێشگر و پاشگر دەتوانن وشـەیێک لـە بەشـێکی ئاخاوتنـەوە بکەنـە بەشـێکی دیکـەی ئاخاوتن ... بەڵام نیشانە ناتوانێ ئەو ئەرکە ببینێ.

٢- لە وشەی ناسادەی زمانی کوردیدا پاشگر هەمیشە لە دوای بنەمای وشەوە دێت و ئینجا بە دوای ئەودا نیشانە – واتە هەمیشە پێشگر پێش نیشانە دەکەوێ .

٣- پێشگر و پاشگر مانای دارێژە (المعنى الاشتقاقي- Derivational Meaning) دەدەن ، هەرچی نیشانەیە مانای نیسبی (المعنى النسبي – Relational Meaning) دەگەیەنێ .

جا کە مۆرفیمی وشە ڕێژ کەرەستەی چالاکی ڕێزانی وشە بێت و مۆرفیمی وشەگۆڕیش ئەرکی ڕێکخستنی وشە ببینن و حاڵەتی ڕێزمانی پێک بێنن ، ئیتر چۆن ڕێگە بە خۆمان بدەین ، کە هەر لەبەر ئەوەی هەردوو جۆر مۆرفیمی بەندن و سەربەخۆ و بەتەنیا واتا نابەخشن جیاوازی لە نێوانیاندا نەکەین و بە یەک شتیان دابنێین . ئەمە ئەو پەندە کوردییە باوەم دێنێتەوە یاد ، کە دەڵێ : " هەرچی ڕیشی سوور بوو هەمزاغا نییە" .

ئەنجام ئەوە دەگەیەنێ ، کە نە (-ن)ی چاوگ پاشگرە و نە (دە-)ی نیشانەی بەردەوامی پاشگرە و نە کردار بەو نیشانانە دەبێتە ناسادە .

مامۆستا محەمەد لە ڕوون کردنەوەی ئەو ڕایەیدا ، کە وتوویە : "کاری سادە لە زمانی کوردیدا نییە" ، ڕەخنە لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی دەگرێ ، کە کرداری دارێژراو و کرداری سادەیان جیاکردووەتەوە و ، نووسیویە : ئەمە "ئەمەش هەر دیاردەیەکی ناپێویستە ، بەڵکو بەپێچەوانەی ڕاستییەکانی زمانی کوردی و بەبنەڕەتیش نییە بە هیچ بنەمایەکی ڕێزمان و واتاییەوە " (ل٤٠) .

پێشگر و پاشگر کە بچنە سەر بنەما و ڕواڵەت و ناوەرۆک بگۆڕن و شتی نوێ ڕێنێن – واتە یەکێک لەو دوو گیرەکە ، کە مۆرفیمی بەندن ، بچێتە سەر مۆرفیمێکی ڕیشەیی ، کە سادەیە و واتای هەیە ، بیکا بە ناسادە و واتای بگۆڕێ ، ئیتر چۆن بەند نییە بە هیچ بنەمایەکی ڕێزمانی و واتاییەوە .

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو وتانەمان لە ڕستەی "١- ئازاد دارێکی لە ئەوزاد دا " ، "٢- ئازاد شیعرێکی بەسەر ئەوزاددا هەڵدا " ، "٣- ئازاد ئاوی لە پەرداخەکە وەردا " ، "٤- دوێنێ بارتەکەم بەخاوەنیدایەوە "دا ، ... (دا) و (هەڵدا) و (وەردا) و (دایەوە) دەکەینە نموونە . (دا) کە بنەمای (دان)ە مۆرفێمێکی ڕیشەییە و سادەیە و واتای هەیە و لە ڕستەی یەکەمدا بە ڕوونی دەبینرێ . بەڵام کاتێ لە ڕستەی دووەم و سێیەم و چوارەمدا پێشگری (هەڵ- ، وەر-) ، یان

پاشگری (-ەوە)مان تێزافەکرد ، بوو بە ناسادە و واتاشی گۆڕا ... جا ئەمـە بنـەمای ڕێزمـانی و واتایی نەبێ ، دەبێ بنەمای ڕێزمانی و واتایی چی بێ !

ئەگەر مامۆستا محەممەد بۆ ڕستەی یەکەم لە ڕوانگەی پێوەندیـی (دا) بـە وشـەی (دارتکـی)یـەوە بیربکاتەوە ، ئەوە بەو پێیە زۆربەی ڕستەی کوردی بێ تەواوکـەر دەمێنێتـەوە و پێکـهاتـیان بـەبا بڕیتی دەبێ لە نیهاد و گوزارە ... وەك دەزانین لە ڕستەی "ئازاد شـەرواڵێکی جوانـی درووا"دا : (ئازاد)- نیهادە و (شەرواڵێکی جوان)- تەواوکەری گـوزارەیە و (درووا)- گـوزارەیـە و کردارێکی سادەیە . بەڵام بەپێی ئەبوونی کرداری سادە ، دەبێ دەستەواژەی (شەرواڵێکی جوانی درووا) بـە کرداری ناسادە دابنرێ ... لەو ڕایەدام ، ئەو جۆرە لێکدانەوەیە ئەگەر نەشـبێتە هـۆی شـێواندن و لێکدانی هەندێ یاسای ڕێك و پێك و لەباری زمانەکەمان ، هەر وەك شتێکی نامۆ دەمێنێتەوە و لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا جێی نابێتەوە .

هەروەها لە ڕستەی "من ڕێگـەم لـە ئـۆ بەسـت" و "ئـازاد درۆیێکـی خراپـی بـەدەم منـەوە هەڵبەسـت" و "بەرخەکـەم دابەسـت" ... دا ، کـرداری (بەسـت) بـەهیچ چەشـنێك نـە لـە ڕووی پێکهاتەوە و نە لە باری واتەوە بە چەشنی (هەڵبەسـت) و (دابەست) نـییە - واتە ئەمان دارێـژراون و ئەو سادەیە ! ئەمان واتایێك دەگەیەنن و ئەو واتایێکی دی - جا بۆیە دەبـێ هـاوڕێ و دۆسـتی دێرینم لێم ببورێ ، بڵێم لام ئاسان نییە لەگەڵی ڕێبکەوم ، کە دەڵـێ : "جیاکردنـەوەی کـاری دارێژراو لەکاری سادە نەك هەر دیـاردەیێکی ناپێویسـتە ، بـەڵکو بـە پێچەوانـەی ڕاسـتییەکانی زمانی کوردییە و بەندیش نییە بە هیچ بنەمایەکی ڕێزمان و واتایییەوە ، بە واتایـەکی‌تر ، ئـەو کارانەی کە زمانەوانەکان بە سادە ناویان دەبەن لە ڕووی واتا و ڕێزمانەوە هەر کاری دارێژراون و لەمسەرو لایێکەوە وەك ئەمان ڕەفتار دەکەن . جیاکردنەویان لە یەکتری نـەك هـەر لـە جێـی خۆیدا نییە ، بەڵکو دەبێتە هۆی سەرلێتێکدان و بزربوونی چەند یاسـایەکی گشـتی کـوردی و هەندێ ڕاستیی ڕێزمانی زمانەکەش دەشارێتەوە" (ل٤٠) و بـە زێـدە ڕێـی نـازانم ، ئەگـەر بڵێـم سەرپاکی ئەوەی لەو چەند دێڕەدا دەری بڕیوە ، بە تەواوی دژ بە هەڵکەوتی زمانی کوردییە و بە پێچەوانەی ئەوەوە دەڵێم : "جیاکردنەوەی کرداری دارێژراو لە کرداری سادە دیاردەیێکی پێویستە و لەگەڵ ڕاستییەکانی زمانی کوردیدا بەتەواوی دەگونجێ و بە بنـەمای ڕێزمـانی و واتاییـەوە بەندە . ئەو کردارانەی بە سادە ناویان براوە لە ڕووی واتـا و ڕێزمانـەوە سـادەن و وەك دارێـژراو ڕەفتار نـاکـەن و ، جیاکردنەویان لـە یەکـتری لـە جێـی خـۆیدایە و دەبێتە هۆی ئاشکراکردن و

ئیسبات کردنی چەند یاسایێکی گشتیی کوردی و هەندێ ڕاستیی زمانەکە دەردەخەن" (ئەوڕەحمان) .

ئەوەی من بیزانم مامۆستا محەمەد مامۆستایێکی زۆر وردە ، بەلام بەداخەوە لەم وتارەیدا شتی ئەوتۆی تۆمارکردووە ، لە نووسینی زانستیدا جێی نابێتەوە ... بەداخەوە تەنانەت لەگەلێ شوێندا شێوازی دەربڕینی بووەتە هۆی زێدە ڕۆیی و کەمکردنەوەی ناوەڕۆکی نووسینەکەی . بەوێنە کاتێ باسی ناپێویستیی جیاکردنەوەی کرداری سادە و داڕێژراوی کردووە ، وتوویە : "لە هیچ زمانێکی جیهاندا جیانەکراوەتەوە" (ل ٤٠ ، س ٢)... بڕواناکەم زمانەوانێک پەنجا زمانیش بزانێ بوێری ئەمەی وا بکات!...

مامۆستا محەمەد بەدوا ئەمەدا بۆ باشتر ئیسپات کردنی نەبوونی کرداری سادە لە زمانی کوردیدا هەندێ بەڵگەی دی وا دێنێتەوە ، ئەوانی پێشوو لەچاو ئەمەدا هەزار شوکرانە بێژییان دەوێ . بۆ درێژە پێنەدان تەنیا دوو بەڵگەیان دەخەینە بەرچاو :

یەکەم-

نووسەر دەڵێ : نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بۆیە پێشگری (هەڵ - ، دا - ، ڕا - ...) و پاشگری (-ەوە)یان بە مۆرفیمی وشەداڕێژ داناوە ، چونکە ئەمە "دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم پێشگرانە و ئەو پاشگرە وەک ئاوەڵکار ڕەفتار دەکەن" (ل٤٢) ... "هەڵبژاردنی ئەم پێشگرانە و جیاکردنەوەیان لە هی تر کە وەک ئەمانن لە ئەرک دا شتێکە بە ئارەزوو بووە و بەند نەکراوە بە هیچ بنەمایەکی ڕێزمانییەوە . بۆ نموونە پێشگری (بەر - ، دەر - ، پێش - ، پاش - ) لە کاری (بەرکەوت ، سەرکەوت ، دەرکەوت ، پێش کەوت ، پاش کەوت )دا دیسانەوە هەر ئەرکی ئاوەڵکار دەبینن و دەبوایە ئەم کارانەش هەر داڕێژراو بونایە ، کەچی بەلای زۆریانەوە بە لێکدراو دانراون هەر لەبەر ئەوەی کە ئەم پێشگرانە (بە سەربەخۆش) دەبینرێن و بێ ئەوەی ئاگاداری ئەو ڕاستییە بن کە ئەمانە جۆرێکی ترن و لەگەڵ شێوە سەربەخۆکاندا لە ئەرک و واتادا جیابوونەتەوە ، بۆ نموونە (سەر) لە کاری (سەرکەوت)دا ، جیاوازە لە (سەر) لە (سەرتاش و سەردان)دا لە ڕووی ئەرک و واتاوە بەوەدا کە (سەر)ی یەکەم ئاوەڵکارە و (سەر)ی دووەم ناوە و

ن ئامێکی لەشە و ئەوی تریان بە واتای (بۆ سەرەوە) دێت . لەلایەکی تریشەوە ، هەر (سەر)ی یە ؟م پێشگرە و ئەویتر وشەیە" (ل٤٢) .

دانانی پێشگری (هەڵ - ، دا- ، ڕا-) و پاشگری (-ەوە) بە ئاوەڵکردار و تێکەڵ کردنی ئاوەڵکرداری (بەر ، دەر ، پێش ، پاش ...)بە پێشگر تێکەڵ کردن و هەڵەیەکی زمانەوانیی گەورەیە.

(بۆ وەڵامی ئەم بەندە ، بڕوانە پەراوێزی ژمارە ١٧ و ١٩ ی ئەم کتێبە ) .

سەرباری ئەوەی لەو دوو پەراوێزەدا وتوومە دوو تێبینی دیش دەخەمە پێش چاو ؛

١-ئێمە لەو بڕوایەدا نین ، نووسەرانی ڕێزمانی کوردی هێندە ساویلکە و بێ سەلیقە بن ، کە جیاوازی لە نێوان (سەر)ی ئاوەڵکردار - (سەرکەوت) و (سەر)ی ناو - (سەرتاش ، سەردان) دا نەکەن و نەزانن ئەمانە هاوبێژن ... حەز دەکەم مامۆستای هێژا ئەوە بزانێ ، کە (سەر)ی ئاوەڵکردار مۆرفیمی بەند نییە تاکو بخرێتە خانەی پێشگرەوە . دەزانین پێشگر و پاشگر بەتەنیا بەکارنایەن ، هەرچی مۆرفیمی (بەر ، دەر ، پێش ، پاش...)ە ، بە تەنیا بوون و ئاشکرا دەبینرێن . بۆنمونە کورد دەڵێن ؛ "بەر لەوەی ببم بە مامۆستا ، کرێکار بووم" ؛ "پاش من ئازاد دەچێت بۆ بازاڕ" ... ئەگەر ئەو ئاوەڵکردارانە پێشگر بوونایە وا سەربەخۆ بەکارنەدەهێنران . ئەگەر پێشگری (هەڵ - ، دا - ، ڕا-...) و پاشگری (-ەوە)ش ئاوەڵکردار بوونایە ، هەڵبەت دەبوو ئەوانیش بە هەمان چەشنی (بەر ، دەر ، پێش ، پاش ...) ببینرانایە .

٢- هەر لەبەر ئەوەی پێشگری (هەڵ-) بۆ واتای بزووتنەوەی بەرەو ژوور بەکاردێ و واتای ئاوەڵکرداری (سەر)یش هەر هەمان ڕووی بزووتنەوەی تێدایە ، مامۆستا محەمەد بڕیاری پێشگر بوونی بۆ داوە - واتە لەسەر بناغەی واتا باسەکەی دامەزراندووە و خاسیەتی ڕێزمانیی لەبەر چاو نەگرتووە . بەپێی زانینی ئێمە لە مێژە ئەو ڕایە دوورخراوەتەوە ، کە پێشگر بە گرووپی لێکسیکی مۆرفیم دابنرێ .

ئەگەرچی هەندێ بەڵگەی ئەرتۆمان هەیە لە ڕێیانەوە چاوگ بە سەرچاوەی کردار دابنێین ، بەڵام لەبەرئەوەی چەند لایەنێکی مێژوویی ناناشکرامان بۆ ڕوون نەبووەتەوە ، بۆیە لە نووسینی ئەم کتێبەدا هەرسێ (ڕەگ) و (قەد) و (چاوگ)مان کردووەتە کەرەستە .

دوو :

لە بەشێکی زۆری ئەو زمانانەی لێیان دواین ، نیشانەی چاوگ بە هەمان چەشنی زمانی کوردی دەنگی (ـن) ە .

---

-

بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی مامۆستا محەمەد بێ ، دەبێ لە حاڵەتی وەك ، (چوونەسەر ، بردنەسەر ، هاتنەسەر ، خستنەسەر ...)دا (سەر) پاشگر بێ ا وشە پاش و پێش دەکەوێ ، بەڵام پێشگر هەرگیز ناچێتە ڕیزی دواوە و پاشگریش نایەتە ڕیزی پێشەوە ...

دووەم-

نووسەری وتار هەندێ لەو نموونانەی کردوونی‌یە بەڵگەی نیشاندانی ئەوەی وتوویە ، "کار لە کوردیدا دەبێت بەلای کەمەوە لە دوو کەرت (مۆرفیم) پێك بێت" ، ڕستەی ، نەك وشە . بەوێنە (دڵم گیرساندن) ، (دایان دەگیرسێنم) ... لەوەش سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە ، هەر خۆی ڕوونی کردووەتەوە ، کە لە (دڵم گیرساندن)دا (م) کارایە و (ن) بەرکارە . لە (دایان دەگیرسێنم)یشدا (یان) بەرکارە و (م) کارایە ... جا ئەم جیاکردنەوە و تێکەڵ کردنەی ئەرکی وشەسازی و ڕستەسازی تەنیا هەڵەیەکی زمانەوانی‌یە ، نەك بەڵگە و نموونەی کرداری سادە لە زمانی کوردیدا .

(بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو لەبارەی کەم و کورتی‌یەکانی وتاری "کارپۆلێن کردن بەپێی پۆنان"ی مامۆستا محەمەد مەعرووف فەتتاح ، بڕوانە : (د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وتاری "کارپۆلێن کردن بەپێی پۆنان" و چەند سەرنجێك ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ ١٣٩ ، بەغدا ، ١٩٩٧ ، ل ٨-١٦) .

گشت چاوگێکی زمانی کوردی کۆتایی به دەنگی (ـن  in / n)[١٢] دێت - واتە لەم زمانەدا تاکە چاوگێك نی‌یە کۆتایی بە دەنگی (ـن) نەهاتبێ و بەو (ـن) ە دەوترێ (ـن)ی چاوگ . لە پێش ئەو (ـن)ی چاوگی‌یەشەوە یەکێك لەم پێنج دەنگە (ا ، ی ، وو ، ت ، د) دێت و لە رێزمانی چاولێکەریی کوردیدا ، چاوگ بەناوی ئەو دەنگانەی پێش (ـن) ناونراون - واتە : چاوگی ئەلفی ؛ چاوگی یائی ؛ چاوگی واوی ؛ چاوگی تائی ؛ چاوگی دالی .[١٣]

---

(١٢) واته بەدوا دەنگی بزوێندا (ـن) دێت و بەدوا کۆنسۆنانتیشدا (in-) . بەواتایەکی دی ، ئەگەر دەنگی پێش کۆتایی (ا ، ی ، وو) بێت ، نیشانەی چاوگ لە شێوەی (n-)دا دەردەکەوێ ، بەلام لە دوا (د ، ت) ەوە دەبێ بە (in-) .

(١٣) لە بەشە دیالێکتی هەورامانا چاوگ کۆتایی بە دەنگی (ـی) دێت و پێش (ـی) چاوگیش دوو دەنگی (ە) یان (ا) دێن ، وەك :

وارده‌ی - (خواردن)

ویناى - (بینین)

(بڕوانە : أ- محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٨٧ ؛ ب- دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، تهران ؟ ، ل ١٣ .

چەند نموونەیەك :

نه زانای عەزمەم شار شەوارەن

گرتەی ئەبرانم یەکسەر نیازەن

(میرزا ئولفەقار ، ل ١٣٦)

تۆ دیدت ، پەی قەسد ، کوشتەی من ، رەشتەن

جەهان ، کە (صەیدی) ، بابەی تۆش کوشتەن

(صەیدی ، ل ١٦٤)

بەپێی فۆرمی چاوگ و پێوەندیی بنەمای ڕەگ و قەد ، دەتوانرێ کرداری سادە بەسەر پێنج کۆمەڵدا دابەش بکرێ :

١-کۆمەڵی بە (-ان) کۆتایی هاتووە :

کۆمەڵی چاوگی بە (-ان) کۆتایی هاتوو تێنەپەڕ و تێپەڕیش دەگرێتەوە :

أ) تێنەپەڕ . وەك :

ئاوسان ، ئاڵۆزان ، نیشان ، برژان ، پیشان ، ترسان ، تۆران ، خنکان ، ڕژان ، ڕوان ، ڕووخان ، ژاکان ، سووتان ، شێوان ، شیان ، کوڵان ، گەڕان ، گلان ، لەرزان ، لەوەڕان ، قڵیشان ، مان ، وەستان ... هتد .

ب) تێپەڕ . وەك :

بێژان ، پێچان ، پێوان ، دان ، شێلان ، کێلان ، گێڕان ، لێدان ، نان ، هێنان ، پێوان ... هتد .

٢-کۆمەڵی بە (-ین) کۆتایی هاتوو .

ئەم کۆمەڵە چاوگە تێنەپەڕ و تێپەڕیش دەگرێتە خۆ . وەك :

أ) تێنەپەڕ :

---

•

هەرچەندە زیرۆخ ، ڕۆش ئەحمەتەن

یەکسەر تسبیحی ، گۆزای سمناتەن

(صەیدی ، ل ٢٢٠)

بارین ، بەزین ، پەڕین ، تەزین ، تەپین ، تەقین ، تۆقین ، خزین ، خەنین ، چ تین ، ڕۆیین ، ڕوانین ، ڕزین ، لەقین ، لەوەڕین ، لەرزین ، کۆکین ، کە ن ، گەنین ، فڕین ، مەیین ، وەڕین .

ب) تێپەڕ :

ئاژنین ، بڕین ، بەخشین ، بینین ، پۆشین ، پشکنین ، پچڕین ، پرسین ، تاشین ، تولنین ، چنین ، دڕین ، دۆزین ، دۆشین ، زانین ، ژەنین ، سڕین ، سمین ، کڕین ، ماڵین ، مژین ، نووسین ، هاڕین ... هتد .

تێبینی :

کردارە تێنەپەڕەکانی ئەم کۆمەڵە ، گەلێ جار لەگەڵ تێنەپەڕە بە (-ان) کۆتایی هاتووەکاندا هاوواتایی و هاوشانی سازدەکەن . وەک :

| | |
|---|---|
| خزین | خزان |
| چەقین | چەقان |
| ڕزین | ڕزان |
| لەوەڕین | لەوەڕان |
| ... هتد . | |

٢-کۆمەڵی بە (-وون) کۆتایی هاتوو .

ئەگەرچی ئەم کۆمەڵەش ، وەک ئەوانی پێشوو تێنەپەڕ و تێپەڕیشی هەیە ، بەڵام ژمارەی ئەو چاوگانەی دەکەونە نێو ئەم کۆمەڵەوە یەکجار کەمن :

أ) تێنەپەڕ :

بوون ، چوون .

ب) تێپەڕ :

جوون ، دروون ، سوون ، گروون ...

٤-کۆمەڵی بە (-تن tin -) کۆتایی هاتوو

بەشی زۆری کردارەکانی ئەم کۆمەڵە تێپەڕن و بەشێکی کەمیشیان تێنەپەڕن . وەك :

أ) تێنەپەڕ :

بزووتن ، خەڵتن / خەوتن ، ڕۆیشتن ، کەوتن ، گەیشتن ، نوستن ، نیشتن ، هاتن ... هتد .

ب) تێپەڕ :

ئاژووتن ، بیستن ، بزاوتن ، بەستن ، پاڵاوتن ، پاراستن ، پەرستن ، چێژتن/ چێشتن ، خستن ، دیتن ، ڕشتن ، شتن / شوشتن ، کرۆشتن ، کوشتن ، گرتن ، گەستن ، هاویشتن ، مێشتن ، ویستن ... هتد .

٥-کۆمەڵی بە (-دن din) کۆتایی هاتوو:

ئەم کۆمەڵە هەر کرداری تێپەڕ دەگرێتە خۆ (جگە لە "مردن") ، کە تێنەپەڕە . وەك :

أ) تێنەپەڕ :

مردن

ب) تێپەڕ :

بردن ، بژاردن ، بواردن ، خواردن ، خوێندن ، چاندن ، ژماردن ، ژەندن ، سپاردن ، سەندن ، کردن ... هتد[١١] .

---

[١١] سەرنج ڕاکیش ئەوەیە ، د. زارێ بە ناوی ئەو چاوگانەی کۆتاییان بە (-اندن)ەوە دێت ، کۆمەڵی شەشەمی دیاری کردووە و بۆ ئەو کۆمەڵە کرداری وەك ، (ئاڵاندن ، بەزاندن ، جواندن ،

**تێبینی :**

١-لە بەشێکی زۆری کردارەکانی ئەم کۆمەڵەدا دەنگی (ر) لەپێش (-دن)ەوە دێت : (مردن ، بردن ، بژاردن ، بواردن ، خواردن ، ژماردن ، سپاردن ، کردن ...)و لە بەشێکی کەمیشیاندا دەنگی (ن) دەکەوێتە پێش (-دن)ەوە : (خوێندن ، ژەندن ، سەندن ، چاندن ... )[١٥]

٢-لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەنگی (د)ی پێش (ن)ی چاوگ نییە . وەك :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| بردن | برن |
| کردن | کرن |
| ... | |
| مردن | مرن |

---

شکاندن ...)ی کردووەتە نموونە - واتە ئەو کردارە تێ نەپەڕانەی بە یارمەتی پاشگری (-اندن) کراونەتە تێپەڕ . لێرەدا چەند تێبینییەك دەخەینە ڕوو :

١-د. زاری لە سەرەتاوە باسی کۆمەڵەکانی کرداری سادە دەکا ، بەلام ئەو کردارانەی پاشگری (-اندن) وەردەگرن ، لە سادەیی دەشۆرێن و دەبنە داڕێژراو .

٢-بەپێی ئەو بۆچوونەی د. زاری بێ ، دەبێ کۆمەڵی (-انەوە ، -ینەوە ، -وونەوە ، -تەوە ، -دنەوە)ش دیاری بکرێ . وەك (گەڕانەوە ، دۆزینەوە ، چوونەوە ، هاتنەوە ، خواردنەوە) . بەلام ئاشکرا دیارە (-ەوە)ش وەك (-اندن) پاشگرە و ناشێ بخرێتە نێو ئەو باسەوە .

(بڕوانە : د. زاری یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥ ، ل ٩٠ - ٩١) .

[١٥] ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی وای داناوە ، کە تەنیا لە چاوگی (خوێندن)دا ، دەنگی (ن) دەکەوێتە پێش (-دن)ەوە و بە بێزۆکی لە قەڵەم داوە (ل ٢٧٠) .

٣-لە هەندێ ناوچەی کوردەواریدا دەنگی (د)ی پێش (-ن)ی چاوگ دەکرێت بە (ت) . وەك :

| | |
|---|---|
| سپاردن | سپارتن |
| بواردن | بوارتن |
| هەناردن | هەنارتن |
| خواردن | خوارتن |
| ژماردن | ژمارتن |
| ... هتد[١٦] | |



چاوگ یان فۆرمی دیارنەخراو ئەگەرچی پێکهاتن و تایبەتێتیی خۆی هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەر بە فۆرمە گەردان نەکراوەکانی کردارە و واتای ڕوودان ڕادەگەیەنێ بێ ئەوەی نیشارەت بۆ پێوەندێتی بە ڕێژە یان کات یان کەس یان ژمارەوە بکات . لەم ڕووەوە چاوگ وەك ناوی مەعنەوی لە کاردایە ، بەڵام ئەم پرۆتسێنس نیشان دەدا و هەرچی ناویشە شت دیاری دەکا . چاوگ تایبەتێتی حاڵاتی کردار (ڕێژە ، کات ، کەس ، ژمارە)ی نییە ، بەڵام ئەرکی هەمە جۆری ڕستەسازی بەجێ دێنێ و بەتایبەتی هەندێ ئەرکی ئەوتۆ ، کە فۆرمی گەردان کراو ناتوانێ جێبەجێی بکات .

پێوەندیی هەمیشەیی چاوگ بە کردارەوە بەڵگەی وشەسازی و ڕستەسازی ئیسپاتی دەکەن : بوونی تێنەپەڕی و تێپەڕی (مردن - مراندن) ؛ کارا

[١٦] شایانی باسە ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد هەندێ لەو تایبەتێتییانەی کۆمەڵی چاوگی بە (-دن) کۆتایی هاتووی یادداشت کردووە (بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ٢٧٠ - ٢٧١) .

دیاری و کارا بزری (کوشتن - کوژران)... دیاری کردنی بە هۆی ئاوەڵکردارەوە (خێرا ڕۆیشتن)[17] و بەرکار وەرگرتن (ئاوخواردنەوە)[18]... هتد .[19] لەباری ڕستەسازییشەوە چاوگ دەتوانن وەك ئەندامی سەرەکیی ڕستە و وەك تەواوکەر خۆی بنوێنن .

تایبەتێتیی ناویی چاوگ لەوەدا دەردەکەوێ ، کە چاوگیش بەهەمان چەشنی ناو دەتوانن نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی وەرگرێ : (مردنەکەی باوکت بووە مایەی خەم و پەژارەی هەموان )[20]؛ (ئەوە چۆن هاتنێك بوو؟)[21]:

---

[17] دەرمانی دەردی ئێمە خوێندنە
ڕەوشتی پاك و خزمەت کردنە

(بێ کەس ، ل ٧٠)

[18] ئەیوویست تێبگا ڕۆژێك پێش مردن
بۆ تێگەیشتوو چی چاکە کردن

(پیرەمێرد ، ل ٤٢٧)

بیست و حەوت ساڵە تاڵە ژیانم
لە ژێر دەستیی تۆ زۆر پەرێشانم

(بێ کەس ، ل٣٦)

[19] شایانی باسە ، د. زارق باسی بەشێکی زۆری ئەو تایبەتێتییانەی کردووە (بڕوانە ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، ل ٨٠ – ٨١) .

[20] دڵ کە ناخۆش بوو برادەر جەژنی ئەو تەعزێیە هەر
عالەمی شایی بکا ، من بەستەیە گریانەکەم

(بێ کەس ، ل ١٧٥) .

[21] قەڵەمشانێ ئەوبێ کە بە چاو فەرقی کرابێ
هەروەك ، کە لە سێوێکی درابێ ددەس ئەشتەر

(ئەحمەد ، ل ٤٧)

لەگەڵ پێشبەند و پاشبەندەدا دێت : ( لە ڕۆیشتنیدا ئاگات لە خۆت بێ)[22]؛ وەك دیارخەر و دیارخەریش دێ و نیشانەی ئیزافەی دەچێتە سەر : (هاتنی ئازاد بێ مەبەست نەبوو )[23]؛ (کاتی خوێندن دەستی پێ کردووە )[24]... لە ڕستەشدا وەك نیهاد خۆی دەنوێنێ : (خوێندن کەڵکی زۆرە )[25] و دەوری تەواوکەری ڕاستەوخۆ (بەرکار) دەبینێ (خوێندنم تەواوکرد)[26] و دەبێتە بەشی ناوی گوزارە (هەر خەریکی کوشتن و بڕینە) ...

---

(22) پیاو نەبێ بۆ سەندنی حەققی لە مردن سڵ نەکا
هەر (بڕووخێ) بەس نییە . تاکو نەسەنرێ نادرێ
(بێکەس ، ل 82)

(23) لەتەك هەموو عەزاب و ژیانی بێ هیوادا
ئەم ڕەنجی ساڵەهایەم ، کە گشتی چوو بە بادا
(هەردی ، ل 65)

(24) ئاڵە خونچەی باخی ژیانم
زیندووکەرەوەی ئاواتی بێگیانم
(هەردی ، ل 53)

(25) کاکە دانیشتن ماڵ وێران نەکا
بێ ئیشی ئینسان پەرێشان نەکا
(بێکەس ، ل 92)

(26) جیلوەت لە چاوم ون نەبێ
هەرگیز لای تۆ نووستن نەبێ
(گۆران ، ل 14)

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و شێوەی موکری و ئاخاوتنی هەندێ ناوچەی کرمانجیی خواروودا چاوگ وەك ناوی جنسی مێ خۆی دەنوێنێ :[٢٧]

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ئەگەر دیارخراو ناوبێ و ژمارەی تاکی جنسی مێ بێ ، نیشانەی (ـا) وەردەگرێ . چاوگیش کاتێ دەوری دیارخراو دەبینێ ، بەهەمان شێوەی ناو نیشانەی (ـا)ی جنسی مێی ئەچێتە سەر . وەك :

ا) ناو :

شەمما ویصالێ هەر گەشە

شەوقا شەمالێ ئاتەشە[٢٨]

(جزیری ، ل ٦٣)

ب) چاوگ :

خومرنا نیشەف بهێلە سبەهێ لێ شغولێ نیشەف مەهێلە سبەهێ .

(گوردۆ ، ل ٢٣٢)

ناوی جنسی مێ لە دۆخی تیاندا لە دیالێکتی ژووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی خواروودا چۆن نیشانەی (ـێ) وەردەگرێ ، چاوگیش لە دۆخی ناوبراودا وەك ناو هەمان نیشانەی (ـێ)ی پێوە دەلکێ :

---

(٢٧) شایانی باسە ، مامۆستا قەنانی کوردۆ هەندێ لەو تایبەتییانەی یادداشت کردووە (بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی ، ل ١٧٢).

(٢٨) بۆ پتر زانیاری لەو بارەیەوە ، بڕوانە لاپەرە (٢٤٢ - ٢٤٤)ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە - (ناو) .

ا) ناو :

یەك نارمانج

یەك رێزان

یەك رامان

خەباتێ بکی

ژ بۆ کوردستان

(سەبری ، ل ٦٧)

چاوم عەیشۆکێ نۆمەری

گوڵێ رۆیی لۆ نەوبەری

(فۆلکلۆر ، ل ٤٠)

بە سەری شێخ حوسێنی

ناوێ لۆ کەپرێ دێنی

(تحفە مظفریە ، ب١ ، ل٩٠)

... هتد[٢٩]

ب) چاوگ:

دەلیلێ بارانێ بانە ، دەلیلێ مرنێ تانە .

(گیوەنۆ ، ل ٣٢)

سووندەکی دەخوا (تەراق) بە ژنێ

(تاران)م نابەی بەبێ کوشتنێ

(فۆلکلۆر ، ل٣٦)

... کە هاتەوە وەلاتی ، عێلانی وێی لێ خڕبوونەوە ؛ دیسان یاغی بوو ، دەستی کرد بە قەلات دروست کردنێ .

(تحفە مظفریە ، ب١ ، ل١٧٩)

---

[٢٩] بروانە لاپەرە (١٧٢ – ١٧٨) و (١٨١ – ١٨٤)ی هەمان سەرچاوە .

له زمانی کوردیدا هەندێ چاوگ هەیه به سادەیی- واته بێ یاریدەی پێشگر یاخود پاشگر ، واتا ناگەیەنن . وەك :

*پێشگر .

| | |
|---|---|
| پەروزان | هەڵپەروزان |
| پلۆسین | داپلۆسین |
| پسکان | راپسکان |

* پاشگر.

| | |
|---|---|
| بەشین | بەشینەوە |
| پاران | پارانەوە |
| پرخان | پرخاندن |
| پرژان | پرژاندن |
| ... هتد . | |

## کرداری تێنەپەڕ و کرداری تێپەڕ

پێویستە ئەوە بزانین ، کە وشە هەر ئەوەندە نییە دانەیێك بێ لە کۆمەڵی وشەکانی زمان، یان تەنیا پارچەیێك لە "کەرەستەی بینای زمان" بێ . وشە ئەو دانەیەی کۆمەڵی وشەکانی زمانە ، کە وا ڕاستەوخۆ پێبەندی یاسا و دەستووری ڕێزمانە . ڕێزمانیش بریتییە لە کۆمەڵێ یاسا و دەستوور لەبارەی گۆڕینی وشە و چوونە پاڵ یەکدی وشە لە ڕستەدا . بۆ ئەوەی یاسایێکی ئاشکرای ڕێزمانی ، یاخود دەستوورێکی دیاری کراوی ڕێزمانی وشەیێکی پێ جیابکرێتەوە ، دیارە دەبێ ئەو یاسایە ، یان ئەو دەستوورە باڵ بەسەر گشت ڕووییکی وشەکەدا بکێشێ ، نەك تەنیا بەسەر هەندێ فۆرمیدا ... بەم پێیە دەتوانین بڵێین ، خودی ڕوودانی گۆڕانی ڕێزمانیی وشە ، دەرکەوتن و بەڵگەی دیاری کردنی تێکڕای مەبەستی یەکێتی خاسیەتی ڕێزمانییە . واقیعی بوونی یاسای گشتیی ڕێزمانی لە یەکگرتنی وشەدا دەرکەوتن و بەڵگەی ئەوەیە ، کە وشە بە گشتی خاوەنی خاسیەتی دیاریکراوی ڕێزمانییە . لە هەر فۆرمێکی ڕێزمانیدا وشە جیادەبێتەوە . بەڵام سەرپاکی سیستەمە فۆرمییە ڕێزمانییەکەی وشە ، خاسیەتی دیاریکراوی گشتیی ڕێزمانی دەداتێ و دەیخاتە کۆمەڵێکی دیاریکراوی ڕێزمانییەوە ، یان گرووپێکی وشەوە ...

کێشەی دیاریکردنی جیاوازیی پێوەندیی نێوان چەند وشەیێك و چەند فۆرمێکی یەك وشە ، یەکێکە لەو باسە گرنگانەی پێویستی بە لێکۆڵینەوەیە ... دەزانین (دەمرێ) ، (مرد) ، (دەمرد) ، (مردووە) ... وشەی جیاواز نین و فۆرمی جیاوازی یەك وشەن و پێوەندیتی فۆرم کۆیان دەکاتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ، کە هەریەك لەو فۆرمانە خاوەنی واتای خۆیەتی ، بەلام هەموویان خاوەنی واتایێکی هاوبەشن ، کە ئەویش ڕوودانە . جا "واتای گشتیی ڕوودان" ، کە هەموو ئەو فۆرمانە دەگرێتە خۆ ، بە تایبەتێتیی گشتیی ڕێزمانییانەوە بەندە . هەر تایبەتێتی ڕوودانیشە جیایان دەکاتەوە لە وشەی (مردوو)ی هاوبنەمای واتا یەکجار نێزێك لێیانەوە . دەشێ بوترێ " واتای گشتیی ڕوودان " تایبەتێتی هەموو فۆرمێکی کردارە .

لە بواری فۆرمی کرداردا بەرانبەر یەکتر وەستانی تێنەپەراندن و تێپەراندن دێتە پێش چاو ... لە زمانی ڕووسی و ئینگلیزیدا ع کرداری تێنەپەر و ع کرداری تێپەر فۆرمی جیاوازی یەك وشەن[٣٠] ... لە زمانی کوردیدا لەگەڵ ئەوەدا ، کە وەك زمانی ڕووسیی و ئینگلیزی فۆرمی جیاوازن و لە سیستەمی یەك وشەدا کۆدەبنەوە ، بەلام هەندێ کردار هەن ، کە شێوەی تێنەپەر و تێپەریان وشەی جیاوازن و فۆرمی جیاواز نین .

نموونە بۆ فۆرمی جیاواز :

| | |
|---|---|
| مردن | مراندن |
| شکان | شکاندن |
| نوستن | نواندن |

... هتد .

[٣٠] بڕوانە : ڤ. ئی. سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ٢١٥ .

نموونە بۆ وشەی جیاواز :

| | |
|---|---|
| کەوتن | خستن |
| بوون | کردن |
| چوون | بردن ، ناردن |
| مانەوە | هێشتنەوە |
| ... هتد . | |

ناو و جێناو و ناوەڵناو و ئاوەڵکردار بە تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندنەوە بەند نین ، بەڵام ئەمە تایبەتێتی کردارە و دەشێ ناوبنرێ (دۆخی پێوەندێتی‌ی بەرکار) .

کردار وەنەبێ وا بە ئاسانی و ڕوونی بەسەر تێنەپەڕ و تێپەڕدا دابەش بکرێ . زۆر جار هەر لەیەک کرداردا دەشێ تێپەڕاندن و تێ نەپەڕاندن گەلێ لکی لێ ببێتەوە و ئەو لکانەش بە زەحمەت یەکتر بگرن . لەسەر بناغەی خاسیەتی تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندن دابەش کردنی ئەم دەستە کردارە یان ئەو دەستە کردارە و لەبەرچاوگرتنی گشت توانایێکی پێوەندیی نێوان هەردوو دەستەی ئەو دۆخە لە سنووری تاکە وشەیەکدا ، ئەرکێکی تایبەتی‌یە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی سەربەخۆیە .

باسی تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندن بە شێوەیێکی گشتی ، کێشەیێکی تایبەتی‌یە لە بواری کارا بزریدا و جیاوازە لەوەی لە بواری کارا دیاریدا دەیبینین . چۆن فۆرمی بزر ، نەک هەر لە ڕووی وشەسازی‌یەوە ، بەڵکو لە ڕووی ڕستەسازی‌یشەوە ، لە فۆرمی دیار جیادەبێتەوە ، بەهەمان ڕێگەش تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندن لێك دەترازێن .

لە ڕووی واتاوە کردار دابەش دەبێ بەسەر دوو دەستەی گەورەدا : تێپەڕ و تێنەپەڕ ، کە وا لە پێوەندییاندا بە بەرکارەوە لەیەکتر جیادەبنەوە .

کردای تێپەڕ واتای چالاکیی کارا و ڕێچکەی بەرەو بەرکار نیشان دەدات : زەوی دەکێڵین ، ڕۆژنامە دەخوێنمەوە . ئەم جۆرە ڕووداناتە ناشێ بەبێ بەرکار بێ : کێڵان ناکرێ ، ئەگەر زەوی نەبێ . خوێندنەوە پێك نایە ، ئەگەر ڕۆژنامە یان کتێب یان هەر کەرەستەیێکی دی خوێندنەوە نەبێ . بەرکار واتای ئەو کردارانە ڕوون دەکاتەوە و دەچەسپێنێ . گەلێ جار کردار بەبێ بەرکار واتای تەواو ناگەیەنێ . بۆ نموونە : قوتابییەکە خوێندییەوە ؛ ئازاد هێنای...

کردای تێنەپەڕ پێوەندیی ڕوودان بە کاراوە ڕادەگەیەنێ : منداڵەکە نوست ، پووشەکە سوتا ... ئەم جۆرە کردارانە پێویستیان بە بەرکار نییە .

جیاوازی لە ڕووی پێوەندی بە بەرکارەوە ، دەبێتە تایبەتێتییێکی ڕستەسازیی ئەو دوو دەستە کردارە .

بەهێزبوون یان بێهێزبوونی پێوەندی بە بەرکارەوە دەبێتە هۆی بوونی کرداری تێپەڕ بە تێنەپەڕ و بەپێچەوانەوە تێنەپەڕ بە تێپەڕ ... بۆ نموونە لە زمانی کوردیدا کرداری (بوردن) ، لە گەرداندا وەك تێنەپەڕ جێناوی لکاو وەردەگرێ : بوردم ، بوردیت ، بورد ، بوردین ، بوردن ، بوردن ... کەچی کە دەڵێن : (بەمبوورە ، دەتبوورم ...) دەبێ بە تێپەڕ .

واتە ئەم کردارە لە باری ڕستەسازییەوە تێپەڕە و لەباری وشەسازییەوە تێنەپەڕە[31] ... بێگومان ڕوون کردنەوەی ئەم دوولایەنییە ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەیە

---

[31] شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەممەد پەنجەی بۆ ئەم ڕاستییە ڕاکێشاوە (بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی ... ی زمان و زانستەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٢٤ - ١٢٥ .

لە زۆر حاڵەتدا کرداری تێنەپەڕ و تێپەڕ لە ڕووی ڕۆنانەوە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە . بۆ نموونە (-اندن) ، کە دەخرێتە سەر کردارێکی تێنەپەڕ ، دەیکا بە تێپەڕ :

شکان - شکاندن

تەزین - تەزاندن

مردن - مراندن

... هتد .

لە زمانی ڕووسی و ئینگلیزیدا کاتێ پێشگر دەخرێتە سەر هەندێ کرداری تێنەپەڕی سادە ، دەیکاتە تێپەڕ ، یاخود بەپێچەوانەوە تێپەڕ دەکا بە تێنەپەڕ ...[32] بەڵام لە زمانی کوردیدا پێشگر[33] کرداری تێنەپەڕ ناکات بە تێپەڕ و تێپەڕیش ناکات بە تێنەپەڕ[34]. وشەی (بەزین) و (دابەزین)

---

[32] بڕوانە :

ا) ئا . ن . گفۆزدیێڤ ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٢٩٦ .

ب) سەرچاوەی ناوبراو ، ئا . نی . سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، ل ٢١٧ .

[33] ڕاستە لە زمانی کوردیدا پێشگر کرداری تێنەپەڕ ناکات بە تێپەڕ و تێپەڕیش ناگۆڕێ بۆ تێنەپەڕ ، بەڵام پاشگری (-اندن) ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە کردنی کرداری تێنەپەڕ بە تێپەڕ . جا بۆیە ڕاست نییە ، کە مامۆستا مەسعوود محەممەد پاشگریشی لە پاڵ پێشگردا داناوە و وتوویە ، "... پێشگر و پاشگری کوردی سروشتی فیعلەکان ناگۆڕن ، واتە لازم ناکەن بە متعدی و متعدیش ناکەن بە لازم" (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، بەرگی سێیەم ، بەشی دووەم ، ل ٢٦٥) .

[34] هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە کاتێکدا کە سوودیان لە سەرچاوەی ڕووسی یان ئینگلیزی وەرگرتوە ، تایبەتیی زمانی کوردییان تێدا نەخوێندووەتەوە . لەبەر ئەوەی لە

هەردووکیان تێنەپەڕن و وشەی (کێلان) و (هەڵکێلان)یش هەردووکیان تێپەڕن .

لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا نیشانەیێکی مۆرفۆلۆژی نییە ، کە کرداری تێپەڕ و تێنەپەڕی لەیەکتر پێ جیابکرێتەوە ، بۆیە زۆربەی نووسەران لەسەر بناغەی واتا لەم کێشەیە دەدوێن .

بەڵێ یەکێ لە تایبەتییە بنجییەکانی کرداری تێنەپەڕ ئەوەیە ، کە وا بەرکاری ناوێت ، بەو واتایە کە ڕاستەوخۆ ناوی کارا ناچێت بۆ سەر هیچ وشەیێك لە دەرەوەی وشە و واتای کردارەکە خۆی .

هەندێ نموونەی کرداری تێنەپەڕ :

گەڕان ، ڕژان ، بەرژان ، پیشان ، کولان ، خنکان ، سووتان ، ئاوسان ، جوولان ، لەرزان ، ژاکان ، ئێشان ، لەوەڕان ، ترسان ، مان ، ڕووخان ، ڕمان ، ئاوسان ، گلان ، قلیشان ، ڕوان ، وەستان ، هەڵستان ، ئاڵۆزان ، ئاڵۆزکان / ئاڵۆسکان ، بڕان ، تۆران ، شێوان ، شیان ...

---

-

زمانی ڕووسی و ئینگلیزیدا پێشگر یاریدەی گۆڕینی کرداری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ یان تێپەڕ بۆ تێنەپەڕ دەدات ، وایان بڕیار داوە لە کوردیشدا دەبێ هەر بەوچەشنە بێ ... شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەممەد نەکەوتووەتە ئەو هەڵەیەوە و هەرچی کێشەی کرداری (کردن) و (ڕاکردن)یشە ، بەم جۆرەی لێك داوەتەوە : "وشەی (ڕاکردن) بەپێچەوانەی دەستوورە گشتییەکە فیعلی (کردن) لێدا لە تێپەڕەوە بووە بە تێنەپەڕ ، چونکە (ڕاکردن) خۆی تێنەپەڕە ... ئەم (ڕا)یەی ناو وشەی (ڕاکردن) پێشگر نییە ، بەڵکو کورت کراوەی وشەی (هەڕا)یە بە واتای (فار) . لەمەوە دەردەکەوێ لازم بوونی (ڕاکردن ، هەڕاکردن) دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (هەڕا) کە پێشگر نییە و وشەیێکی سەربەخۆیە" (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ... ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، بەرگی سێیەم ، بەشی دووەم ، ل ٣٦٥ - ٣٦٦) .

لـەرزین ، تـەزین ، ڕزیـن ، کۆکـین ، تـەپین ، وەریـن ، خـەنین ، پێکـەنین ، خزیـن ، تۆقـین ، تـەقین ، لـەقین ، چـەقین ، کـەنین ، فڕیـن ، بـارین ، ڕوانـین ، لـەنگین ، گـەیین ، لـەوەڕین ، ڕژیـین ، مـەیین ، بـەزین ، وەریـن ، پـەڕین ، پەڕینەوە ...[٣٥]

چوون ، بوون ...

مردن ...

---

[٣٥] بەشێک لە چاوگی بە (ان) کۆتـایی هـاتوو لەگـەڵ چاوگی بـە (یـن) کۆتـایی هـاتوو ، بەرانبەر یەك دەوەستن . وەك :

| | |
|---|---|
| لەرزان | لەرزین |
| تەزان | تەزین |
| لەوەڕان | لەوەڕین |
| خزان | خزین |
| تەقان | تەقین |
| لەقان | لەقین |
| تۆقان | تۆقین |
| ڕژان | ڕژاین |
| ڕەمان | ڕەمین |
| چەمان | چەمین |
| چەسپان | چەسپین |
| چەقان | چەقین |
| وەران | وەرین |
| گەوزان | گەوزین |

... و گەلێکی دی .

هاتن ، نوستن ، کەوتن ، گەیشتن ، نیشتن ، خەوتن / خەفتن ، بزووتن ، پڕ شتن ...

لەزمانی کوردیدا کرداری تێنەپەڕ لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :

١-تێ نەپەڕی خوازەکی (الارادی) .

لەم جۆرە کردارانەدا دەوری کارا شتێکی ئاشکرا و ئیرادیە .

وەك :

ئازاد هات .

کوڕەکە ڕۆیشت .

چۆلەکەکە فڕی .

منداڵەکە گەڕا .

٢-تێنەپەڕی ڕوودان .

لەم جۆرە کردارانەدا کارا دەورێکی تایبەتی خۆی نیە بەو واتایە کە ئیشەکە بە بێ خواهیشتی کارا دێتە دی . وەك :

ئاوەکە ڕژا .

شووشەکە شکا .

دیوارەکە ڕووخا .

سوارەکە گلا . [٣٦]

---

[٣٦] بەلام کرداری تێنەپەڕ (گیلان ، دان ...) ئاوتری (گیلا ، دا...) ، تەنها لە ڕێی (را)ی کارا نادیارەوە دەبێ بە (زەوییەکە گێلرا ، باجەکە درا...) ...

هەرچی کرداری تێنەپەڕە ، کە دەکرێ بەکارا نادیار ،

١-لەنێوان ڕەگ و (را) دا (ێــ) پەیدا دەبێ ،

شکا – شکێنرا ، هات – هێنرا ، سووتا – سووتێنرا ، ڕووخا – ڕووخێنرا ...

لە زمانی کوردیدا زۆربەی کرداری ڕوودان لە چاوگی ئەللی‌یەوە وەردەگیرێن . وەك :

ڕژان ، شکان ، سووتان ، خنکان ، ڕمان ، ڕووخان ، بڕژان ، پسان ، پیشان ، کوڵان ، ئاوسان ، خنکان ، ترسان ، گلان ، قڵیشان ...

تایبەتێتی‌یێکی بنجی‌ی کرداری تێپەڕیش ، ئەوەیە پێویستی بە بەرکار هەیە بۆ تەواو کردنی ماناکەی .

کرداری تێپەڕیش وەك تێنەپەڕ لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :

١-ئەو کردارەی پێویستی بە یەك بەرکار هەیە و تاوی ناڕوا بۆ دووەم . وەك :

گورگ مەڕ دەخوات — (مەڕ) — بەرکارە

زەویم کێڵا — (زەوی) — بەرکارە .

٢-ئەو کردارەی پێویستی بە پتر لە بەرکارێك هەیە :

پارەت دەدەمێ — (پارە) و (ت — تۆ بەرکارن[٣٧] .

هەندێ نموونەی کرداری تێ پەڕ :

هێنان ، لێدان ، هەڵدان ، پێوان ، گێڕان ، کێڵان ، پێچان ، شێلان ، بێژان ، وێران ، دان ، نان ...

---

٢- کە دەوترێ (شووشەکە شکا) ، ئەوە (شووشە) کارایە ، بەڵام ، کە دەوترێ (شووشەکە شکێنرا) ، ئەوە (شووشە) بەرکارە.

(٣٧) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٠٠ -١٠٥ .

کرین ، مالین ، مژین ، نووسین ، دڕین ، سڕین ، چنین ، بڕین ، دۆزین ، ڕۆشین ، سمین ، بەخشین ، پچڕین ، زانین ، ئاژنین ، بینین ، پرسین ، پشکنین ، ڕێشین ، تاشین ، توانین ، ژمنین ، هاڕین ...

دروون ، سوون ، گروون ، جوون ... [38]

خواردن ، ناردن ، چاندن ، بژاردن ، خوێندن ، ژماردن ، ژمندن ، کردن ، سپاردن ، بواردن ، سەندن ، بردن ...

خستن ، ڕشتن ، گەستن ، شتن / شوشتن ، ئاژووتن ، بیستن ، دیتن ، گرتن ، هاویشتن ، کوشتن ، کرۆشتن ، ویستن ، وتن ، هێشتن ، بەستن ، پالاوتن ، پاراستن ، پەرستن ، چێژتن / چێشتن ...

تێبینی :

هەندێ چاوگی دەستەی بە (ان) کۆتایی هاتوو ، کە تێیاندا (ر) یان (ڕ) دەکەوێتە پێش (ا) کەوە ، وەك :

بران ، بڕان ، دران ، دڕان ، کران ، گیران ، شۆران ، کوژران ، وتران ...

سەرنجی چەند نووسەرێکیان ڕاکێشاوە :

د. زاری یووسف بە دەستەیێکی تایبەتی داناون و لە ژێر ناوی (کردلری کارا نادیار)دا ڕیزی کردوون[39] . مامۆستا مەسعوود محەمەد تەنیا لە (دڕان ،

---

[38] د. نەسرین فەخری (بوون)ی لە ڕیزی تێنەپەڕیش و تێپەڕیش داناوە (بڕوانە : د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی ، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٢ ، ل ١٠٤ – ١٠٥) .

[39] د. زاری یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥ ، ل ٨٧ .

بڕان ، گیران ، گۆڕان) دواوه و له نێوانیاندا (دڕان ، بڕان)ی به کرداری تێنەپەڕ داناوه و (گێڕان ، گۆڕان)یشی بەکرداری کارا نادیار لەقەڵەم داوه[40] ...

ئێمەش لە لێکۆڵینەوەی ئەو کردارانەدا ، گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامەی سەرپاکیان به تێنەپەڕ دابنێین ، ئەویش چونکه :

١-تێکڕایان له ڕێژەی ڕابوردووی بەردەوامدا وەك کرداری تێنەپەڕ جێناوی لکاو وەردەگرن :

دەبرام ، دەبڕام ، دەدرام ، دەدڕام ، دەکرام ، دەگێڕلم ...

بەڵام دەزانین ، که له کرداری تێپەڕدا جێناوه لکاوەکە دێتە پێشەوە . وەك :

دەم گێڕا ، دەم وێرا ، دەم کڕی ، دەم بڕی ، دەم پچڕی ...

٢-هەندێکیان وەك کرداری تێنەپەڕی ئاسایی پاشگری (-اندن) وەردەگرن و دەبنە تێپەڕ : (دڕاندن ، کوژراندن ، بڕاندن ...) . وەك ئاشکراشه ، پاشگری (-اندن) کرداری کارا نادیار ناکاتە کرداری کارا دیار ، بەڵکو کرداری تێنەپەڕ دەکاتە تێپەڕ .

وەرنەگرتنی پاشگری (-اندن) له لایەن بەشێکی دیکەیانەوە ، هەرگیز نابێتە بەڵگەی دانەنانیان به تێنەپەڕ ، ئەویش لەبەر ئەوەی گەلێ کرداری دی تێنەپەڕ هەن و پاشگری (-اندن) وەرناگرن ، وەك : هاتن ، مان ، ڕۆیشتن ... بەڵکو بەرانبەریان تێپەڕ هەیه . وەك :

---

[40] ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ (ڕای مەسعوود محەمەد ، ل ١٢٥ - ١٢٩) .

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
| --- | --- |
| هاتن | هێنان ، هانین |
| مان | هێشتن ، هێلاّن |
| ڕۆیشتن | ناردن |
| کەوتن | خستن |
| بزووتن | بزاوتن ، بزافتن |
| چوون | بردن ، ناردن |
| ڕژان | ڕشتن |
| سوان | سوین ، سوون |
| کشانەوە | کێشانەوە |
| قلیشان | قەڵاشتن |
| هەڵستان | هەڵگرتن |
| مانەوە | هێشتنەوە ، هێلاّنەوە |
| بوون | کردن |
| بەربوون | بەردان |

... و هەندێکی دی .[41]

[41] لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد بەشێکی زۆری کردارەکانی ئەم لیستەیەی یادداشت کردووە (بڕوانە ، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ١٢٣) .

جا ئەو چاوگانەش ، کە بە (ان) کۆتاییان دێ و تێیاندا (ڕ) یان (ڕ) کەوتووەتە پێش (ا)کەوە ، هەر وەك ئەو لیستەیەی سەرەوە ، بەرانبەر گشتیان کرداری تێپەڕ هەیە . وەك :

| تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|
| بردن | بران |
| دان | دران |
| کردن | کران |
| گرتن | گیران |
| شوشتن | شۆران |
| گوتن | گوتران |
| کوشتن | کوژران |
| دڕین | دڕان |
| بڕین | بڕان |
| گۆڕین | گۆڕان |
| گێڕان | گەڕان |
| سڕینەوە | سڕانەوە |
| پچڕین | پچڕان |

وێڕای ئەو جۆرە بەرانبەر یەکتر وەستانە بنجییەی کرداری تێنەپەڕ و تێپەڕ ، کە بەشێکی یەکجار کەمی کردار دەگرێتەوە ، بارێکی ڕێزمانیش هەیە ، کە زۆربەی زۆری کردارە تێنەپەڕەکانیان پێ دەبن بە تێپەڕ . ئەویش بەکارهێنانی پاشگری (-اندن)ە[٤٢] بە دوا کرداری تێنەپەڕدا .

---

[٤٢] ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیدا لە شێوەی (- اندن) و (-انیدن)دا دەبینرێ ،

ئەم پاشگرە (-ند ، -اند ، -دن ...) نی یە ، وەك هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی دایان ناوە ، بەڵکو (-اندن)ە ، چونکە لە باری ئاساییدا بە باشی دەردەکەوێ ، بەلام وەك زۆر دیاردەی دی زمانی کوردی ، لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیێکی دیکە دەبینرێ و ئەمە بووەتە هۆی گۆڕینی شێوەی .

کاتێ بە یاریدەی پاشگری (-اندن) کرداری تێنەپەڕ دەکرێ بە تێپەڕ ، بە شێوەیێکی سەرەکی نیشانەی چاوگ – (ان ، ین ، دن ، تن)[٤٢] – لادەدرێ و (-اندن) دەخرێتە سەر بناغەی چاوگ ، بێ ئەوەی ڕوودانێکی فۆنەتیکی بێتە گۆڕێ . وەك :

| تێنەپەڕ | بناغەی چاوگ | پاشگر | تێپەڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| گەڕان | گەڕ | لندن | گەڕاندن |
| ڕژان | ڕژ | اندن | ڕژاندن |
| سووتان | سووت | اندن | سووتاندن |
| لەرزین | لەرز | اندن | لەرزاندن |
| پەڕین | پەڕ | اندن | پەڕاندن |
| مردن | مر | اندن | مراندن |
| خەوتن | خەو | اندن | خەواندن |

چوپان بز را چراند

ب گیاه را رویانید

(بروانە : ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تهران ، ١٣٤٣ ، ل ٢٨ – ٢٩) .

[٤٢] جگە لەم چاوگانەی کۆتاییان بە (وون) دێت .

وێڕای ئەم شێوە سەرەکی‌یە بۆ گۆڕانە ، کە زۆری چاوگەکان دەگرێتە خۆ ، هەندێ حاڵەتی بێژۆکیش هەیە :

١-ئەگەر چاوگێك کۆتایی بە (وون) بێ ، ئەوە (ن) لادەبرێ و بزوێنی (وو)ی پێشی دەبێ بە کۆنسۆنانتی (و – W)[44] :

چوون – چواندن

بوون – بواندن [45]

٢-بێتو چاوگێك کۆتایی بە (تن) بێت و دەنگی پێش نیشانەی چاوگەکە (س) یان (ش) بێت ، ئەوە ئەو دەنگانەش ، واتە (س ، ش) ـ تێ‌دەچن . وەك :

نوستن – نواندن

گەیشتن – گەیاندن

تێبینی :

١-لەو چاوگە تێنەپەڕانەی لە بنچدا بەرانبەریان چاوگی تێپەڕ هەیە :

أ) بەشێکیان هەروەها بە یاریدەی (–اندن)یش دەبنە تێپەڕ .

وەك :

---

[44] لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ زانیاری کورد وای داناوە ، کە (ن) لادەبرێ و (اندن)ی دەخرێتە سەر (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ١٣١) ، بێ ئەوەی باسی ئەوە بکا ، کە بزوێنی (وو -U) دەبێتە بە کۆنسۆنانتی (و – W) .

[45] نەك هەر لەم بارەدا بزوێنی (وو – U) دەبێ بە کۆنسۆنانتی (و – W) ، بەڵکو هەر چاوگێکیش ، ئەگەر بناغەکەی بە بزوێنی (وو – U) کۆتایی بێت ، دەبێ بە کۆنسۆنانتی (و -W) . وەك :

بزووتن – بزواندن

پشکووتن – پشکواندن

| | | |
|---|---|---|
| کەوتن | – کەواندن | ، خستن . |
| بزووتن | – بزواندن | ، بزاوتن ، بزاڤتن . |
| چوون | – چواندن | ، بردن ، ناردن . |
| ڕژان | – ڕژاندن | ، ڕشتن . |
| دڕان | – دڕاندن | ، دڕین . |
| گەڕان | – گەڕاندن | ، گێڕان . |
| بڕیان | – بڕیاندن | ، بڕین . |

... هتد .

ب) بەشێکیشیان (–اندن) وەرناگرن . وەك :

بۆ (هاتن) ، کە تێنەپەڕە و بەرانبەری (هێنان ، هانین)ی تێپەڕ هەیە ، کەس نالّێ (هاندن) یان (هاتاندن) ...

٢–هەندێ کردار هەر تێنەپەڕن و بەرانبەریان تێپەڕ نییە و کەچی پاشگری (–اندن)یش وەرناگرن . وەك :

(سرەوتن) هەیە و (سرەواندن) نییە .

(نیشتن) دەوترێ و (نیشاندن ، نیشتاندن) ناوترێ .

(زان) باوە و (زاناندن) نەبیستراوە .

(گەنین) هەیە و (گەناندن) نییە .

... هتد (٤٦).

---

(٤٦) سروشتی ڕوودانی ئەو جۆرە وشانە ، شتێکی ئاوەکییە و ڕێگەی ئەوەی نییە کەسێك لە لاوە بەسەر یەکێکی دیدا بسەپێنێ – واتە ناشێ لە لاوە کارا بۆ ئەم کردارانە پەیدا بکرێ ... شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەممەد بە وردی ئەو تایبەتێتییەی ڕوون کردووەتەوە و وتوویە : "لێ دەتوانی یەکێکی تر (بخەوێنی وەیا بشێوێنی) بە هۆی ئەو ئامرازانەوە لە خەوتن و شێوان پەیدا دەکەن بەڵام ناتوانی لە هەروونی هەمان کەسدا (سرەوتن) پەیداکەیت چونکە سرەوتنەکە لە لاوە نایەت بۆی ... " (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ... ، ل ١١٢) .

جگە لە بەرانبەر یەکتر وەستانی بنجی دوو جۆرە کرداری تێنەپەڕ و تێپەڕ و سەرەڕای ڕێگەی ڕێزمانی بە یاریدەی پاشگرێ (-اندن) ، ڕێگەی لێکسیکیش هەیە ، کە ئەوانیش بە یاریدەی وشەی (هێنان ، خستن ... )ەوەیە ، کە دەشێ هەندێ کرداری تێنەپەڕیان پێ بکرێ بە تێپەڕ . وەك :

هێنانە پێکەنین ، خستنە پێکەنین

هێنانە گریان ، خستنە گریان

... هتد .

پاشگری (-اندن) لەگەڵ ئەو ئەرکە سەرەکی و باڵایەدا ، کە کرداری تێنەپەڕ دەکات بە تێپەڕ ، هەروەها دەوری ڕۆنانی کرداری تێنەپەڕیش دەبینێت ... بۆ نموونە ، دەچێتە سەر ناوی دەنگە سروشتییەکان و دەیانکات بە کرداری تێنەپەڕ . وەك :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| قیژە | + | اندن | - | قیژاندن |
| گرمە | + | اندن | - | گرماندن |
| باعە | + | اندن | - | باعاندن |
| زیرە | + | اندن | - | زیراندن |
| بارە | + | اندن | - | باراندن |

... هتد [٤٧].

---

[٤٧] هەرچی وشەکانی (گریاندن ، تەقاندن ، تۆقاندن ، تەپاندن...) ە ، کە نەبوونەتە تێنەپەڕ و بوونەتە تێپەڕ ، هۆی ئەوەیە ، کە ئەم کردارانە لە ناوی سروشتییەوە وەرنەگیراون ، بەڵکو لە ناوی چاوگەوە (گریە ، تەقە ، تۆقە ، تەپە ... )ەوە یان لە چاوگی تێنەپەڕی (گریان ، تەقان ، تۆقان ، تەپان ... )ەوە وەرگیراون .

لەم ڕووداوەدا ، کە دوو بزوێن – واتە (ە)ی کۆتایی ناوە سروشتی‌یەکان و (ا)ی سەرەتای پاشگری (-اندن) – دەکەونە پاڵ یەك ، ئەوە لە ئەنجامدا (ا) دەمێنێتەوە و (ە) تێ‌دەچێ .



لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لەگەڵ کرداری تێنەپەڕی ڕابوردوو و تێنەپەڕ و تێپەڕی ڕانەبوردوودا دەستەی یەکەمی جێناوە کەسی‌یە جوداکان – واتە جێناوەی دۆخی ڕاستەوخۆ : (ئەز ، تو ، ئەو ، ئەم ، هوون ، ئەو / ئەوان) دەبنە کارا . لەگەڵ کرداری ڕابوردووی تێپەڕیشدا دەستەی دووەمی جێناوە کەسی‌یە جوداکان – واتە جێناوی دۆخی تیان : (من ، تە ، ئەوی / وێ ، ئەوی / وی ، مە ، وە ، ئەوان / وان) وەك کارا خۆیان دەنوێنن :

(١) کرداری تێنە پەڕی ڕابوردوو و تێنە پەڕ و تێ پەڕی ڕانەبوردوو .



| جیناوی نۆخی | تێنەپەڕ | | | | | | تێپەڕ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕاستەوخۆ | ڕابوردوو | | | | ڕانەبوردوو | | ڕانەبوردوو | |
| | نزیک | بەردەوام | تەواو | دوور | نیستا | داهاتوو | نیستا | داهاتوو |
| ئەز | کەتم | دکەتم | کەتمە | کەتبووم | دکەڤم | بکەڤم | دبژێرم | ببژێرم |
| تو | کەتی | دکەتی | کەتییی | کەتبووی | دکەڤی | بکەڤی | دبژێری | ببژێری |
| ئەو | کەت | دکەت | کەتییە | کەتبوو | دکەڤە | بکەڤە | دبژێرە | ببژێرە |
| ئەم → | | | | | | | | |
| هوون | کەتن | دکەتن | کەتنە | کەتبوون | دکەڤن | بکەڤن | دبژێرن | ببژێرن |
| ئەو / ئەوان → | | | | | | | | |

(٢) کرداری تێپەڕی رابوردوو :

| جێناوی بۆخۆی ئەیان | نزیک | بەردەوام | تەواو | دوور |
|---|---|---|---|---|
| من | | | | |
| تە | | | | |
| ئەوێ / وێ | | | | |
| ئەوی / وی | کر | دکر | کرییە | کربوو |
| مە | | | | |
| وە | | | | |
| ئەوان / وان | | | | |

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا لەگەڵ کرداری تێنەپەڕی ڕابوردوو و تێنەپەڕ و تێپەڕی ڕانەبوردوودا دەستەی جێناوە لکاوە بێ هێزەکان : (م ، ی ، . ، ین ، ن ، ن) دێن . لەگەڵ کرداری ڕابوردووی تێپەڕیشدا دەستەی دووەمی جێناوە بەهێزەکان : (م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان) بەکاردێنرێن :

(١) کرداری تێنەپەڕی رابوردوو و تێنەپەڕ و تێپەڕی ڕانەبوردوو :

| جێناوی لکاوی بێ هێز | تێنەپەڕ | | | | | تێپەڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | رابوردوو | | | | ڕانەبوردوو | |
| | نزیک | بەردەوام | تەواو | دوور | | |
| م | مردم | دەمردم | مردووم | مردبووم | دەمرم | دەنووسم |
| ی | مردی (یت) | دەمردی (یت) | مردووی (یت) | مردبووی (یت) | دەمری (یت) | دەنووسی (یت) |
| . | مرد | دەمرد | مردووە | مردبوو | دەمرێ (ێت) | دەنووسێ (ێت) |
| ین | مردین | دەمردین | مردووین | مردبووین | دەمرین | دەنووسین |
| ن | مردن | دەمردن | مردوون | مردبوون | دەمرن | دەنووسن |
| ن | | | | | | |

(٢) کرداری تێپەڕی ڕابوردوو :

| جێناوی لکاوی بەهێز | نزیک | بەردەوام | تەواو | دوور |
|---|---|---|---|---|
| م | ناردم | دەم نارد | ناردوومە | ناردبووم |
| ت | ناردت | دەت نارد | ناردووتە | ناردبووت |
| ی | ناردی | دەی نارد | ناردوویەتی | ناردبووی |
| مان | ناردمان | دەمان نارد | ناردوومانە | ناردبوومان |
| تان | ناردتان | دەتان نارد | ناردووتانە | ناردبووتان |
| یان | ناردیان | دەیان نارد | ناردوویانە | ناردبوویان |

بۆ لێك جیاکردنەوەی کرداری تێپەڕ و تێنەپەڕ ، وێڕای دیاریکردنی تیۆریی زانستانە ، لە زمانی کوردیدا ڕێگایێکی پراکتیکی یەکجار ئاسانیش هەیە ، کە ئەویش بە هۆی جێناوە کەسی یە لکاوەکانەوەیە لە دیالێکتی خوارووداو و جێناوە کەسی یە جوداکانەوەیە لە دیالێکتی ژووروودا :

١- بە هۆی جێناوە لکاوە کەسی یەکانەوە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداو .

ئەگەر کردارێك تێپەڕبوو ، ئەوە جێناوی کەسیی لکاو لە حاڵەتی ڕابوردووی بەردەوامی ئیخباری و ئینشائیدا بە پێشی کردارەکەوە دەلکێن و لە هەموو حاڵەتەکانی دیدا هەر بە کۆتایی یەوە دەنووسێن .

بەڵام لە کرداری تێنەپەڕی ڕابوردووی بەردەوامدا دەبینین جێناو هەر لە کۆتایی یەوە دەمێنێتەوە و وەك کرداری تێپەڕی ڕابوردووی بەردەوام نایەتە پێشەوە . ئەگەر بۆ بەڵگە هەندێ کرداری تێنەپەڕ بکەینە تێپەڕ دەبینین جێناو دێتە پێشەوە ، وەك :

دەنووستین	دەمان نواند

دەچووین	دەمان چواند

دەکەوتین      دەمانخست
دەمردین      دەمانمراند
دەگەڕاین      دەمانگەڕاند
... هتد

دیاری کردنی بە پێشەوە یان بە کۆتایی‌یەوە لکانی جێناوی کەسیی لکاو بە کرداری ڕابووردوی بەردەوامی ئیخباری و ئینشائی‌یەوە ، کێشەیێکی گەورەی زمانی دەرەوێنێتەوە و دەستوورێکی سەرسوڕهێنمان بۆ ئاشکرا دەکا ، کە ئەویش ئەوەیە :

ئەگەر هەر کردارێ لە گەرداندا دەرکەوت کە لە کاتی ڕابوردووی بەردەوامدا جێناوی کەسیی لکاو بە پێشیەوە دەلکێ ، ئەوە ئەو کردارە تێپەڕە . خۆ بێتو لە هەمان ڕێژەدا جێناو بکەوێتە کۆتایی‌یەوە ، ئەوە ئەو کردارە تێنەپەڕە .

ئاسانترین ڕێگە بۆ ئیسپات کردنی ئەو دەستوورە ، ئەوەیە جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاك وەربگرین ، کە بۆ هەردوو کرداری تێپەڕ و تێنەپەڕ هەر (م)ە و لەگەڵ کۆمەڵێك کرداردا تاقی‌بکەینەوە :

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| گلان – | گلاندن – |
| دەگلام | دەمگلاند |
| بگلامایە | بمگلاندایە |
| سووتان – | سووتاندن – |
| دەسووتام | دەمسووتاند |
| بسووتامایە | بمسووتاندایە |

| | |
|---|---|
| نوستن – | نواندن – |
| دەنوستم | دەمنواند |
| بنوستمایە | بمنواندایە |
| خنکان – | خنکاندن – |
| دەخنکام | دەمخنکاند |
| بخنکامایە | بمخنکاندایە |
| ترسان – | ترساندن – |
| دەترسام | دەمترساند |
| بترسامایە | بمترساندایە |
| شکان – | شکاندن – |
| دەشکام | دەمشکاند |
| بشکامایە | بمشکاندایە |
| بەزین – | بەزاندن – |
| دەبەزیم | دەمبەزاند |
| ببەزیمایە | بمبەزاندایە |
| خەوتن – | خەواندن – |
| دەخەوتم | دەمخەواند |
| بخەوتمایە | بمخەواندایە |
| کەوتن – | خستن – |
| دەکەوتم | دەمخست |
| بکەوتمایە | بمخستایە |
| هاتن – | هێنان ، هانین – |
| دەهاتم | دەمهێنا ، دەمهانی |
| بهاتمایە | بمهێنایە ، بمهانییایە |

چوون –

دەچووم

بچووومایە

ڕۆیشتن –

دەڕۆیشتم

بڕۆیشتمایە

گەڕان –

دەگەڕام

بگەڕامایە

گۆڕان –

دەگۆڕام

بگۆڕامایە

چەقین –

دەچەقیم

بچەقیمایە

بردن –

دەمبرد

بمبردایە

ناردن –

دەمنارد

بمناردایە

گێڕان –

دەمگێڕا

بمگێڕایە

گۆڕین –

دەمگۆڕی

بمگۆڕیایە

چەقاندن –

دەمچەقاند

بمچەقاندایە

خواردن –

دەمخوارد

بمخواردایە

خوێندن –

دەمخوێند

بمخوێندایە

... هتد

٢-بـە هـۆی جێنـاوە کەسـی‌یە جوداکانـەوە لـە دیـ الێکتی کرمـانجیی ژووروودا .

هـەر کردارێـك بێتـو لـە دەمـی ڕابـوردوودا جێنـاوە کەسـی‌یە جوداکـانی دەستەی یەکەم : (ئەز ، تو ، ئەو ، ئەم ، هوون ، ئەو / ئەوان) لەگەڵ بێن ، ئەوە ئـەو کـردارە تێنەپـەڕە . بـەڵام ئەگـەر جێنـاوە کەسـی‌یە جوداکـانی دەسـتەی دووەم : (مـن ، تـە ، ئـەوێ / وێ ، ئـەوی / وی ، مـە ، وە ، ئـەوان / وان) بێنـە تەکی ، ئەوە ئەو کردارە تێپەڕە .

باشترین ڕێگە بۆ ئیسپات کردنی ئەو دەستووە ، ئەوەیە جێناوی کەسیی جودای کەسی یەکەم وەربگرین ، کە بۆ کردای تێنەپەڕی ڕابوردوو (ئەز)ە و بۆ کردای تێپەڕیش (من)ە :

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| ئەز - | من - |
| کەتم | کر |
| چووم | گۆت |
| هاتم | ستاند |
| ڕوونشتم | خار |
| گهیشتم | خاند |

## کردار لە ڕووی ڕۆنانەوە

کردار وەك ناو و ئاوەڵناو لە ڕووی ڕۆنانەوە دابەش دەبێ بەسەر (سادە) و (ناسادە)دا ؛ (ناسادە)ش بەسەر (داڕێژراو)و لێکدراودا .

### کرداری سادە

وەك : بوون ، چوون ، دان ، نان ، جوون ، دروون ، سوون ، مان ، کردن ، بردن ، هاتن ...

### کرداری داڕێژاو

لە زمانی کوردیدا کرداری داڕێژراو بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر پێك دێ[٤٨]. بۆ ڕۆنانی کرداری داڕێژراو هەندێ پێشگر و پاشگر هەن ، دەچنە سەر (کرداری سادە)و دەیکەنە کرداری داڕێژراو [٤٩]

ا-پێشگر .

ئەو پێشگرانەی کردلری داڕێژراو سازدەکەن دوو جۆرن :

---

[٤٨] هەرچەندە کرداری داڕێژراو بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر پێك دێ ، بەڵام لەم کارەدا پێشگر ڕۆڵی گرنگترە .

[٤٩] هەرچی ناو و ئاوەڵناوی داڕێژراوە بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر لە (ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار)ی سادە دروست دەکرێن . بەڵام بۆ ڕۆنانی کرداری داڕێژراو پێشگر و پاشگر هەر بە (کردار)ەوە دەلکێن ، جگە لە پاشگری (-اندن) ، کە دەچێتە سەر ناوی دەنگە سروشتیەکان و هەندێ ناوی دیکە و دەیانکاتە چاوگ و کردار .

یەك – پێشگری سادە . وەك :

١- (ڕا-)

بەرانبەر ئەم پێشگرە لە ئێرانیی کۆندا "فراچە" ؛ لە ئاوێستادا "فرەچە" ؛ لە فارسیی کۆندا "فاچا" ؛ لە فارسیی ناوەڕاستدا "فراج"[٥٠] لە فارسیی نوێدا "فرا (ز)" دەوەستێ و لە زمانی پشتۆدا بە هەمان شێوەی کوردی دەبینرێ[٥١].

پێشگری (ڕا-) لە سەرەتادا واتای بزووتنەوەی بەرەو پێشەوەی دەگەیاند و دواتر واتای فراوانتر بوو[٥٢]. ئێستا مانای جۆراوجۆر دەگەیەنێ ، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێن :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| ڕادان | ڕادان |
| ڕاگرتن | ڕاگرتن |
| ڕاخستن | ڕاخستن |
| ڕاکێشان | ڕاکشاندن |

جگە لەو واتا جیاوازانە ، دەبینین ، کە پێشگری (ڕا-) ڕێچکەی بزووتنەوە بەرەو سەرەوەش نیشان دەدا ، وەك : ڕابوون ، ڕاپەڕین .

---

[٥٠] وەك : "فراچ متەن ، فراچ ڕەفتەن ، فراچ ڕەسیتەن ..." (بڕوانە : ڤ . س . ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٨٢ )

[٥١] ن . ئا . دفۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٣٤ .

[٥٢] ڕ . ل . تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٧٤ .

٢-(هەڵ- ) ، لە کرمانجیی ژووروودا ( هل- ) .

ڕیشەی ئەم پێشگرە لە ئێرانیی کۆندا "ردلە" یە ، لە ئاوێستادا "ئردوە ، ئردلە" یە بە واتای (بەرەو سەرەوە) . لە فارسیی ناوەڕاستدا "وول"ە"[٥٣] بە واتای "بۆ سەرەوە" .

پێشگری (هەڵ– / هل-) لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا بە زۆری بۆ بزووتنەوەی بەرەو ژوور بەکاردێت ، بەڵام هەندێ جار مەبەستی تریش دەگەیەنێ .

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی خوارروو |
| --- | --- |
| هلکرن | هەڵکردن |
| هلبوون | هەڵبوون |
| هلچوون | هەڵچوون |
| هلبڕین | هەڵبڕین |
| هلدان | هەڵدان |
| هلهاتن | هەڵهاتن |
| هلگرتن | هەڵگرتن |
| هلفڕین | هەڵفڕین |

... هتد[٥٤] .

[٥٣] وەك : "وول ئامەتن" (هەڵهاتن – بۆ خۆر) (بڕوانە ، ڕاستۆرگوێڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، ل ٨٣) .

[٥٤] مامۆستا قەناتی کوردۆ لەبارەی ئەسڵی پێشگری (هەڵ - / هل -)ەوە نووسیویە : "ئەم پێشگرە پێوەندیی بنەچەیی لەگەڵ وشەی (هێن)دا هەیە ، کە لە ڕەگی (هێل)و پاشگری (-ان)

٣-(دا-) .

ئەم پێشگرە زۆر چالاك و بە بەرهەمە و گەلێك مانا دەبەخشێ و بە زۆری ڕێچکەی بزووتنەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە نیشان دەدات . وەك :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| داکەوتن | داکەتن |
| داگرتن | داگرتن |
| داهاتن | داهاتن |
| داخستن | داخستن |
| ... هتد . | |

٤-(ڕۆ-) ، لە کرمانجیی ژووروودا (ڕوو-)

ئەم پێشگرە بەرانبەر "فرەڤتە"ی[٥٥] ئێرانیی کۆن و ئاوێستا ؛ "پرەڤتا"ی هیندیی کۆن ؛ "فرۆت"ی فارسیی ناوەڕاست[٥٦] ؛ "فوروو"ی فارسیی نوێ دەوەستێ .

---

-

پێکهاتووە . وشەی (هێلان) لە کرمانجیی ژووروودا بە واتای (بەرزایی ، تەپۆلکە ، هەڵسان ... دێت" (دەستووری زمانی کوردی - بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٤٨) .

[٥٥] بە واتای "خوارەوە" .

[٥٦] وەك : "فرۆت ڤشتەن (ڕاچوون) ، فرۆت شولەن (ئاوابوون - بۆ خۆر) ..." (بڕوانە : ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، ل ١٨٣) .

ئەم پێشگرە بە گشتی بزووتنەوە بەرەوخوار ، یاخود ناوەوە نیشان ئەدا . وەك :

کرمانجیی خوارووـ ڕۆکردن ، ڕۆچوون ، ڕۆنان ...

کرمانجیی ژووروو ـ ڕۆنشتن ، ڕوونشتاندن ...

٥-(وەر- ) .[٥٧]

شێوەی ئەم پێشگرە لە زمانی ئێرانیی کۆن و ئاوێستا و فارسیی کۆندا "ویەر"ە . لە فارسیی ناوەڕاستدا "ەپەر ، ەوەر" ؛ لە فارسیی نوێدا "ەبەر ، بەر" .

پێشگری (وەر-) لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وەك یەك ئەبینرێ و مانای پێچکردنەوە و کەڕانەوە و هەڵگێڕانەوە و گۆڕین و گوێزانەوە ... ی تێدایە . وەك :

وەردان ، وەرگێڕان ، وەرگەڕان ، وەرگەڕلندن ، وەرچەرخان ، وەرگرتن ... هتد .

ئەم پێشگرە لە هەندێ بەشە دیالێکتی کوردیدا ، بەتایبەتی لە زمانی کوردەکانی ئەرمەنستان و تورکمەنستان و ئازەربایجاندا لە شێوەی (-وەل)دا ئەبینرێ . وەك "وەلگەڕاندن ، وەلگەڕیان ..."[٥٨].

٦-(ڕێ- ) . وەك :

ڕێخستن ، ڕێخشاندن ...

---

[٥٧] تایبەتیی پێشگری (هەڵ - ، ڕۆ - ، وەر-) لەوەدایە ، کە لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا هاوبێژیان نییە .

[٥٨] ج . خ . باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٢٥٧ .

٧-( پێ- ) .

ئەم پێشگرە بە زۆری نیشانی بزووتنەوەی ڕووداو بەرەو بەرکارێك ڕادەگەیەنێ . وەك :

پێکەنین ، پێگەیشتن ، پێزانین ، پێناسین ، پێکەوتن ، پێکەتن ...

٨-( تێ- )

بزووتنەوەی ڕوودان بەرەو شوێنێکی دیاریکراو نیشاندەدا . وەك :

تێگەیشتن ، تێگرتن ، تێکەوتن (تێکەتن) ، تێکردن (تێکرن) ، تێخستن ...

٩-( لێ- )[٤٩] .

ئەم پێشگرە نیشانی بزووتنەوەی ڕوودان بەرەو کەسێك یان شتێك دەدات . وەك :

لێخوڕین ، لێدان ، لێنان ، لێکەوتن (لێکەتن) ...

١٠-( ژێ- ) .

ئەم پێشگرە تەنیا لە کرمانجیی ژووروودا بەکاردێ . لە کرمانجیی خوارووودا پێشگری (لێ-) بەرانبەری دەوەستێ . وەك :

---

[٤٩] هەرچی پێشگری (پێ ، تێ ، لێ)یە پێوەندییان لەگەڵ (پاشبەند)دا هەیە و لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا زۆر بەکاردێنرێن . بە شێوە لەوە دەچێ ، کە پاشگری (ڕێ)یش هەر وەك ئەوان بێ ، بەڵام ڕاستی لە ئاوەڕۆکدا هێشتا هیچمان بۆ ئاشکرا نەبووە .

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی خواروو |
| --- | --- |
| ژێپرسین | لێپرسین |
| ژێبرین | لێبرین |
| ژێستاندن | لێستاندن[٦٠] |

١١-(وێ - )[٦١]، لە کرمانجیی ژووروودا (ڤێ-)[٦٢] وەك :
وێچوون ، وێکەوتن ...
ڤێکەتن ، ڤێخستن ، ڤێساندن ... [٦٣]

١٢-(ڤە-) .

بەرانبەر ئەم پێشگرە کوردیە لە ئێرانیی کۆن و ئاوێستادا "ەپە" ؛ لە فارسیی ناوەڕاستدا "ەپەچ" ؛ لە فارسیی نوێدا "باز" بەرچاودەکەوێ .
پێشگری (ڤە-) تەنیا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بەکاردێنرێ و لە باری واتا و ئەرکی وشەڕۆنانەوە بەرانبەر پاشگری (-ەوە)ی کرمانجیی

---

[٦٠] ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ ، ل ١٥٣ - ١٥٤ .

[٦١] پێشگری (وێ-) لە شێوەی موکریدا بە گشتی و لە هەندێ شێوەی دیکەی کرمانجیی خوارووودا بەکاردێت .

[٦٢] پێشگری (ڤێ-) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بەکاردێت ... لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا دەبێتە (وێ-) .

[٦٣] مامۆستا کوردۆ لە باسی پێشگری (ڤێ-)دا وتوویە ، "وا پێ دەچێ شێوەی فۆنەتیکیی پێشگری (ڤە-) بێ" (سەرچاوەی ناوبراو ، دەستووری زمانی کوردی ، ل ١٤٩) .

خواروو دەوەستێ . ئەم پێشگرە ڕێچکەی ڕوودان بۆ دواوە ، بۆ لایەنی جیاواز نیشان دەدا و دووبارە بوونەوەی ڕوودان ڕادەگەیەنێ . وەك :

ئەگرتن ، ئەخارن ، ئەکشان ، ئەگەڕین ، ئەکرن ...[٦٤][٦٥]

---

[٦٤] بۆ ساخکردنەوەی ئەسڵ و دەور و واتای ئەم پێشگرانە کەڵکم لە گەلێ سەرچاوە وەرگرتووە و بەتایبەتی :

أ) ف. س. ڕاستورگوێڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

ب) ی. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

ج) ق. کوردۆیێڤ ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

د) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

[٦٥] لیژنەی "زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد" بە شێوەیەکی زانستی و نموونەی جوان و لەبارەوە باسی ئەم پێشگرە سادانەی کردووە و دەوری هەر یەکێکیانی دیاری کردووە . بەڵام لیژنەی ناوبراو پێشگری (ڕۆ- / ڕوو-) و (ڕێ) و (ژێ)ی ، کە ئەمانیش لە پۆنانی کرداری داڕێژراودا دەورێکی گرنگ دەبینن ، لەیاد کردووە و بە هیچ جۆرێك ناوی نەهێناون (بڕوانە ل٢٣٦ - ٢٣٩) . کەریمی ئەیوبی و لی. ئا. سمیرنۆڤا باش لە تێکرای ئەم پێشگرانە دواون (جگە لە "لە" و "لێ" و "ژێ" کە سەر بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروون) . بەڵام کەم و کوڕیی ئەمان و سەرجەمی زانایانی قوتابخانەی سۆڤێت لەوەدایە ، کە پێشگری (ڕێ ، بێ ، تێ ، لێ ، ژێ ... )یان بە ئاسادە دانــاوە و وا ڕادەگەیەنن ، کە لە ئەنجامی یەك کەوتنی (ل ، ب ، د ، ژ)ی کرمانجیی ژووروو و (لە ، بە ، دە ، لە)ی کرمانجیی خواروو لەگەڵ جێناوی (ێ) سازبوون... بەر لە هەر شت ، وەك لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا "جێناو" (ل٥٦ - ٤٧ ، ٥٩...)دا پەنجەم بۆ

... هتد .[66][67]

---

ڕاپێشاوە ، ئەوە دێنمەوە یاد ، ئەوەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە یەکێتی سۆڤێت ماملەی جێناوی لکاویان لەگەڵ (ی)دا کردووە ، شتێکی دوور لە هەلکەوتی زمانی کوردییە .

ئەو پێشگرە سادانەی لە سەرەوە لێیان دواین ، لە نووسینەکانی مامۆستا نووری عەلی ئەمین‌دا باسیان لێوە نەکراوە . تەنیا ئەوە نەبێ ، کە لە لاپەڕە (١٥٦ – ١٥٧)ی کتێبی "ڕێزمانی کوردی"دا ، (هەڵ ، دا ، ڕا ، ڕۆ...) بە ئاوەڵکردار دانراوە و (پێ ، تێ ، لێ)یش بە پێتی پەیوەندی لە قەڵەم دراوە . ڕاستە (پێش ، سەر ، لا ، بەر...) وەك ئاوەڵکردار و جارجارەیەکیش وەك پێشگر خۆیان دەنوێنن ، بەڵام (هەڵ ، دا ، ڕا ، ڕۆ...) هەر پێشگرن و هیچ دەمێك نابنە ئاوەڵکردار . هەرچی (پێ ، تێ ، لێ...)یشە پێوەندییان بە پاشبەندەوە هەیە ، بەڵام بەر لە هەرشت پێشگرن ... سەرەڕای ئەو کەم و کوڕتییە ، نووسەر لە کتێبی "کورتیی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی"دا (ل٥٢ – ٥٦) هەمدیسان نیشانەی ، وەك (لە – دە)ی مۆزارەعەت و (بـ)ی فەرمانی بە پێشگر داناوە .

[66] مامۆستایان : ق . کوردۆ و ر . ل . تابۆلۆف ، وێڕای ئەو پێشگرە سادانەی لێیان دواین ، هەروەها دەستەیەك پێشگری دییان باس کردووە ، کە کەم بەرهەمن و لەگەڵ کرداردا پێکەیشتوون و تێکەڵ بە ڕەگی بوون و تەنانەت لە گەردان کردنیشدا لێی جیانابنەوە . ئەو جۆرە پێشگرانەش تەنیا لە ڕێی لێکۆڵینەوەی مێژوویییەوە دەتوانرێ دیاری بکرێن . وەك ئەمانەی خوارەوە :

(ا-) . وەك :

ئانین ، ئاژۆتن ، ئاڤێتن / ئاوێشتن ، ئالاستن / لێستن ...

ئەم پێشگرەی کردار ، کە لە هەردوو دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووودا وەك یەکە ، لەو ناوانەشدا دەبینرێ ، کە لە کردارەوە وەرگیراون . وەك :

ئاڤا / ئاوا / (بە فارسیی نوێ "ئاباد" ؛ بە فارسیی ناوەڕاست "ئاپاك" ) .

ئەم پێشگری (ا-)یە لە زمانی ئێرانیی کۆن و ئاوێستا و فارسیی کۆن و فارسیی ناوەڕاست و فارسیی نوێدا هەمان شێوەی کوردی هەیە . بۆ نموونە لە فارسیی ناوەڕاستدا "ئامەتەن" (هاتن) .

( بـ - bi ) .

ئەم پێشگرە لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا لە یەك شێوەدا دەبینرێ . وەك :

بستن / بیستن .

شێوەی ئەم پێشگرە لە ئێرانیی کۆندا (ڤ) ؛ لە ئاوێستا و فارسیی کۆن و فارسیی ناوەڕاستدا (ڤی)یە .

نموونە لە فارسیی ناوەڕاستەوە :

"ڤیریختەن" (ڕاکردن) ؛ "ڤیترەتەن ، ڤیتەشتەن (تێپەڕین) ؛ "ڤیچیتەن" (هەڵبژاردن) .

( هن - / ەن- ) .

ئەم پێشگرە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (هن -)دا دەردەکەوێ و لە کرمانجیی خواروویشدا لە قاڵبی (ەن-)دا بەرچاودەکەوێ . وەك :

هنگافتن - ئەنگاوتن

هن جرین - (ئەن)جنین

ئەم پێشگرە لە ئێرانیی کۆندا "هەم" ؛ لە ئاوێستادا "هەم ، هە ، هەن ، هن" ؛ لە فارسیی ناوەڕاستدا "هەن ، ەن" ؛ لە فارسیی نوێدا (هەن ، ەن)ە .

بەوێنە لە فارسیی ناوەڕاستدا دەوترێ "هەن داختەن" (فرێدان)

( ن - ni ) . وەك :

نهارین ، نێرین / نوارین ، نۆڕین

نڤین ، نڤشتن / نوستن (لە ئێرانیی کۆندا "نهد")

-

وتەی ئەم پێشگرە لە ئێرانیی کۆن و فارسیی ناوەڕاست و فارسیی نوێدا هەر (ن - ni)ە و لە ئاوێستا و فارسیی کۆنیشدا (نی)یە .

لە فارسیی ناوەڕاستدا ، وەك :

"نپشتن" (نووسین) ؛ "نشاستەن" (نیشتن) ؛ "نهادەن" (دانان) .

(گ - / گو- ) . وەك :

گەیین - گەیشتن

گوشین - گوشاشتن

گواستن - گوهارتن

ئەم پێشگرە لە ئێرانیی کۆندا (ڤ)ە ؛ لە ئاوێستا و فارسیی کۆندا (ڤی) ؛ لە فارسیی ناوەڕاست و فارسیی نوێدا (گو)ە .

بۆ نموونە لە فارسیی ناوەڕاستدا "گومێختان" (خستنە پێکەوەنین) .

(تە- )

ئەم پێشگرە تەنیا لە چەند وشەیەکی دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بەدی دەکرێ ، کە ئەسڵیان ئاشکرا نییە . وەك :

تەمرین (کوژانەوە)

تەمراندن (کوژاندنەوە)

ئەم پێشگرە رەنگە پێوەندی بە پێشگری "تەر"ی فارسیی ناوەڕاستەوە هەبێ .

(وە- ) .

ئەم پێشگرە ئەسڵی ئاشکرا نییە و لە هەردوو دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووودا وەك یەکە .. بەوێنە :

وەستان ، وەشان - وەشاندن ...

-

-

(ی - ) .

ئەم پێشگرە لەنیا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و لە کرداری "ئیخستن"دا بەدی دەکرێ .

... هتد .

(بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی - بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٤٥ - ١٤٦ ؛ لەبارەی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٧١ - ٧٢) .

(٦٧) لە زمانی کوردیدا هەندێ وشە هەن ، وەك : (دەر ، بەر ، سەر ، لا ، پێش ، پاش ، دوا ، ژێر ، خوار ، بن ... ) لە پێش کردارەوە دێن و واتای تازە پێك دێنن ... جا زۆربەی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ئەمانە بە پێشگر دادەنێن و بەشێکی کەمیش بە وشەی واتاداریان لە قەڵەم دەدەن .

بەوێنە کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا بە پێشگریان دادەنێن و دەڵێن : "ئەو پێشگرانە ئەوانەن کە لە شێوەی ناو و ئاوەڵکرداردا هاوڕیز (مشترك لفظي - Homonym)یان هەیە " (بڕوانە : دیالێکتی کوردی موکری ، ل ١٠٨) . ق. کوردۆ نووسیویە : "پێشگری (بەر ، سەر ، دەر ، پێش ، پاش ، پەی ، دوو / دوا ، ناڤ / ناو / نێو ، بن ، ژێر) لە ڕووی بەکارهێنانەوە وشەی ئەرك گێڕن . هەروەها وەك پێشبەند و پاشبەند و ئاوەڵکرداریش بەکاردێنرێن . کاتێ وەك پێشگری کردار خۆیان دەنوێنن ، ڕێچکەی ڕوودان دیاری‌دەکەن و لە گەلێ حاڵەتدا واتای کردار دەگۆڕن" (بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی - بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ، ل ١٤٩) . و. ق. تساپۆلوف ولوویە : "گرووپی ... (دەر ، بەر ...... سەر ) دەکرێ وەك پێشگر تەماشا بکرێن" بڕوانە : لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، ل ٧٧) ... مامۆستا نووری عەلی ئەمین وەك پێشگر ناوی نەبردوون و وەك ئاوەڵکردار ئیان دواوە (بڕوانە : ڕێزمانی کوردی ، ل ١٥٧) . لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، هەرچەندە لەو کێشەیە دواوە ، بەڵام ڕای خۆی نەداوە (بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ٢٥٥ - ٢٥٦)...

بە باوەڕی من ، ئەمانە بەر لە هەر شت وشەی واتادارن :

-

▪

گومان لەوە ناکرێ کە (دەر) وشەیێکی چالاکی سەربەخۆیە . ئەم وشەیە بە هیچ جۆرێک و لە هیچ شوێنێکدا نەبووەتە پێشگر و دەوری پێشگر نابینێ . هەموو ئەو وشانەی (دەر) بە پێشیانەوە دەلکێ : (دەربردن ، دەربڕین ، دەربوون ، دەربەڕاندن ، دەربەڕین ، دەرچوون ، دەرخستن ، دەردان ، دەرکردن ، دەرکەوتن ، دەرکێشان ، دەرهاتن ... دەرلنگ ، دەربەست ، دەربەند ، دەربەدەر... ) وشەی لێکدراوین ، نەک داڕێژراو . لە لێکراوی ئەم نموونانەدا ، کە (دەر)یان تێدایە ، (دەر) هەر ئەو واتایە دەبەخشێ کە سەربەخۆ بەکاربهێنرێ ... ئەگەر لە ڕووی خۆنواندنیشەوە کەمێک وردبینەوە ، ئەوە یەکجاری گومان نامێنێ ، کە (دەر) پێشگر نییە . بۆ نموونە ئەگەر پاشگری (-گە / -گا ، -ك lk ، -ەکی ، -وو ، -ە...) لە دوای (دەر)ەوە دابنێین ، ئەوە وشەی (دەرگە / دەرگا ، دەرك ، دەرەکی ، دەروو ، دەرە ...) پەیدا دەبێ . خۆ گومان لەوەدا نییە ، کە (-گە / - گا ، -ك lk ، -ەکی ، -وو ، -ە... ) پاشگرن . جا ئەگەر (دەر) پێشگر بێ ، ئەوە دەبێ بڵێین وشەکانی (دەرگە / دەرگا ، دەرك ، دەرەکی ، دەروو ، دەرە... ) لە (پێشگر + پاشگر) دروست بوون ، کە وەك ئاشکرایە ئەو جۆرە پێکهاتنە لە زمانی کوردیدا نییە . یاخود بێتو لە وشەی (کوناودەر) بڕوانین ، ئەوە بە پێی ئەو ڕا هەڵەیە بێ ، دەبێ لێرەدا پاشگر بێ و لە وشەی (سەردەرکردن)یشدا ناوگر بێ ... جا (دەر) چی دەرچوو ! سەرەڕای ئەوە دەیان وشە و دەستەواژەی کوردی هەن ، کە (دەر) هاوبەشیی تێیاندا کردووە و لە هەر شوێنێکدا بە جۆرێ دەبینرێ ، وەك : (دەربەدەر ، دەرودوو ، دەروەراوسێن ، دەشت و دەر ، سەرودەر ، سەربەدەر ، چاولەدەرەوە ، بەردەرگانە ، شاربەدەر ، سەردەرچوون ، سەردەرکردن ، سەردەرکەر ، دەرلنگ ، دەربەند ، دەربەست ، دەرگەوان ... ) .

ڕاست و دروست ئەوەیە ، کە (دەر) وشەیە و پاشگر نییە . بەپێی ئەو بۆچوونەی تەنیا ئاوڕ لە لایەنی ڕوخسار دەداتەوە ، دەبێ سەدان وشەی وەك (کا ، ددان ، کر ، کار ، ماچ ، کپ ، بار ، مل ، فڕ ، ڕیش ، ناو ...) لە وشەی وەك (کاکێشان ، ددانکێشان ، کربوون ، کارکردن ، ماچ کردن ، کپبوون ، بارکردن ، ملدان ، ڕیشهاتن ، ناولنگ ...)یشدا پێشگر بن ، بەڵام ئەمانیش پێشگر نین و پێشگر شتێکی دیکەیە .

▪

## دوو- پێشگری ناساده

پێشگری ناسادەش دوو جۆرە :

ا) ئەوانەی لە ئەنجامی تێکەڵبوونی پێشگری سادەی (پـێ ، لێ ، تـێ ، ژێ) لەگەڵ پاشبەندی (دا ، ڕا ، وە) دروست بوون . وەك :

١-( پێدا- ) .

ئـەم پێشـگرە لـە کرمـانجیی خـواروو و ژووروودا وەك یـەك دەبیـنرێ و ڕێچکەی بزووتنـەوە بەسـەر ڕووی شتێکدا یا بۆ نـاو شـتێك ، یـاخود بـە نـاو شتێکدا نیشان دەدا . وەك :

---

*

یا لەو لیستەیەی خوارەوەدا بەرانبەر یەکیان دادەنێین و خوێنەر دەکەینە حەکـەم ، تـا بزانـێ هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا هەیە ؛

| | |
|---|---|
| دەرکێشان | دەلن‌کێشان ، کاکێشان |
| دەربوون | کربوون ، سەوزبوون ، کەپبوون |
| دەرکردن | کارکردن ، بارکردن ، ماچ‌کردن |
| دەردان | مل‌دان ، نان‌دان |
| دەرهاتن | ڕیش‌هاتن |
| دەرلنگ | ناولنگ |

بۆ زێدە ڕوونکردنەوە ئەوەش دەڵێم ، ئەگەر تەنیا تەماشـای ڕواڵـەت بکـەین ، ئـەوە شـتی ئـەوتۆ دەڵێین ، کـە زانسـتی زمـان لێمـان بێتـە دەنگ . بۆ نموونـە بـەپێی ڕواڵـەت ، دەبـێ وشـەی (بەردەرکانە) لە دوو پێشـگری (بـەر-) ، (دەر-) و دوو پاشـگری (-کـا) ، (-انـە) پێکـهاتبێ . وشەی (دەرگەوان) لە پێشگری (دەر-) و دوو پاشگری (-گە) ، (-وان) سازبووبێ . ئەمە دەربارەی (دەر) . هەرچی ئەوانی دیشە ؛ (سـەر ، لا ، پێش ، پاش ، دوا ، ژێـر ، خـوار ، بن ...) بە هەمان شێوە وشەی واتاداری سەربەخۆن و پاشگر نین .

پێدابردن ، پێداچوون ، پێداهاتن ، پێداڕشتن / پێداڕێتن ...

٢-( پێوه- ) ، له کرمانجیی ژووروودا ( پێڤا- )

ڕووی بزووتنەوە بەرەو بەرکار نیشان ئەدا . وەك :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| پێوەگرێدان | پێڤاگرێدان |
| پێوەدروون | پێڤادرووتن |
| پێوەنالاندن | پێڤانالاندن |
| ... هتد . | |

٣-( تێدا- ) .

ئەم پێشگرە ڕوودانی ناوەوەی شتێك ڕادەگەیەنێ . وەك :

تێدابوون ، تێداچوون ، تێدامان ، تێداکردن / تێداکرن ...

٤-( تێوه- ) ، له کرمانجیی ژووروودا ( تێڤا- )

تێوەگلان ، تێوەچوون ...

تێڤاکرن ، تێڤازەلقاندن ، تێڤاگوڤاشتن ...

٥-( پێرا- ) . وەك :

پێراگەیشتن ، پێراچوون ، پێراهاتن ، پێراگەهاندن ...

٦-(تێڕا-) . وەك :

تێڕاکردن / تێڕاکرن ، تێڕاچوون ، تێڕابردن ...

٧-(لێڕا) .[٦٨] وەك

لێڕاهاتن ، لێڕابردن

ب) پێشگری ناسادەی (پێك - ، تێك - ، لێك - ، وژك - ، ڕێك -) کە لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی پێشبەندی (دە ، بە ، لە ، وە ، ڕە) لەگەڵ ژمارەی (یێك ، یەك) پەیدابوون . بەرانبەر ئەم پێشگرانە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا پێشگری (پەڤ ، تەڤ ، ژەڤ ، لەڤ) هەیە : کە لە پێشبەندی (ل ، ب ، د ، ژ) و جێناوی هاوبەشیی (هەڤ) پێکهاتوون :

١-( پێك- ) ، لە کرمانجیی ژووروودا ( پەڤ ) . وەك

(پێك-) - بە + یەك

(پەڤ) - ب + هەڤ

پێکهێنان ، پێکهاتن ...

پەڤکرێندان ، پەڤکەتن ، پەڤدرووتن ...

٢-( تێك- ) ، لە کرمانجیی ژووروودا ( تەڤ ) .

(تێك-) - دە + یەك

(تەڤ-) - د + هەڤ

(٦٨) پێشگری (لێڕا-) و (لێڕا) ئەگەرچی کەم کەمێن لە زۆربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێن ، بەڵام بەگشتی سەر بە بەشە دیالێکتی موکرین .

تێکچوون ، تێکشکان ...

تەڤدان ، تەڤچوون ...

٣-(لێک- ) ، لە کرمانجیی ژووروودا (ژهڤ- ) .

(لێک-) = لە + یەک

(ژهڤ-) = ژ + هەڤ

لێکدان ، لێکبوون ...

ژهڤکەتن ، ژهڤئاڵین

٤-(وێک- ) ، لە کرمانجیی ژووروودا (لهڤ- ) .

(وێک-) = بە (وە) + یەک

(لهڤ-) = ل + هەڤ

وێک کەوتن ، وێکخستن...

لهڤدان ، لهڤئانین...

٥-(ڕێک- ) .

(ڕێک-) = ڕە + یەک

ڕێکبوون ، ڕێکخستن ...

... هتد .[٦٩]

---

(٦٩) گەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لەو ڕایەدان کە وا ئەو پێشگرانە لە ئـەنجامی بوونـە پێشگرەهەندی ئەمرازەوە پەیدابوون (سەرچاوەی نـاوبراو ، ل١١٤) . د. قـەناتی کـوردۆ دەڵـێ ، "پێشگرە پێتا – (سۆرانی ، پێـوە -) ، پێدا - ، تێـرا – لـە ئـەنجامی یێکـەڵ بوونـی پێشـگری ئاسادە(پێ ، لێ ) و پاشـەندی (ڕا ، دا ، ڤە) مەوە سـازبوون (سـەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٥٧) .

ڕ.ل تـایوژلۆل شێوەی پێکهاتنی ئەو پێشگرانەی بەم جۆرەی خوارەوە لێک داوەتەوە ،

هەر یەك لەو پێشگرانەی دەچنە سەر چاوگێکی سادە ، دیمەن و واتایان دەگۆڕن ، واتە : ١- لە ڕووی پێکهاتنەوە دەبنە داڕێـژراو ؛ ٢- لە ڕووی ماناشەوە گۆڕانێك دێتە گۆڕێ . بەرێنە "دان" بە مانای (بەخشینی شتێك بە کەسێك) دێت ، هەرچی "دادان"ە مانای : (١-تیژکردنی سەری دار و قەڵەم ؛ ٢- چوونە خوارەوە و لێچوونی شتی شل "گۆزەکە ئاو دادەدا" ؛ ٣- فێرکردن "دەرس دادان"... ) دەگەیەنێت ... وشەی "کـردن" مانای (بەجێ هێنانی کارێك)ە ، کەچی "هەڵ کردن" مانای (بەرزکردنەوەی ئاڵا یا داگیرساندنی چرا... ) دەبەخشێت . یاخود وشەی "گەڕان" واتای (هاتوچۆکردن) دەدات ، بەڵام کە پێشگری (لێ)ی پێـوە دەلکێ "لێ گەڕان" پەیدا دەبێ و مانای (وازهێنان) دێتە کایەوە ... هتد .

ب )پاشگر .

لە زمانی کوردیدا دوو پاشگر هەن ، کرداری داڕێژراو دروست دەکەن :

---

-

(پێدا-) = بە + هی + دا

(پێوە - / پێڤا-) = بە / بـ + هی + موە / ڤا

(لێدا-) = دە / د + هی + دا

(لێوە- / لێڤا -) = دە / د + هی + موە / ڤا

(پێرا-) = بە / بـ + هی + ڕا

(لێرا-) = دە / د + هی + ڕا

(سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٨٠)

١-( -ەوە ).[٢٠]

(٢) دەربارەی ئەم پێشگر و پاشگرە د. نەسرین فەخری لەژێر ناوی "پاشگر و پێشگری : (فە - یان - وە) لە زمانی کوردیدا"دا (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب١ ، ز ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٢٤ - ٢٧٣) وتارێکی بڵاوکردووەتەوە و تێیدا بە درێژی و بەڵگەوە لە واتا و دەور و پێکهاتن و ... ی دواوە و گەلێک ڕووی ئەو کێشەیەی ڕوون کردووەتەوە ... دوا بە دوای ئەم وتارە مامۆستا شێخ محەمەد خاڵیش بە ناوی "پێشگر و پاشگر"ەوە (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب ٢ ، ز ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٥٦ - ٢٧٩)و هەمید ئەحمەد حەمەنیش لە بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی هەمان گۆڤاردا (ل ٣١٩ - ٣٥٨) هەر لە ژێر ناوی "پێشگر و پاشگر"دا لەو باسەی کۆڵیوەتەوە . مامۆستایانی ناوبراویش لەو ڕووەوە هەندێ ڕای جوان و لەباریان دەربڕیوە . ساڵی ١٩٨١ یش مامۆستا ڕەئووف ئەحمەد ئالانی بە سەرناوی "کێشەیەک لە ڕێزمانی کوردیدا"دا کتێبێکی گەورەی پڕ بەڵگە و کەرەستەی ڕەسەنی بڵاوکردەوە و تێیدا زۆربەی زۆری لەم و مەزی پاشگری (-ەوە)ی ڕەواندووەتەوە ... جگە لەو چوار مامۆستایە ، هەروەها زۆرتر مامۆستایان : نووری عەلی ئەمین ، فەتالی کوردۆ ، مەکەنزی ... ش لەو باسە دواون .

ئەوەی لەم بارەیەوە پێویستە پەنجەی بۆ ڕابکێشین ، ئەوەیە کەوا زۆربەی زۆری نووسەران بە (-ەوە)و (-وە)یان داناوە ... هەرچی د. نەسرین فەخرییە لەو ڕایەدایە کە ئەم پاشگرە تەنیا شێوەی (-وە)ی هەیە . بەڵگەشی ئەوەیە ، کە لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا کاتێک دەبێتە پێشگر (فە-) بەکاردێت . بزوێنی (ە)ش بە پێتێکی پەیوەندی دادەنێ کە گوایا یارمەتیی لکاندنی پاشگری (-وە) بە پێی کۆنسۆنانتی پێش خۆیەوە دەدات .

بەڕای من ئەو تەنیا بەڵگەیەی د. نەسرین فەخری زۆر کەمە بۆ ئەوەی ئەو پاشگرە بە (-وە) دابنرێ . جگە لەوەش سەرنجی ڕاستی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، کە دەڵێ : "هیچ مانعێک نییە لەوەدا بگوترێت پاشگرەکە تێکڕای (ەوە)یە چونکە لە هەموو ئەو میسالانەدا کە کار دێنەوە ئەم بزوێنەی پێشەوە (ە) دەدیترێت ، تەنانەت واش دەبێت کە پیتە بزوێن دەبێتە کۆتایی کار ، پیتێکی کۆنسۆنانت دێت و ئەم بزوێنە دەپارێزێت ، وەک (هاتووەتەوە - کە لێرەدا - ت - هات و

ئاشکرایە کە (-ەوە) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووردا پاشگرە ، بەڵام پێویستە سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشین ، کە ئەم (-ەوە)یە لە کرمانجیی ژووروودا خۆی وەك پێشگر دەنوێنێ . لەبەر ئەوە دەتوانین (-ەوە) نەك تەنیا بە پاشگر ، بەڵکو لە هەمان کاتدا بە پێشگریش دابنێین . وەك :

خواردن - خواردنەوە - ڤەخارن

گەڕان - گەڕانەوە - ڤەگەڕان

پاشگری (-ەوە) لە بەشە دیالێکتی جافی و هەورامانیدا لە شێوەی (-ۆ)دا خۆی دەنوێنێ . وەك :

---

-

بزوێنەکەی پاراست" . "لە گەلێك شێوە ئاخاوتندا دەگوترێ (گەڕایەوە ، کوژایەوە ... ) کە لەو شوێنانەدا پیتێکی (ی) پەیوەندی وەك (نون الوقایە) دێت و بزوێنەکەی سەرەتای (ەوە) دەپارێزێت" ... " بێ گومان لەو شێوانەدا ، کە دەبێتە پێشگر لیمکان نیە بزوێنەکەی پێشەوە (ە) خۆ بەدەربخات ، کە ئەمە بەدیهیەکە و گوتانەوەی لزووم نیە" (بڕوانە ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٣٧٣ - ٣٧٤) ، ئەوە ئەو بۆچوونەی د. نەسرین فەخری هەڵدەوەشێنێتەوە و ڕایەکی ڕاست و زانستی دێنێتە کایەوە .

سەرەڕای هەموو ئەو بەڵگانە ، پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین کە لە زمانی کوردیدا وشە هەن لە پێکهاتنیاندا (و)ی کۆنسۆنانت بەڕەوانی لە دوای دەنگی کۆنسۆنانتەوە هاتووە و پێویستی بە بزوێنی (ە)ی پەیوەندی نەکردووە پێکیانەوە بلکێنێ ، وەك لە (سروە)دا .

جا ئەمانە ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو پاشگرە دەبێ (-ەوە) بێ ، نەك (-وە)و ، بەو پێیە بزوێنی (ە) دەبێ ڕەسەن بێ ، نەك بۆ پێوەندی هاتبێتە ناوەوە... ئەگەر ئەمانەش هێشتا لەواو تێهانی ئەو ڕاستییە نەکەن ، ئەوە مامۆستا ئالانی لە بەرهەمی ناوبراویدا هەموو گومانێکی ڕەواندووەتەوە و دیاری کردووە ، کە فۆرمی ئەو پاشگرە (-ەوە)یە .

جافی – ناچێتۆ ، نابێتۆ

هەورامانی – سووتەیۆ ، کوشتەیۆ[٧١]

لە دەستە شێوەی ئەردەڵانیدا لە قاڵبی (–مو)دا دەردەکەوێ . وەك :

هاتەمو ، کردمو[٧٢]

لە لوڕیدا لە قاڵبی (–را)دا و لە شێوەی پێشگردا خۆی دەنوێنێ . وەك :

راچوگە (کولانەوە)

راکردە (کردنەوە)[٧٣]

" ئەم (وە)یەی کوردی لە هێندێ لە شێوە ئێرانێکاندا بەکاردەبرێ . بۆ وێنە لە گیلەکیدا – کە شێوەیەکە هێشتا بە تەواوی ساخ نەبووەتەوە کە سەر بە چ کۆمەڵە زمانێکی ئێرانییە – وشەی ڤەکن Vekon بۆبکەوە – بکەرەوە بەکاردەبرێ " [٧٤].

... هتد . [٧٥] ، [٧٦] ،

---

[٧١] بڕوانە ؛ ڕەئووف ئەحمەد ئالانی ، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٦٣ ، ١٦٩ – ١٧٢ .

[٧٢] هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٣ – ١٥٨ .

[٧٣] هەمان سەرچاوە ، ل ١٨٣ – ١٨٤ .

[٧٤] د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٣٩ .

[٧٥] دەربارەی بەکارهێنانی پاشگری (–ەوە) وەك پێشگر ، بڕوانە باسی ؛ پێشگری (ڤە–) ، ل ٧٤-٧٥ .

[٧٦] لە هەندێ حاڵەتدا هاوێژی (ەوە / وە) دەبینرێ ، کە مەبەستی ئەم باسەی ئێمە نییە . بەوێنە ؛

... (٧٧)

ئەم پاشگرە دەورێکی گەورە و گرنگ دەبینێ و گەلێک واتا دەگەیەنێ و دەیان وشەی نوێ پێک دێنێ . واتا سەرەکییەکانی ( دووبارەبوونەوە : گۆڕینی واتای وشە : گەڕانەوە : گۆڕینی مەفهوومی وشە ...)ن .

ا- دووبارەبوونەوە . وەک :

هەڵستان - هەڵستانەوە

نووستن - نووستنەوە [٧٨]

ب- گۆڕینی واتای وشە . وەک :

بەربوون - بەربوونەوە [٧٩]

لێکدان - لێکدانەوە [٨٠]

ج- گەڕانەوە . وەک :

---

ا- وەک پاشبەند ، لە هەولێرەوە ، بۆ ماڵەوە ...

ب- وەک نیشانەی کاتی ڕابوردووی تەواو : مردووە ، ڕۆیشتووە ...

... هتد .

(٧٧) پاشگری (-وە) ئاوناوە لەگەڵ هەندێ بەشە ئاخاوتنی دیکەشدا دێ (بۆ وەرگرتنی زانیاری لەو بارەوە ، بڕوانە ، ڕەئووف ئەحمەد ئالانی ، کێشەیەک لە ڕێزمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٨١ - ٨٢ .

(٧٨) وشەکانی "هەڵستانەوە" و "نوستنەوە" واتای دووبارەبوونەوەی هەمان کار دەگەیەنن .

(٧٩) وشەی "بەربوون" بە مانای (بەرەڵابوون) دێت ، بەڵام کە پاشگری (-وە) دەچێتە سەری واتاکەی دەگۆڕێ و مانای (کەوتنەخوارەوە) دەدات .

(٨٠) وشەی "لێکدان" واتای (١- لەیەکتری دانی دوو شت ، ٢- تێکەڵ کردنی دوو شت بەیەکا ...) دەبەخشێت ، کەچی کاتێک پاشگری (-وە)ی پێوە دەلکێ ماناکەی دەگۆڕێ و واتای (بیرکردنەوە) دەدات .

ڕۆیشتن – ڕۆیشتنەوە

چوون – چوونەوە[81]

د-گۆڕینی مەفهوومی وشە . وەك :

کردن – کردنەوە

خواردن – خواردنەوە

... هتد .

٢- ( -اندن )[82].

دەوری هەرە سەرەکیی ئەم پاشگرە ئەوەیە ، کە کرداری تێنەپەڕ (الفعل اللازم – Intransitive) دەگۆڕێ بۆ تێپەڕ (الفعل المتعدی – Transitive) – واتە کاتێك پاشگری (–اندن) دەچێتە سەر چاوگی تێنەپەڕ ، ئەوە دەیکاتە تێپەڕ[83] . وەك :

سووتان + اندن = سووتاندن

نوستن + اندن = نواندن

---

[81] کاتێ پاشگری (–ەوە) دەچێتە سەر "ڕۆیشتن" و "چوون" ، دەبنە "ڕۆیشتنەوە" و "چوونەوە" و مانای گەڕانەوە بۆ هەمان شوێن بەدی دەکرێ .

[82] د. نەسرین فەخری باشی بۆ ئەوە چووە ، کە ئەم پاشگرە (–اندن)ە ، نەك (–اند) یان (–ەن) . ڕاسترین بەڵگەشی ئەوەیە ، کە لە ناوی کــردارا (نالـە – نالاندن...)دا بە ڕەوانی دەردەکەوێ (بڕوانە ، د. نەسرین فەخری ، پاشگری (اندن) لە زمانی کوردیدا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب ٣ ، ز ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ – ٢٤٢ ) .

[83] لەبەر ئەوەی دەوری سەرەکیی ( -اندن) ئەوەیە ، کە کرداری تێنەپەڕ دەگۆڕێ بۆ تێپەڕ ، بۆیە بیر لەوە دەکەینەوە ، بزانین (–اندن)– (پێشگر)ە یا (نیشانە)یە... بێگومان ئەگەر دەوری ڕۆنان نەبینێ و لەتیا مانای ڕێزمانی ببەخشێ ، ئەوە دەبێ (نیشانە) بێت ... بەلام ئەم باسە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تەواو و زانستی هە...

مردن + اندن = مراندن

چوون + اندن = چواندن

درین + اندن = دراندن

... هتد .

جگە لەوە پاشگری (-اندن) کرداری تێنەپەڕ لە دەنگە سروشتییەکان دروست دەکا ، وەك : (میاو + اندن = میاواندن ؛ بۆرە + اندن = بۆڕاندن...) . هەروەها هەندێ ناوی دیکە دەکاتە چاوگ و کرداری تێپەڕ ، وەك : (ڕەنج + اندن = ڕەنجاندن ؛ نرخ + اندن = نرخاندن ...) [٨٤] .

دوو پاشگری (-ەوە) و (-اندن) خاوەنی هەندێ تایبەتێتی ئەوتۆن ، کە تۆژەر بخەنە گومانی بە پاشگر دانانیانەوە :

أ- " ئەم زیادییە (اندن - ئەورەحمان) ع پێی بگوترێت (پاشگر) ع پێی بگوترێت (اداة - امران) ، وەیا زیادیی تصریفی چەند دەورێك لە کاری کوردیدا دەبینێت سروشتێکی تایبەتیشی هەیە کە جودای دەکاتەوە لە پاشگری تر ئەویش ئەمەیە کە وا تێکەڵ بە تکوینی کار دەبێت ، وە لە تصریفدا (لەماضییەوە بۆ مضارع) شکڵی دەگۆڕێت" [٨٥]. بەوێنە :

-اندن > اند - خەواندی

نواندی

برژاندی

-اندن > دن - برژلندن

---

[٨٤] بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو دەربارەی پاشگری (-اندن) ، بڕوانە : د. نەسرین فەخری ، پاشگری (-اندن) لە زمانی کوردیدا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ - ٢٤٢ .

[٨٥] رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ٢٤٣ .

سووتاندن

شکاندن

- اندن > ێن – دەبرژێنێ

دەسووتێنێ

دەشکێنێ

... هتد .

٢- ئەو کردارانەی پاشگری (-ەوە) یان (-اندن) یان پێوەیە لەحاڵەتی جێناو لە کۆتاییەوە هاتنیاندا جیاوازیێک هەیە ، ئەویش ئەوەیە :

أ) ئەگەر کردارەکە پاشگری (-ەوە)ی پێوە بێ ، ئەوە جێناوەکە دەکەوێتە پێش پاشگرەکەوە . وەك :

| ڕەگ ، قەد | جێناو | پاشگر | کردار |
| --- | --- | --- | --- |
| نووس | م | ەوە | دەنووسمەوە |
| ڕۆ | ن | ەوە | دەڕۆنەوە |
| چ | ین | ەوە | دەچینەوە |
| ... | | | |
| نارد | مان | ەوە | ناردمانەوە |
| چوو | یت | ەوە | چوویتەوە |
| کرد | یان | ەوە | کردیانەوە (٨٦) |

(٨٦) ئەمەش تەنیا لە حاڵەتێکدا دەبێ ، کە کردارەکە کەردان کرابێ ، دەنا ئەگەر چاوگ بێ ، ئەوە جێناوەکە دەکەوێتە دوای پاشگرەکەوە . وەك : نووسینەوەم ، ڕۆشتنەوەیان ، چوونەوەمان ، ناردنەوەمان ، کردنەوەمان ...

ب) بێتو کردارەکە پاشگری (-اندن)ی لەگەڵ بێ ، ئەو ئەمە جێناوەکە لـە دوای پاشـگرەکەوە دێـت . ئـەم حاڵەتـەش لەگـەڵ سـەرجەمی نـاو و ئاوەڵناو...ی داڕێژراودا یەك دەگرێتەوە . وەك :

| جێناو | پاشگر | وشە |
|---|---|---|
| م | اندن | سووتاندم |
| مان | اندن | سووتاندمان |
| یان | اندن | برژاندیان |
| | | ... |
| م | گەر | ئاسنگەرم |
| مان | ستان | دارستانمان |
| | | ... |
| یت | ن | ورگنیت |
| م | ی | هەولێریم |
| | | ... |

نەك هەر ئەو حاڵەتەی ، کە یەك جێناوی لکاو بە دەوری کارا لەگەڵ ئەو کردارانەی سەرەوەدا هاتووە ، بـەڵکو تەنانـەت ئەگـەر دوو جێنـاوی لکـاویش وەربگرن ، کە یەکێکیان ببێتە نیشانەی کارا و ئەوی دیەیان نیشـانەی بـەرکار ، هەر بە هەمان چەشن دەبینرێن - واتە :

١-دەکەونە پێش پاشگری (-ەوە)وە و ٢- بەدوا پاشگری (-اندن)دا دێن . وەك :

ناردیانیـەوە - جێنـاوی (یـان ، یـن) ، پاشـگری (-ەوە) . (ئـەوان ئێمەیان ناردەوە)

ناردمنەوە - جێناوی (م ، ن) ، پاشگری (ـەوە) . (مـن ئەو نم ناردەوە)

شکاندمانن - پاشگری (ـاندن) ، جێناوی (مان ، ن) . (ئێمە ئەوانمان شکاند)

سووتاندیانین - پاشگری (ـاندن) ، جێناوی (یان ، ین) . (ئەوان ئێمەیان سووتاند .

... [87]

[87] مامۆستا مەسعوود محەممەد لە کتێبی "چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی"دا (بەغدا ، ١٩٧٦) وێڕای (-ەوە) و (-اندن) ، هەروەها (-ا) و (-کا) و (-را)یشی بە پاشگری کردار داناوە و ڕەخنەی توند و تیژی لە زمانناسانی کورد گرتووە ، کە دەرکیان بە بوونی ئەو چەند پاشگرەی دی نەکردووە . ئەگەرچی نووسەر بۆ دانانی (-ا) و (-کا) و (-را) گەلێ بەڵگە و نموونەی باشی هێناوەتەوە ، بەڵام بەداخەوە بەشی زۆری بۆچوونەکانی لەبەردەم زانستی زماندا لاواز دەوەستن .

بەوێنە، مامۆستا مەسعوود هیچ گومانی لەوە نییە ، کە لە وشەکانی (ترسا ، کێلا ، هێنا ، ڕاوەستا ... ترشا... ، ڕما ، لەقا ، خزا... جۆشا ، خرۆشا ، خولایەوە ، جوولا ... سووتا ، برژا...) و گەلێکی دیدا (-ا) پاشگرە و نیشانە نییە (ل ١٧-٢٥)و دەڵێ : "لێرەدا ڕەنگە ئیعتیرازێك بگیرێت و بگوترێت ئەم دەنگەی (ا) لە کۆتایی کارەکەدا بەشێکی ئەسڵی کارەکەیە وە یاخود شێوەیێکی تەصریفیە نەك (پاشگر) ، بەڵام ئەختێك بەراوردکردنی کارەکە لەگەڵ هی تری وەك ئەمدا کە بە ڕواڵەت (ا) یان لە کۆتاییدا هەیە پێمان دەسەلمێنێ ئەم (ا)یە پاشگرە نەك شێوەی تەصریف وەیا پیتی ئەسڵی وشەیە" (ل ١٨-١٩) .

لە ڕاستیدا (ا) نیشانەی کاتی ڕابوردووە و بۆ ڕەت کردنەوەی ناڕاستیی دانانی بە پاشگر هیچ پێویست بە قووڵبوونەوە و لێکۆڵینەوە ناکات ، تەنیا ئەمەندە بەسە ، کە بڵێین ئەگەر ئەو (ا)یە پاشگر بوایە ، ئەوە لە کاتی ڕانەبوردوودا لە سەرجەمی نموونەکاندا نەدەبوو بە (ێ) : (ترسا -

دەترسێ ، کیلا - دەکێڵێ ، هێنا - دەهێنێ ، ڕاوەستا - ڕادەوەستێ ... ترشا - دەترشێ ... ڕما - دەڕمێ ، تەقا - دەتەقێ ، خزا - دەخزێ ... جۆشا - دەجۆشێ ، خرۆشا - دەخرۆشێ ، خولایەوە - دەخولێتەوە ، جوولا - دەجوولێ ... سووتا - دەسووتێ ، برژا - دەبرژێ ...) .

جا ئەگەر (ا) بە پاشگر دابنرێ ، ئەوە دەبێ (ێ)یش بانگی پاشگر بوونی بۆ بدرێ .

نووسەر بۆ پاشگری (-کا) لەسەرەتادا وای نیشان داوە ، کە لە پێکهێنانی (ناو ، ئاوەڵناو ، ناوی ئامێر...)یشدا دەبینرێ و دەڵێ : "هەر خوێنەڵێ دەردەکەوێتەوە لە حاڵتی بە شێوەی پاشگر لە کۆتایی هەندێک فیعلی کوردیدا" (ل ٣٦)... بەڵێ ئەو نموونانەی بۆ ئەم بەشە هێناونەتەوە دەنگی (ک)یان تێدایە ، بەڵام زۆربەیان نە پاشگری (-ک)ن و نە (-کا) . لە وشەی "سەرەک" ، "سەرزک" ، "بەیانەکی"... دا پاشگرەکان (-ەک) ، (زک) ، (-ەکی)... ن .

دواتر نووسیویە : "ئەم پاشگرەی (کا)ش ... وا دەبێ بە دوا وشەی واتادارەدا دێت و دەیکات بە فعل ...

ئاڵۆز - ئاڵۆزکا..." (ل ٣٦ - ٣٧) .

بەر لە هەموو شت ئەوە دێنمەوە یاد کە لە "ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی"دا وتراوە : "ساغ کردنەوەی ئەو لایەنە ئاخۆ (چاوگ) سەرچاوەی ئیشتیقاقە ، وەیاخود چاوگ خۆی لە کارەوە وەرگیراوە ، باسێکی فراوانە و دەمەتەقێیەکی ورد و قووڵ هەڵدەگرێت . لە زمانی عەرەبیدا بەرەیێکی گەورەی زاناکانی زمان لە کۆنەوە بڕیارێکی گشتییان داوە کە (چاوگ - مصدر) سەرچاوەی کار و ئیشتیقاقە... زمانەکەمان هەڵدەگرێت (چاوگ)ی تێدا بکرێت بە سەرچاوە ، وەیا کاری ڕابوردوو . ئەو سەرچاوە بێت . لە هەمان کاتدا ڕێگەیەکی سێیەمیش هەیە بۆ دەست نیشان کردنی سەرچاوەی ئیشتیقاق کە ئەویش (ڕەگی کار)ە" (ل ٣٦٢) . ئەگەر مەسەلە بەو جۆرە بێ ، ئیتر مامۆستا مەسعوود چۆن وا بە ئاسانی بڕیاری داوە وشەی (ئاڵۆز) بە یارمەتی پاشگری (کا) کراوە بە کردار .

ڕاستی و دروستی ئەوەیە ، لە زمانی کوردیدا کرداری (ئاڵۆزان) و (ئاڵۆزکان) هەیە . ئەمەش هەروەک بوونی (شتن) و (شوشتن)ە ، یاخود (سوون) و (سووین)ە ... بەپێی ئەو بۆچوونەی مامۆستا مەسعوود بێ، دەبێ (وش)ی (شوشتن)و (ی)ی (سووین)یش پاشگر بن .

وێرای هەموو ئەوەش ، ئەگەر (کا) پاشگر بوایە ، دەبوو بکەوتنە دوای (ن)ی چاوگەوە ، نەك پێشی‌بەوە . چونکە وەك ئاشکرایە ، لە زمانی کوردیدا پاشگر دەکەوێتە کۆتایی وشەوە . ئەوەتە کورد دەڵێ : (ڕۆیشتنەوە) ، نەك (ڕۆیشتەوەن) ؛ (بردنەوە) ، نەك (بردەوەن)....

هەروەها زیادیی (ئاڵۆزکان) لە (ئاڵۆزان) دوو دەنگی (کا) نی‌یە و تەنیا (ك)ەو ئەو (ك)ەش بە هیچ چەشنێك پاشگر نی‌یە . خۆ ئەگەر نووسەر بە ئاوکری دابنایە ، دەکرا کەمێ دەمەتەقێی لەسەر بکرێ .

ئەوەی پتر سەرنج ڕابکێشێ ، ئەوەیە مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کۆتایی باسی (کا)دا چەند وشەیەکی دی : (بزرکا ، خلیسکا ، پەشۆکا...)ی کردووە بە نموونەی ئیسپاتی بە پاشگر دانانی (کا) .

(ك)ی ئێو سەرەتاکی ئەو وشانە ، وەك هەموو دەنگەکانی دی وشەکان دەنگێکی ئاسایین . ئاشکرایە ، چاوگەکانیان (بزرکان ، خلیسکان ، پەشۆکان...)ەو ئاشی بوتری (بزران ، خلیسان ، پەشوان ...) .

بەگوێرەی ئەو ڕایە دەبێ لە وشەی (قلیشان ، کێشان ، هێشتن ، هاوێشتن ...)دا (شا) و (شت) پاشگر بن . یان لە (پاراستن ... ئاوسان...)دا (ست) و (سا) پاشگر بن ...

ئەوەی مامۆستا مەسعوود محەمەد دەربارەی سێیەم پاشگر (-ر)ی کارا بزر وتوویە ، ڕەنگە زلەی ڕۆیی نەبێ ، ئەگەر بڵێم بەشی هەرە زۆری هەڵە و نادروستی بێ .

نووسەر لە دەست پێ‌کردنی ئەو باسەدا وتوویە : "پاشگری سێیەم ... زۆریش باسی کراوە بەڵام بێ ئەوەی هەست بەوە بکرێ کە پاشگرە" (ل٢٩)... و دەڵێ "بە نووسینەکەی خۆم دەربارەی پاشگری (را) بڵێم ئاشکراکەری حەشارگەیێك..." ل٣١)... "... وا دەزانم هەقم هەیە بەم نووسینە لەبارەی پاشگری (را)وە بڵێم خەریکە حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی لە نۆژەن ئاشکرا دەکات" (ل ٣٥)...

نە دوور دەکەومەوە و نە پەنجە بۆ کاری زانایانی هەندەران ڕادەکێشم ، بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم ، هەژدە ساڵ بەر لەو نووسینەی مامۆستا مەسعوود ، لە نامیلکەی "گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی – پێشگر و پاشگر" ی مامۆستا نووری عەلی ئەمیندا ڕوون و ئاشکرا (را) بە پاشگر دانراوە و وتراوە : "پاشگری (را) .

ئەم پاشگرە بۆ گەلێ مەرام بەکار ئەھێنرێ

١-ئەلوێ فرمانی ڕابوردووی (متعدی معلوم)ی پێ بکرێ بە (مجهول) ... وەك :

کێڵرا

فرۆشرا

...

... ..." (ل٤١ – ٤٢)

ئەوەیە ئەنجامی گوێ نەدانە سەرچاوە و ئاوڕنەدانەوە لە بەرھەمی ئەوانەی لە ڕۆژگارێکی کۆن و ئەنگوست لە چاودا بە بیری زیر و وریاوە ڕەچەیان بۆ شکاندووین .

مامۆستا مەسعوود لە بەردەوامیی ئەو باسەیدا وتوویە : "وا دەزانم ھۆی ئەم ھەست نەکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیە کە لە ڕێزمانەکانی غیری کوردی پاشگرێك نییە بووەستێتە بەرانبەر ئەم پاشگرە ، لەبەر ئەمە مومکین نەبووە لە ڕێی شوێن پێ ھەڵگرتنەوەی زمان شناسانی بێگانە کەس لێی ھەڵتەنگێوێت " (ل ٢٩) .

بەپێی زانینی ئێمە لە زۆر زماندا پاشگر ھەبە بەرانبەر ئەم پاشگرەی کوردی دەوەستێ . لە سەروو ئەوەشەوە ، نەك ھەر لە زمانی کەم ناسراوی کەلتی و توخاریدا ، بەڵکو لە زمانی یەکجار بەناوبانگی لاتینیشدا ، وەك کوردی ھەر (-ر) پاشگری کارا بزرییە ... خۆزگە بە خۆڕایی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی وا خەتابار نەدەکرد ! .

بەدوا ئەمەدا وتراوە : "ئەم پاشگرەیان ئەڵالە زۆر مەشھوورە زۆر باسکراوەکەی فعلی (مبنی للمجهول)ە کە لە زاری کرمانجیی خوارووا دوو دەنگی (را)یە " (ل ٣٠) . مامۆستا مەسعوود کە زۆر پێ لەسەر چاولێکەری و بیرکردنەوەی ڕێزمانناسانی کورد دادەگرێ ، کەچی ئەوەتە خۆی کەوتووەتە ژێر سێبەری چاولێکەرییەوە و وەك زۆر نووسەر پاشگری کارا بزری بە (-را) لێکەیشتووە . لە ڕاستیدا ئەو پاشگرەی ئەو لێی دواوە (-را) نییە و (-ر)ە ، ھەرچی (ا)یە نیشانەی کاتی ڕابوردووی کردارە لە حاڵەتی کارا بزری و ھەمدیق حاڵەتی دیدا .

# کرداری لێکدراو

کرداری لێکدراو بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار و ژمارە و ئامراز .... پێک دێ .

١-بە یاریدەی ناو .

ناو (مادی بێ یا مەعنەوی) دەتوانێ لە پێکهێنانی کرداری لێکدراودا بەشدار بێ . وەک : ( دەست بڕین ، پێ گرتن ... بیرکردنەوە ، شەرمکردن ...) .

ناوی داڕێژراو و لێکدراویش وەک ناوی سادە دەتوانن یارمەتیی پێکهێنانی کرداری لێکدراو بدەن :

أ-ناوی سادە . وەک :

مل + نان = ملنان[88]

شەڕ + کردن = شەڕکردن

---

[88] زۆر جار جگە لەو دوو وشە واتادارەی وشەی لێکدراو پێک دەهێنن ، پێشگر یا پاشگریش لەناو وشەی لێکدراودا دەبینرێ . وەک (مل لێنان ، دەست کردنەوە ، چاولێداگرتن ، سەرلێشێواندن ، ڕەشبابەهەڵکردنەوە...) . لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ئەم جۆرە پێکهاتانەی ناوناوە "کرداری ئاوێتە". لە ڕاستیدا ئەم وشانەش هەر وشەی لێکدراون . ئەگەر لەبەر ئەو زیادیە لیژنە ئەمە بە جۆرێکی دیکە دابنێ ، ئەو دەم دەبێ واز لەو ڕایە بێنێ ، کە لە بەشی (ناو)دا وشەی ، (شەولەبان ، بن بەردەقیلە ، کولەکەنم ، شەکرەسێو...)ی بە ناوی لێکدراو داناوە ، یاخود لەبەشی (ئاوەڵناو)دا وشەی (گوێ‌بەدەم ، چاوبەکل ، دەست لەسەرسنگ...)ی بە ئاوەڵناوی لێکدراو داناوە و دەبێ بە ئاوێتە ناویان بهێنێ . بەو پێیە دەبێ بۆ ئەو کردارانەش کە لەسێ وشەی واتادار پێک هاتوون ، وەک ، (چلکاوخواردن ، سەرخۆش بوون...) زاراوێکی تایبەتی دابنێ .

ب-ناوی داڕێژراو . وەك :

جێگە + کردنەوە - جێگەکردنەوە

ڕێگا + گرتن - ڕێگاگرتن

ج-ناوی لێکدراو . وەك :

چڵکاو + خواردن - چڵکاو خواردن

ماستاو + کردن - ماستاوکردن

ناو دەتوانێ لە دروست کردنی کرداری لێکدراودا بەشدار بێ .

١- ئاوەڵناوی سادە . وەك :

سوور + بوون - سووربوون

بڵند + کردن - بڵندکردن

ب_ ئاوەڵناوی داڕێژراو . وەك :

نەخۆش + کەوتن - نەخۆشکەوتن

بەهێز + بوون - بەهێزبوون

ج- ئاوەڵناوی لێکدراو . وەك

سەرخۆش + بوون - سەرخۆشبوون

ڕووڕەش + کردن - ڕووڕەشکردن

٣-دووبارەکردنەوەی (ناو ، ئاوەڵناو) + کرداری (کردن ، بوون... )

وەك :

کونکونکردن

کونکونبوون

وردوردکردن

لەتلەتکردن

... هتد .

ئـەو کـرداره لێکدراوانـەی لـە ئـەنجامی دووبـاره کردنـەوەی (ناو ، ئاوەڵناو ...)و کرداری (کردن ، بوون...) پێك دێ لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا پاشـگری (ـی) یـان (ـکـی) دەکەوێتـە نێـوان وشـەی دووبـاره و کردارەکەوە . وەك :

هورهوریکرن

پرتیپرتیبوون

قولقولکیکرن [89]

٤-بە یاریدەی ئاوەڵکردار . وەك :

دەربوون

دەرکردن

کەم بوون / کێم بوون

زیادکردن / زێدەکردن

پێش خستن

دواکەوتن

٥-بە یاریدەی ژماره . وەك :

یەکبوون

یەکگرتن

---

[89] بڕوانە ، ق . کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٤٠ .

یەکگەرتن

٦-بە یاریدەی ئامراز (بەتایبەتی ئامرازی پەژارە و خۆشی) . وەك :

ئاخ‌هەڵکێشان

داخ‌خواردن

خۆزگەخواستن

٧-هەندێ لەو وشانەی لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا مانای سەربەخۆیان نییە ، وەك : (تووش ، فڕێ ، بەخێو ، نقوم ، تووڕ ، پەك ، واز ، هان ...) دەتوانن لە پێکهێنانی کرداری لێکدراودا بەشدار بن . وەك :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| تووش | + | بوون | - | تووش‌بوون |
| فڕێ | + | دان | - | فڕێ‌دان |
| بەخێو | + | کردن | - | بەخێوکردن |
| نقوم | + | بوون | - | نقوم‌بوون |
| تووڕ | + | هەڵدان | - | تووڕهەڵدان |
| پەك | + | کەوتن | - | پەککەوتن |
| واز | + | هێنان | - | وازهێنان |
| هان | + | دان | - | هان‌دان [٩٠] |

[٩٠] ئەوەی لەم ڕووەوە جێگەی سەرسوڕمان بێ ، ئەوەیە کە عەبد ئەحمەد حەسەن (شی ، گل ، فێر ، نقوم ، پیشان ، قووت ، پەك ، پەیدا ، بەرپا ، گلۆر ، تێهەڕ ، گــوم ...) ی بە پێشگر داناوە (عەبد ئەحمەد حەسەن ، پێشگر و پاشگر ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٢٢ - ٣٢٣) . بێ‌گومان ناتوانرێ ئەوانە بە پێشگر دابنرێن ، بەڵکو وشەن ، هەرچەندە زۆریان مانای سەربەخۆی خۆیان نیە و سەربەخۆ بەکار نایەن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وشەی داڕێژراو پێک ناهێنن و دەبینین وشەی لێکدراو دروست دەکەن .

٨- بەیاریدەی ناوی چاوگ یان ڕەگی کردار . وەك :

پرس‌کردن

خەوکردن ، خەوهاتن

... هتد .

(کــردن / کــرن) و (بــوون) و (دان) و (نــان) و (بــردن / بــرن) و (گرتــن) و (هێشــتن) و (خــواردن) و (کــەوتن / کــەتن)و (هــاتن) و (چــوون) و (مــان) ، (هێنان / ئانین) و (کێشان / کشـاندن) و (دیـتن) و (خسـتن) ... لـە پێکـهێنانی کرداری لێکدراودا بەورێکی گەورە دەبینن .

لــەنێو ئــەو کردارانــەدا ، کــە لــە ســەرەوە ناومــان بــردن ، کــرداری (کردن / کرن)و (بوون) بۆ پێکهێنانی کرداری لێکدراو لە هەموویان زیاتر بەکار دەهێنرێن . وەك :

## کرداری (کردن / کرن) .

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| زین | + | کردن | - | زین‌کردن |
| گوڵ | + | کردن | - | گوڵکردن |
| تۆبە | + | کردن | - | تۆبەکردن |
| گاڵتە | + | کردن | - | گاڵتە کردن |
| ... | | | | |
| شەڕ | + | کرن | - | شەڕکرن |
| داوا | + | کرن | - | داواکرن |
| ... | | | | |
| سوور | + | کردن | - | سوورکردن |
| گەورە | + | کردن | - | گەورەکردن |
| جوان | + | کردن | - | جوانکردن |
| گەرم | + | کردن | - | گەرمکردن |

...

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سار | + | کرن | - | سارکرن |
| بەلاڤ | + | کرن | - | بەلاڤکرن |

...

زیاد / زیندە + کردن / کرن - زیادکردن / زیندەکردن

... و سەدان وشەی دی وەك : (پیرکردن ، زلکردن ، بارکردن ، لەبەرکردن ، هارکردن ، ترشکردن ، شیرینکردن ، خۆشکردن ، کەرکردن ، بەرزکردن ، نزمکردن ، شرکردن ، ماچکردن ، پڕکردن ...)

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بۆ ڕۆنانی کرداری لێکدراو هەمان ڕێگەی ئەمڕۆی کوردی بە برەو بووە و بەتایبەتی کرداری "کەرتەن" (کردن) زۆر دەوری بینیوە . وەك :

"زین کەرتەن" (زین کردن)

"ڕۆسنیە کەرتەن" (ڕووناك کردن ، ڕووناك کردنەوە)

"ئازمایش کەرتەن" (کۆشش کردن) .

... هتد [٩١]

لە زمانی پشتۆشدا ژمارەیەکی زۆر وشە بە هاریکاری "کول" (کردن) دروست بوون . وەك :

"لاسلیك" (ئیمزا) + "کول" (کردن) - "لاسلیك کول" (ئیمزا کردن)

... هتد [٩٢]

## کرداری (بوون) .

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| گەرما | + | بوون | - | گەرمابوون |
| سەرما | + | بوون | - | سەرمابوون |

---

[٩١] ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٨٤ .

[٩٢] ن. ئا. دڤۆریانکۆڤ ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٥٨ .

...

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ڕەش | + | بوون | = | ڕەشبوون |
| زل | + | بوون | = | زلبوون |
| تێر | + | بوون | = | تێربوون |
| هەژار | + | بوون | = | هەژاربوون[٩٣] |

...

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دەر | + | بوون | = | دەربوون |

...

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| یەک | + | بوون | = | یەکبوون |

... هتد [٩٤]

هەرچی کرداری (دان) و (نان) و (بردن / برن ) و (گرتن) و (هێشتن) و (خواردن / خارن) و (کەوتن / کەتن) و (هاتن) و (چوون) و (مان) و (هێنان / ئانین) و (کێشان / کشاندن) و (دیتن) و (خستن) ... یشە بەپێی توانای خۆیان لە دروست کردنی کرداری لێکدراودا بەشدار دەبن . وەک :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| بڕیار | + | دان | = | بڕیاردان |
| جنێو | + | دان | = | جنێودان |
| ناو | + | نان | = | ناونان |

---

(٩٣) هەرچەندە کرداری (بوون) لەگەڵ ناو و ناوەڵناو و ناوەڵکردار و ژمارە ... دا ڕێک دەکەوێ ، بەڵام لەگەڵ ئاوەڵناودا پتر دەگونجێ .

(٩٤) لە زمانی پشتۆشدا :

"نژدی" (نزیک) + "کیدل" (بوون) = نژدی کیدل" (نزیک بوون ، نزیک بوونەوە) .

(سەرچاوەی ناوبراو ، زمانی پشتۆ ، ل ٥٩) .

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ڕاو | + | نان | - | ڕاونان |
| ئابڕوو | + | بردن | - | ئابڕووبردن |
| ناو | + | بردن | - | ناوبردن |
| پێ | + | بڕن | - | پێبڕن |
| وێنە | + | گرتن | - | وێنەگرتن |
| بێ | + | گرتن | - | بێگرتن |
| بانگ | + | هێشتن | - | بانگ هێشتن |
| جێ | + | هێشتن | - | جێهێشتن |
| خوڵ | + | خواردن | - | خوڵخواردن |
| نان | + | خواردن | - | نانخواردن |
| سەر | + | کەوتن | - | سەرکەوتن |
| ژێر | + | کەوتن | - | ژێرکەوتن |
| دەست | + | کەتن | - | دەستکەتن |
| ناو | + | هاتن | - | ناوهاتن |
| سەر | + | هاتن | - | سەرهاتن |

... هتد [٩٥].

[٩٥] کەریمی ئەیووبی و ئی . ئـا . سمیرنۆڤا ، قەمالی کـوردیی ، زاری یووسـف ... بـەدوور و درێژی دەربارەی کرداری لێکدراو دواون . ئێمەش بە تایبەتی سوودێکی زۆرمان لەم بەشەی ئـەو بەرهەمانە وەرگرتووە و گەلێک نموونەمان لێ دەرهێناوە .

# بنەمای کردار

لە شێوە و ناوەرۆکی هەموو کردارێکدا ، ڕابوردوو بێت یان ڕانەبوردوو ، بنەماییەک هەیە ، کە هەڵگری واتای کردارەکەیە و لە قاڵبەکانی کرداردا دووبارە دەبێتەوە و ناگۆڕێت و دەشێ پێی بوترێ (بنەما) .

لەزمانی کوردیدا ، هەروەک زمانە ئێرانییەکانی دی [٩٦] ، کردار خاوەنی دوو بنەمایە : بنەمای کاتی ڕابوردوو و بنەمای کاتی ڕانەبوردوو. وا پەسەندەکەین بە بنەمای کاتی ڕابوردوو بڵێین (قەد) و بۆ بنەمای کاتی ڕانەبوردووش زاراوەی (ڕەگ) وەربگرین.

---

[٩٦] لە زمانی بلووجیدا کردار خاوەنی دوو بنەمایە ، بنەمای کاتی ڕابوردوو و بنەمای کاتی ڕانەبوردوو (بڕوانە : ل . ئا . فوروڵۆف . زمانی بلووجی ، مۆسکۆ، ١٩٦٠ ، ل ٤٠) . لە هەموو دیالێکتەکانی گرووپی زمانە شوگانو - ڕووشانییەکاندا دوو بنەمای کردار جیادەکرێتەوە ، بنەمای کاتی ئێستا و بنەمای کاتی ڕابوردوو ، (بڕوانە : ت . ن. پاخالینا ، زمانە پامیرییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ٢٩-٣١) . لە زمانی یازگولیامی و ئاخانی و ئیشکاشیمی و مونجانی .. یشدا بنەمای کاتی ڕابوردوو و کاتی ڕانەبوردوو هەیە (هەمان سەرچاوە ، ل٦٦ - ٦٧ ، ٩٧-٩٨،١٢٢- ١٢٣ ، ١٤٥).

-١-

# قەدی کردار

ئەگەر لە ڕوانگەی چاوگەوە ، بەدوا قەدی کرداردا بگەڕێین ، دەبینین هەر چاوگێک بێ ئەوەی هیچ بیژۆکێك هەبێ ، کە (ن)ی چاوگی لێ بکرێتەوە ، ئەوەی دەمێنێتەوە قەدە . وەك :

| | | | قەد | |
|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕ | وەستان | | وەستا | وەستام |
| | لەرزین | | لەرزی | لەرزیم |
| | چوون | - ن - | چوو | چووم |
| | مردن | | مرد | مردم |
| | کەوتن | | کەوت | کەوتم |

| | | | قەد | |
|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | هێنان | | هێنا | هێنام |
| | کڕین | | کڕی | کڕیم |
| | دروون | - ن - | دروو | درووم |
| | خوێندن | | خوێند | خوێندم |
| | گرتن | | گرت | گرتم |

هتد

قەدی کردار لە زمانی کوردیدا بنەمای گشت جۆرە ڕابوردوویێکی (نزیك ، بەردەوام ، تەواو ، دوور)ی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائییە و هەروەها کەرەستەی پێکهێنانی ناوی کارا و ناوی بەرکار و ناوی چاوگ و ناوی جێگاییشە.

بەوێنە :

## ڕابوردووی ئیخباری

### تێنەپەڕ

| | کرمانجیی خواروو | | کرمانجیی ژووروو | |
|---|---|---|---|---|
| | چاوگ | قەد | چاوگ | قەد |
| | کەوتن | کەوت | کەتن | کەت |
| ١-ڕابوردووی نزیك | | کەوت – م | | کەت – م |
| | | کەوت – ین | | کەت – ن |
| ٢-ڕابوردووی بەردەوام | | دە – کەوت – م | | د – کەت – م |
| | | دە – کەوت – ین | | د – کەت – ن |
| ٣-ڕابوردووی تەواو | | کەوت – وو – م | | کەت – م – ە |
| | | کەوت – وو – ین | | کەت – ن – ە |
| ٤-ڕابوردووی دوور | | کەوت – بوو – م | | کەت – بوو – م |
| | | کەوت – بوو – ین | | کەت – بوو – ن |

تێپەڕ:

| | کرمانجیی خواروو | | کرمانجیی ژووروو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | چاوگ | قەد | چاوگ | قەد | |
| | گرتن | گرت | گرتن | گرت | |
| ١-ڕابوردووی نزیک: | | گرت – م | | من / مە < گرت | تە ئەمز گرت – م |
| | | گرت – مان | | | |
| ٢-ڕابوردووی بەردەوام: | | دە – م – گرت | | | |
| | | دە – مان – گرت | | | |
| ٣-ڕابوردووی تەواو: | | گرت – وو – مە | | | |
| | | گرت – وو – مانە | | | |
| ٤-ڕابوردووی دوور: | | گرت – بوو – م | | | |
| | | گرت – بوو – مان | | | |

# ڕابوردووی نیشانی

تێنەپەڕ:

| | کرمانجیی خواروو | | کرمانجیی ژووروو | |
|---|---|---|---|---|
| | چاوگ | قەد | چاوگ | قەد |
| | کەوتن | کەوت | کەتن | کەت |
| ١-ڕابوردووی نزیک: | | کەوت– م | | کەت –ب– م |
| | | کەوت– با –م | | کەت – ب–ین |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢-ڕابـــــــــــردووی بەردەوام: | | پ-کەوت-با-م-ایە | | پ-کەت - اما |
| | | پ-کەوت-با-ین-ایە | | پ-کەت- انا |
| ٣-ڕابردووی تەواو: | | کەوت - پ -م | | پ- کەت-اما |
| | | کەوت - پ- ین | | پ-کەت-انا |
| ٤-ڕابردووی دوور: | | کەوت - بوو-با-م-ایە | | کەت-بوو-ياما |
| | | کەوت - بوو -با- ین-ایە | | کەت-بوو-يانا |

تن پەڕ :

| | کرمانجیی خواروو | |
|---|---|---|
| | چاوگ | قەد |
| | گرتن | گرت |
| ١-ڕابردووی نزیك: | | گرت- با-م |
| | | گرت-با-مان |
| ٢-ڕابردووی بەردەوام: | | ب-م-گرت-بایە |
| | | ب-مان-گرت-بایە |
| ٣-ڕابردووی تەواو: | | گرت-ب-م |
| | | گرت -ب- مان |
| ٤-ڕابردووی دوور: | | گرت-بوو-م-ایە |
| | | گرت -بوو-مان-ایە |

# ناوی کارا

له زمانی کوردیدا قەد بە یاریدەدەی پاشگر ناوی کارا پێك دێنن :

١- پاشگری ( -وو)

ئەم پاشگرە کە دەچێتە سەر قەدی کرداری تێنەپەڕی خوازەکی (الارادي) ناوی کارا ڕۆدەنێ[٩٧] . پاشگری (-وو)لەباری ئاساییدا-واتە کاتێك قەد بە دەنگی نەبزوێن کۆتایی دێت[٩٨]. بەڕەوانی دەردەکەوێت ، بەلام وەك زۆر دیاردەی دی زمانی کوردی ، لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیێکی تر دەبینرێ و ئەمە بووتە هۆی تێکەڵ کردن. جا بەم بۆنەیەوە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین:

[٩٧] بەلام لەگەڵ قەدی کرداری تێنەپەڕی ڕوودانـدا نـاوی بەرکار پێـك دێنن.. زۆربـەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی، ئەو فۆرمی ناوی کارایەی لە عەرەبیدا لە کرداری تێنەپەڕەوە پـەیدا دەبێ ، بە باڵای کوردییاندا بڕیوە و ئەوەیان بەدی نەکردووە ، کـە لـە زمـانی کوردیـدا لـە تێنەپەڕی گوێزانەوەوە ناوی کارا پێك دێ و لە تێنەپەڕی ڕوودانیشەوە ناوی بەرکار.

شایانی باسە ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد (ڕێزمانی ئاخـاوتنی کـوردی ...) (ل ٢٤٤)و مامۆستا ڕەفیق محەممەد شوانی لە نامەی ماجیستێری یەکەمیدا "ئـەو وشانەی لـە چاوگەوە وەردەگیرێن" (ل٨٤) بە شێوەیێکی زانستی ئەو کێشەیەیان ساغ کردووەتەوە .

[٩٨] لە زمانی کوردیدا سەرباکی قەد یان کۆتاییەیان بـە نـەبزوێنی (ت ، د)دێـت، یـان بـە بزوێنی (ا ، ی ، وو) - واتە قەد هەمیشـە بەیەکێك لـەو پێنج دەنگـە (ت ، د ، ا ، ی ، ن ، وو) کۆتایی دێت .

ا- ئەگەر قەدێك کۆتایی بە دەنگی نەبزوێنی (ت ، د) بێت، ئەوە (-وو)ی بە ڕەوانی پێوە دەلکێنرێ ، بێ ئەوەی هیچ زیادی و کەمییەك بێتە گۆڕێ. وەك:

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی کارا |
| --- | --- | --- | --- |
| کەرتن | کەوت | | کەوتوو |
| خەوتن | خەوت | - وو | خەوتوو |
| هاتن | هات | | هاتوو |
| ...هتد | | | |

ب-ئەگەر قەدێك بە بزوێنی (ا ، ی) کۆتایی بێت ، ئەو کاتە پاشگری (-وو) لە شێوەی (و-W)دا دەردەکەوێ وەك:

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی کارا |
| --- | --- | --- | --- |
| دامان | دا -ما | | داماو |
| گەڕان | گەڕا | - وو> -و w | گەڕاو |
| فڕین | فڕی | | فڕیو |
| ...هتد | | | |

ج-بێتو قەدێك بە بزێنی (وو) کۆتایی بێت ، ئەوسا یەکێك لەو دوو بزوێنە - واتە (وو)ی کۆتایی قەدەکە ، یاخود (-وو)ی پاشگرەکە- تێن دەچن و یەکێکیان دەمێنێتەوە. وەك :

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی کارا |
|---|---|---|---|
| هەڵبوون | هەڵ – بوو | | هەڵ بوو |
| ڕابوون | ڕا – بوو | | ڕابوو |
| زاڵبوون | زاڵ – بوو | | زاڵ بوو |
| سیسبوون | سیس – بوو | | سیس بوو |
| | | – و | |
| هەڵچوون | هەڵ – چوو | | هەڵچوو |
| ڕۆچوون | ڕۆ – چوو | | ڕۆچوو |
| دەرچوون | دەر – چوو | | دەرچوو |
| بەسەرچوون | بەسەر – چوو | | بەسەرچوو |

...هتد[99]

پاشگری (–و) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (–ی)دا بەکاردێ و دەوترێ:

هاتی ، کەتی...

مایی ، بوویی...

لەرزی...

واتە:

۱–ئەگەر قەد کۆتایی بە دەنگی نەبزوێن بێت ، ئەوە (–ی)ی بە ڕەوانی وەردەگرێ : (هاتی ، کەتی.. )

[99] ناوی کارا لە فۆرمی سادەی (بوون ، چوون) وە پەیدا نابن و تەنیا لە فۆرمی ناسادەیانەوە دەکەونەوە.

ب-کاتێ قەد کۆتایی بە بزوێنی (ا ، وو) دێت ، ئەوە لەنێوان کۆتایی قەد و پاشگرەکەدا نیمچەبزوێنی (ی -y) پەیدا دەبێ : مایی ، بوویی...)

ج-بێتو دوا دەنگی قەد بزوێنی (ی) بێت ، ئەو دەمە یەکێك لەو دوو (ی)یە -واتە (ی)ی قەد و (-ی)ی پاشگر تێ‌دەچێ: (ڕزین : ڕزی+ ی = ڕزی).

پاشگری (-وو) لە هەندێ ناوچەی وەك هەولێر و کۆیە و خۆشناوەتی ... یشدا بە چەشنی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو لە شێوەی (-ی)دا خۆی دەنوێنێ و دەوترێ (هاتی ، ڕۆیشتی ، نوستی...).

٢-پاشگری (-ە)

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر قەدی چەند کردارێکی تێنەپەڕ.

وەك :

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی کارا |
|---|---|---|---|
| بوون | بوو | | بووە |
| مردن | مرد | -ە | مردە |
| لێکەوتن | لێ - کەوت | | لێکەوتە |
| پەك کەوتن | پەك - کەوت | | پەككەوتە[100] |

(١٠٠) مامۆستا سەعید صدقی کابان تەنیا (چووە ، بووە)ی بە ناوی کارای ئەو جۆرە پێکهاتە داناوە (بڕوانە : مختصر صرف و نحوی کوردی ، ل ٢٠) . هەرچی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردە ، هەندێ نموونەی دی ئیزافەی سەر ئەو باسە کردووە (بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ... ، ل٢٤٥ - ٢٤٦) .

ئەدی کرداری تێنەپەڕ ج بە ڕووتی ، ج پێشگر یان وشەی واتاداری لە پێشەوە بێ ، بە ئاسانی هەردوو پاشگری (-وو)و (-ە) وەردەگرێ و ناوی کارا پێک دێ. وەک :

| | |
|---|---|
| کەوت | کەوتوو |
| مرد | مردوو |
| ..... | |
| هەڵ - کەوت | هەڵکەوتوو |
| لێ - کەوت | لێ کەوتوو |
| ..... | |
| سەر - کەوت | سەرکەوتوو |
| پەک - کەوت | پەککەوتوو |

هەرچی کرداری تێپەڕە بە سادەیی یان بە داڕێژراوی ناتوانێ لە ڕۆنانی ناوی کارادا بەشداری بکا ، بەڵکو تەنیا دەمێک بۆی هەیە ئەو کارە بەجێ بێنێ ، کە وشەیێکی واتاداری لە پێشەوە بێ . وەک :

| | |
|---|---|
| سادە | Ø |
| داڕێژراو | Ø |
| لێکدراو | پیاوکوشتوو |
| | باوکمردە |

لێرەدا لەبەر ئەوەی وشەی پێشەوە (پیاو ، باوک) جێگای بەرکار دەگرێتەوە ، واتای وشە لێکدراوەکە دەبێتە کارا و دەشزانین بەرکار پێویستی بە کارایە.

٣- پاشگری ( -ەوار )

| ناوی کارا | پاشگر | قەد | چاوگ |
|---|---|---|---|
| خوێندەوار | -ەوار | خوێند | خوێندن |

ئەم پاشگرە بەدوا ناودا زۆر دێت[١٠١] ، بەلام لەگەڵ قەددا ، تەنیا لە پاش قەدی (خوێندن)ەوە دێت ، کە تێپەڕە.

٤- پاشگری ( -گار )

| ناوی کارا | پاشگر | قەد | چاوگ |
|---|---|---|---|
| کردگار[١٠٢] | -گار | کرد | کردن |

تێبینی :

١-تەنیا چوار پاشگری (-وو)و (-ە)و (-ەوار)و (-گار) توانستی یاریدەدانی پێکهێنانی ناوی کارایان هەیە . (-وو)و (-ە) چالاکن و (-ەوار)و (-گار) سستن.

٢-دوو پاشگری (-وو)و (-ە) لەگەڵ قەدی کرداری تێنەپەڕدا بە سادەیی یان بە داڕێژراوی یان بە لێکدراوی ، چالاکانە لە ڕۆنانی ناوی کارادا بەشداری دەکەن. هەرچی قەدی کرداری تێپەڕە بە سادەیی یان بە داڕێژراوی ناتوانێ لەگەڵ ئەو پاشگرانەدا ناوی کارا پێکبێنێ، بەڵکو دەمێك بۆی هەیە، ئەو ئەرکە بەجێبێنێ، کە وشەیێکی واتادار لە پێشەوە بێ و وشەکەش بەواتای کارا بێت.

---

[١٠١] بۆ وەرگرتنی زانیاری لەو بارەوە ، بڕوانە : پەراوێزی (٦١)ی لاپەڕە (١٣١) بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە - (ناو) .

[١٠٢] ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ڕەگیش ، وەك : (پاراستن : پارێز + گار = پارێزگار) . (بڕوانە ، ل١٥٨ ی ئەم کتێبە) . ولە هەردوو بارێشدا کردار هەر تێپەڕە .

٣-بوو پاشگری (-ەوار)و (گار) ناچنە سەر قەدی کرداری تێنەپەڕو بەدوا قەدی کرداری تێپەڕدا دێن.

٤-ناوی کارا ئەشێ لە بەکارهێناندا ببێتە ئاوەڵناوی کارا و لەنێو ناوی کارادا پتر ئەو وشانە ئەبنە ئاوەڵناوی کارا ، کە پێکهاتنیان بریتییە لە : قەد + پاشگری (-وو) وەك:

پیاوی / مردوو

منداڵی / نوستوو

میوەی / ڕزیو

....[102]

٥-کاتێ لە پێش ناوی کارای وەك (ڕۆیشتوو ، کەوتوو ...)ەوە وشەی واتادار دێت و ئەیانکاتە لێکدراو ، ئەوە بە تەواوی واتای وەسفیەت وەرئەگرن و ئەبنە ئاوەڵناوی کارا . وەك :

دەست + ڕۆیشتوو = دەستڕۆیشتوو

سەر + کەوتوو = سەرکەوتوو

......هتد.

٦-وشەی واتادار و قەد پێکەوە ناوی کارا سازناکەن و پێویستە بەدوا قەدەکەدا پاشگرێك بێن ، ئەوجا ناوی کارا پەیدا ئەبێ . بەڵام وشەی واتادار و ڕەگە پێکەوە ناوی کارا پێك دێنن[103].

---

[102] بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو دەربارەی بوونی ناوی کارا بە ئاوەڵناوی کارا ، بڕوانە : لاپەڕە ١٢٤ - ١٢٥ی بەشی سێیەمی ئەم کتێبە - (ئاوەڵناو) .

[103] بڕوانە : لاپەڕە (١٥٠-١٦٢)ی ئەم نووسینە .

# ناوی بەرکار

کاتێ قەد دەبێتە بنەمای ناوی بەرکار ، بەهەمان چەشنی ناوی کارا پاشگر دەبێتە یاریدەدەر :

١- پاشگری ( -وو )

لەسەرتای ناوی کارادا لەوە دواین ، کە پاشگری (-وو) دەچێتە سەر قەدی کرداری تێنەپەڕی خوازەکی و ناوی کارا پێك دێ.. ئێستاش ئەوە یادداشت دەکەین ، کە هەمان پاشگری (-وو) لەگەڵ قەدی کرداری تێنەپەڕی ڕووداندا ناوی بەرکار ڕۆدەنێن. ئەم پاشگرە لە حاڵەتی پێکهێنانی ناوی بەرکاریشدا بە هەمان چەشنی حاڵەتی سازکردنی ناوی کارا خۆی دەنوێنێ - واتە، کە بە دوای دەنگی نەبزوێندا دێ، بە ڕەوانی دەردەکەوێ و دەمێك دەکەوێتە پاش بزوێنی (ا ، ی)یەوە شێوەی (و-w) وەردەگری و لە دوا دەنگی (وو)شەوە یەکێکیان دەمێنێتەوە . بەروانە:

أ-بەدوا نەبزوێندا

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|
| مردن | مرد | -وو | مردوو |

ب-لە دوا بزوێنی ( ا ،ی ) یەوە:

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|
| سووتان | سووتا | وو > و-w | سووتاو |
| ڕزین | ڕزی | | ڕزیو |

ج- پاش بزوێنی (وو)

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|

پاشگری (-وو)ی ناوی کارای دیالێکتی کرمانجیی خواروو چۆن لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە قالبی (-ی)دا دەردەکەوێ، بەهەمان چەشن لە دۆخی ناوی بەرکاریشدا هەر دەبێ بە (-ی)و لە شێوەی خۆنواندنیشیدا هیچ جیاوازییەك پەیدا نابێ:

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|
| مرن | مر | -ی | مری |

هتد....

جیاوازیی دیاری پاشگری (-وو)ی حاڵەتی کاراییو حاڵەتی بەرکاری ئەوەیە، کە لە حاڵەتی کاراییدا بە ئاسانی دەچێتە سەر قەدی کرداری تێنەپەڕ، بەڵام ئەگەر وشەیێکی واتاداری لە پێشەوە نەبێ بەدوا قەدی کرداری تێپەڕدا نایەت ... هەرچی حاڵەتی بەرکارییەتی ، وێڕای ئەوەی لە بوارێکی فراواندا لەگەڵ قەدی کرداری تێنەپەڕدا رێکدەکەوێ ، لە دوو حاڵەتی دیکەشدا دەردەکەوێ:

ا-تا رادەیێك بە قەدی کرداری تێپەڕیشەوە دەلکێ.

وەك :

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|
| پاراستن | پاراست | -وو | پاراستوو |
| کوشتن | کوشت | | کوشتوو |
| خواردن | خوارد | | خواردوو |

| | | |
|---|---|---|
| بردن | برد | بردوو |
| شێلان | شێلا | شێلاو |
| پێوان | پێوا | پێواو |
| پۆشین | پۆشی | پۆشیو |
| بەخشین | بەخشی | بەخشیو |
| ......هتد | | |

پێویستە پەنجەش بۆ ئەوەش رابکێشین ، ئەگەر لەپێش ئەمەوە وشەیێکی واتادار هەبێ و شوێنی کارای گرتبێتەوە ئەوە مانای وشە لێکدراوەکە دەبێتە بەرکار ، چونکە کارا پێویستی بە بەرکارە . وەك:

خواگرتوو

ئاوبردوو

خواپێدراو

...

ب-بەدوا قەدی زوربەی کرداری کارا بزردا دێت . وەك :

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|
| کێلران | کێلرا | | کێلراو |
| شێلران | شێلرا | | شێلراو |
| .... | | | |
| نووسران | نووسرا | | نووسراو |
| بینران | بینرا | | بینراو |
| .... | | | |
| درووران | دروورا | -و | درووراو |

| | | |
|---|---|---|
| جووران | جوورا | جوو.او |
| ... | | |
| چاندران | چاندرا | چاندراو |
| ژمندران | ژمندرا | ژمندر.ی |

ئەم پاشگرە لە هەندێ ناوچەی دیالێکتی کرمانجیی خوارووددا (کۆیە ، هەولێر..) لە شێوەی (ی¯ێ) دا خۆی دەنوێنێ و دەوترێ : کێڵرای ، شێلرای ...

٢- پاشگری (-ە).

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر قەدی کرداری تێپەڕ و تەنیا بەدوا قەدی کۆتایی هاتوو بە ئەبزوێنی (ت ،د)دا دێت و جاروبارەش لە هەندێ ناوچەی کوردەواری لەگەڵ قەدە بە (ا ، ی ، وو) کۆتایی هاتووەکاندا دێ:

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی بەرکار |
|---|---|---|---|
| کوشتن | کوشت | | کوشتە |
| گرتن | گرت | | گرتە |
| گەستن | گەست | | گەستە |
| گوتن / وتن | گوت / وت | | گوتە / وتە |
| پالأوتن | پالأوت | | پالأوتە |
| ڕستن | ڕست | -ە | ڕستە |
| ڕشتن | ڕشت | | ڕشتە |
| ... | | | |
| کردن | کرد | | کردە |
| بژاردن | بژارد | | بژاردە |
| ... | | | |

تێبینی :

١-لەگەڵ قەددا تەنیا دوو پاشگری (-وو)و (-ە) توانستی یاریدەدانی ڕۆنانی ناوی کارایان هەیە .

٢-پاشگری (-وو) بۆ ڕۆنانی ناوی بەرکار دەچێتە سەر قەدی کرداری تێنەپەڕی ڕوودان و تێپەڕ و کارا بزر . هەرچی پاشگری (-ە)یە ، تەنیا بە دوا قەدی کرداری تێپەڕدا دێت .

## ناوی چاوگ

بۆ پەیدابوونی ئەو ناوی چاوگانەی قەد لە ڕۆنانیاندا هاریکاری دەکا، دیسان تەنیا ڕێگەی پێوەلکانی پاشگر هەیە :

١- پاشگری (-ار) .[١٠٥]

ئەم پاشگرە لە سنوورێکی یەکجار تەسکدا بەکاردێ و بەتایبەتی لە سێ کرداری تێپەڕی (کوشتن ، گوتن / وتن ، کردن)دا باش دەردەکەوێ[١٠٦] .

[١٠٥] بۆ زانیاریی دی لە بارەی پاشگری (-ار)ەوە ، بڕوانە : پەراوێزی (٥٦)ی لاپەڕە (١٢٨)ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە - (ناو) .

[١٠٦] پاشگری (-ار) بە دوا قەدی کرداری تێنەپەڕی (مردن)یشدا دێ : (مردار) ، بەڵام لێرەدا دەیکاتە ئاوەڵناو .

| ناوی چاوگ | پاشگر | | قەد | چاوگ |
|---|---|---|---|---|
| کوشتار | | | کوشت | کوشتن |
| گوتار / وتار | -ار | | گوت / وت | گوتن / وتن |
| کردار | | | کرد | کردن |

٢- پاشگری (-ە) .

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر قەدی کرداری تێپەڕ :

| ناوی چاوگ | پاشگر | | قەد | چاوگ |
|---|---|---|---|---|
| گوتە - وتە | | | گوت / وت | گوتن / وتن |
| ڕستە | | | ڕست | ڕستن |
| کوشتە | -ە | | کوشت | کوشتن |
| ڕشتە | | | ڕشت | ڕشتن |
| | | | | ... هتد . |

ئەم ڕێژەیە دەشێ بۆ (ناوی بەرکار)یش بەکاربهێنرێ .

٣- پاشگری (-وە / -ەوە) .

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر قەدی کرداری تێپەڕیش و تێنەپەڕیش . وەك :

| ناوی چاوگ | پاشگر | | قەد | چاوگ | |
|---|---|---|---|---|---|
| کردەوە | | | کرد | کردن | تێپەڕ |
| | | | | ... | |
| فڕیوە | -وە / -ەوە | | فڕی | فڕین | تێنەپەڕ |
| پاشماوە | | | پاش - ما | پاشماوە[107] | |
| | | | | ... | |

[107] سەبارەت پاشگری (-وە / -ەوە) ، بڕوانە : پەراوێزی (٦٠)ی لاپەڕە (١٣٠)ی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی کتێبی (ڕێزمانی کوردی)ی خاوەنی ئەم نووسینە - (ناو) .

٤- پاشگری ( -ەمەنی ) .

| | چاوگ | قەد | | پاشگر | ناوی چاوگ |
|---|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | خواستن | خواست | | | خواستەمەنی |
| | خواردن | خوارد | | | خواردەمەنی |
| | ... | | | -ەمەنی | |
| تێنەپەڕ | سووتان | سووتا | | | سووتەمەنی [١٠٨] |
| | تەقین | تەقی | | | تەقەمەنی |
| | ... | | | | |

تێبینی :

١-لەگەڵ قەددا تەنیا چوار پاشگری (-ار) و (-ە) و (-وە / -ەوە) و (-ەمەنی) دەتوانن هاریکاری پێکهێنانی ناوی چاوگ بکەن .

٢-دوو پاشگری (-ار) و (-ە) لە ڕۆنانی ناوی چاوگدا هەر دەچنە سەر قەدی کرداری تێپەڕ ، بەڵام دوو پاشگری (-وە / -ەوە) و (-ەمەنی) دەچنە سەر تێپەڕیش و تێنەپەڕیش .

[١٠٨] ئەم پاشگرە ، کە دەچێتە سەر قەدی بە بزوێن کۆتایی هاتوو ، بزوێنی کۆتایی قەدەکە تێدەچێ .

## ناوی جێگا

ئەوری قەد لە ڕۆنانی ناوی جێگاشدا سستە و تەنیا لە چەند وشەیێکی کەمدا دەبینرێ . دوو پاشگری (-گە / گا)[109] و (-مان)یش پاشگری ئاشکرا و دیاری ئەو پێکهاتنەن .

١- پاشگری ( -گە / -گا ) .

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر قەدی کردای تێپەڕ . وەك :

| چاوگ | قەد | پاشگر | ناوی چاوگ |
|---|---|---|---|
| پەرستن | پەرست | -گە / -گا | پەرستگە / پەرستگا |
| خوێندن | خوێند | -گە / -گا | خوێندگە / خوێندگا |

٢- پاشگری ( -مان ) .

ئەم پاشگرە ، کە لەگەڵ قەدی کرداری (نیشتن)دا (کە تێنەپەڕە) هاتووە : (نیشت + مان) = (نیشتمان) ، ناوی جێگەی دروست کردووە ، بەڵام لەگەڵ قەدی کرداری (دروون) دا (کە تێپەڕە) ، واتای پێکهێناوە .

---

(109) سەبارەت پاشگری (-وە / -موە) ، بڕوانە :

أ- باسی ئەو ناوی جێگایانەی لە ڕەگ و پاشگری (-گە / -گا) ڕۆنەنراون ( لاپەڕە ١٧٠ ی ئەم نووسینە) .

ب- بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە - (ناو) ، لاپەڕە ١١٦ ، پەراوێزی ٢٨ .

-٢-

# ڕەگی کردار

ئەگەر لە ڕوانگەی چاوگەوە بۆ ڕەگی کردار بگەڕێین [١١٠] ، ڕێگەیێکی بنەڕەتی و چەند حاڵەتێکی بیژۆك دەبینین :

---

[١١٠] لەگەرچی لە چەند لیکۆڵینەوەیێکی کەمی زمانەوانیی لای خۆماندا ، چاوگ بۆ وەدەست هێنانی ڕەگی کردار ، کراوەتە سەرچاوە ، بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین ، کە بەشێکی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە ڕوانگەی قەدی کردارەوە شوێن دۆزینەوەی ڕەگی کردار کەوتوون . بەوێنە ، بڕوانە : (د. قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٥٨ – ١٦٢ ؛ ئی. ئی. تسوکیرمان ، لەبارەی ڕێزمانی کوردیەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ٧٦ – ٩٥ ؛ ك. ر. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٦٩ – ٧٥ ؛ ج. خ.باکاییف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٦ –١٧٠ ؛ D. N. Mackenzi, Kurdish Dialects Studies , London , 1961 , PP. 85 – 87 , 177 – 180. ... هتد ) .

بەڵام سەرنج ڕاکێش ئەوەیە ، د. وریا عومەر ئەمین دەڵێ : "ڕێزمانی تەقلیدی چاوگی کردووە بە سەرچاوە و لێیەوە ڕەگی ڕابوردوو وەرئەگرێ بە لابردنی (ن)ی چاوگ ... بەڵام پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابوردوو و داهاتووی دەست نیشان نەکردووە . واتا ئەو یاسایانەی نەختۆتە ڕوو بە هۆیانەوە ڕەگی داهاتووی فرمان لە ڕابوردووی وەربگرێ " (کات و ڕەگی فرمان ، گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان" ، ژ ٦٥ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٧٨) ...

بەر لە هەرشت ئەو ڕاستییە دەخەمە پێش چاو ، کە وێکچوونێکی زۆر لە نێوان کەرەستە و بۆچوونەکانی ئەم وتارەی د. وریا و لاپەرە (٨٥ - ٨٧ ، ١٧٧ - ١٨٠)ی کتێبی ناوبراوی د. مەکەنزیدا هەیە .

وێڕای ئەوەی زۆربەی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بە دەیان ساڵ بەر لە د. وریا ئەو یاسایانەیان خستووەتە ڕوو ، کە بە هۆیانەوە ڕەگیان لە قەدی پێ وەرد ،گیرێ ، ئەوەش ڕوون و ئاشکرا دەبینرێ ، کە لێکۆڵینەوەکانیان لەوەی ئەو قووڵتر و وردتر و تێر و تەسەلترە و هەڵەشیان یەکجار کەمترە .

بەداخەوە ، ئاوڕنەدانەوە لەو خەرمانە بە بەرەکەتەی پێشڕەوان و پەلەکردن بوونەتە هۆی هەڵەی گەورە و ناتەوایی زۆری وتاری ناوبراوی د. وریا ؛

نووسەر لە سەرەتادا نووسیوێتی ؛ " لەم وتارەدا هەوڵ ئەدەین پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی کاتی ڕابوردوو و ڕەگی کاتی داهاتووی فرمانی کوردی بخەینە ڕوو . واتا ئەو یاسایانەی ئەشێ بە هۆیانەوە ڕەگی داهاتوو لە هی ڕابوردوو وەربگیرێ " (ل ٧٨)

بێگومان پێوەندیی مۆرفۆلۆژیی نێوان قەدی کردار و ڕەگی کردار - واتە ئەو یاسایانەی دەشێ بە هۆیانەوە ڕەگی لە قەدەوە پێ وەربگیرێ ، ڕێگەیێکی دروست و زانستانییە .

ئەوەتە د. وریا مەبەستی بووە لە ڕێگەی نیشاندانی پێوەندیی مۆرفۆلۆژیی نێوان قەدی کردار و ڕەگی کرداراوە زانیاریی نوێ بخاتە ڕوو و لەسەر ئەو ڕێگەیە نەڕوات ، کە چاوگی تێدا کراوە بە سەرچاوە ، کەچی لە سەرەتای هەر یاسایەکدا لە بریتی - ئەوەی لە ڕوانگەی قەدەوە بۆ ڕەگ بگەڕێ ، پەنجەی بۆ چاوگ درێژ کردووە - واتە بۆ ئەو شێوازەی خۆی بە " ڕێزمانی تەقلیدی" ناوی دەبا . چەند نموونەیێک ؛

• لە دەست پێ کردنی یەکەم یاسای دۆزینەوەی ڕەگدا وتوویە ؛ " گەر هات و چاوگەکە (یالی) بوو واتا (ی) تیا پێش (ن) دەرکەوت ڕەگی داهاتووی بە لابردنی (ی)بەکە دەس ئەکەوێ" (ل ٧٩) .

•"گەر چاوگەکە ئەلفی بوو " (یاسای دووەم ، ل ٧٩)

•"گەر چاوگەکە واوی بوو " (یاسای سێیەم ، ل ٧٩)

•"گەر فرمانەکە دالی بوو " (یاسای چوارەم ، ل ٨٠)

... و هەندێکی دی .

ئاتەواویی دیاری وتاری "کات و ڕەگی فرمان" ، ئەوەیە هەندێ یاسا باس نەکراوە و گەلێ قەد و ڕەگ ناو نەبراوە . بۆ نموونە ، ڕەگی چاوگی (زاین) و (خوێندن ، ژەندن) و (نەنگاوتن ، ئاخاوتن) و (داشتن) و (وەستن) و (کەیشتن ، ڕۆیشتن) و چەندینی دی ، کە هەندێکیان بەر یاسای تایبەتی دەکەون و بەشێکیان بیزۆکن ، یاددداشت نەکراون .

بەشێك لەو یاسایانەش ، کە باس کراون ، پڕ ئاتەواوین . بەوێنە لە بەشی (ب)ی یاسای دووەمدا وتراوە :

" ب- گەر فرمانەکە تێنەپەڕ بوو ڕەگی داهاتووی بە گۆڕینی (ا) بە (یْ) دەست دەکەوێ :

| چاوگ | ڕەگی ڕابوردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| سووتان | سووتا | سووتێ |
| گریان | گریا | گرێ |
| ترسان | ترسا | ترسێ" (ل٧٩) |

بەڵێ ئەوە دەستووریکی بەرچاوییە ، ئەگەر قەدی کرداری تێنەپەڕ کۆتایی بە دەنگی (ا) بێت ، بۆ وەرگرتنی ڕەگ لێیەوە (ا) دەکرێ بە (یْ) . وەك :

| چاوگ | ڕەگی ڕابوردوو | ڕەگی داهاتوو |
|---|---|---|
| گەڕان | گەڕا : گەڕام | گەڕێ : دەگەڕێم |
| خنکان | خنکا : خنکام | خنکێ : دەخنکێم |
| پسان | پسا : پسام | پسێ : دەپسێم |

... و گەلێکی دی .

لەم دەستوورەدا سێ کردار بیزۆکە : (وەستان ، گریان ، ترسان ) – واتە (ا) کەیان ناکرێ بە (یْ) ، بەڵکو لادەبرێ : (وەستا – وەست : دەوەستم ؛ گریا – گری : دەگریم ؛ ترسا – ترس : دەترسم ) .

## ڕێگەی بنەڕەتی

ڕێگە بنەڕەتی‌یەکە ئەوەیە ، کە زوربەی زۆری چاوگەکان ، ع تێنەپەڕ و ع تێپەڕ ، بە لابردنی (ن)ی چاوگ و دەنگەکەی پێشەوەی (ا ، ی ، وو ، د ، ت) پەیدا دەبن – واتە بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ان ، ین ، وون ، دن ، تن) . وەك :

تێنەپەڕ :

| ڕەگ | | نیشانەی چاوگ | | چاوگ |
|---|---|---|---|---|
| وەست : دە – وەست – م | - | ان | - | وەستان |
| لەرز : دە – لەرز – م | - | ین | - | لەرزین |
| چ : دە – چ – م | - | وون | - | چوون |
| مر : دە – مر – م | - | دن | - | مردن |
| کەو : دە – کەو – م | - | تن | - | کەوتن |

تێپەڕ :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| هێن : دە – هێن – م | - | ان | - | هێنان |
| کڕ : دە – کڕ – م | - | ین | - | کڕین |

*

د. وریا بۆ نموونەی ئەو دەستوورە ڕێك و پێکە لە نێو ئەو چەندین نموونە ڕاست و ڕەوانـەدا ، سێ هەڵگەی هێناوەتە ، کە دوانیـان (گریـا – گـری ، لرسـا – لـرس) بیزۆکـن و بـەر دەسـتوور ناکەون و ئاکە یەکێکیان (سوولا – سوولێ ) بەپێی یاساکە دەڕوات .

... و هەندێکی دی .

| | | | |
|---|---|---|---|
| × | | ور | |
| خوێندن | - | دن | - خوێن : ده - خوێن - م |
| گرتن | - | تن | - گر : ده - گر - م |

سەرپاکی چاوگە تێنەپەڕە بە (وون)و (دن) کۆتایی هاتووەکان و تێپەڕە (ین)یەکان و زوربەی زۆری تێنەپەڕی (ین)ی و تێپەڕی (ان)ی و کەمێکی تێنەپەڕی (تن) ، (ان) و تێپەڕی (تن) ، (دن) بەر ئەم دەستوورە دەکەون[111] :

١-ئەو چاوگانەی سەرپاکیان بەر ڕێگە بنەڕەتی‌یەکە دەکەون :

أ- تێنەپەڕی بە (وون) کۆتایی هاتوو :

| چاوگ | ڕەگ | | |
|---|---|---|---|
| چوون | چ[112] | : | دەچم |
| بوون | ب[113] | : | دەبم |

ب- تێنەپەڕی بە (دن) کۆتایی هاتوو :

| چاوگ | ڕەگ | |
|---|---|---|
| مردن | مر[114] | دەمرم |

(111) هیچ یەکێک لە چاوگە تێپەڕە بە (وون) کۆتایی هاتووەکان بەر ڕێگە بنەڕەتی‌یەکە ناکەون .

(112) ئێرانیی کۆن (شەف ، شیەف) ، ئاوێستا (شەف ، شیەف) .

(113) ئێرانیی کۆن (بو) ، ئاوێستا (بەف) .

(114) ئێرانیی کۆن و ئاوێستا (مەر) .

ج- تێپەڕی بە (ین) کۆتایی هاتوو :

| چاوگ | ڕەگ | | |
|---|---|---|---|
| کڕین | کڕ | : | دەکڕم |
| ماڵین | ماڵ[115] | : | دەماڵم |
| مژین | مژ | | دەمژم |
| نووسین | نووس[116] | : | دەنووسم |

| چاوگ | ڕەگ | | |
|---|---|---|---|
| دڕین | دڕ | : | دەدڕم |
| سڕین | سڕ | : | دەسڕم |
| چنین | چن | : | دەچنم |
| بڕین | بڕ | : | دەبڕم |
| دۆزین | دۆز | : | دەدۆزم |
| دۆشین | دۆش | : | دەدۆشم |
| سمین | سم | : | دەسمم |
| بەخشین | بەخش | : | دەبەخشم |
| پچڕین | پچڕ | : | دەپچڕم |
| زانین | زان[117] | : | دەزانم |
| ناژنین | ناژن | : | دەناژنم |
| بینین | بین[118] | : | دەبینم |

(115) ئێرانیی کۆن (مرد / ز) ، ئاوێستا (مەرز) .

(116) ئێرانیی کۆن (پەیس) .

(117) ئێرانیی کۆن و ئاوێستا (زان) ، فارسیی کۆن (دان) .

(118) ئاوێستا (ڤەئێنە / ڤەینە) ، هیندیی کۆن (ڤێنەتی) ، فارسیی ناوەڕاست (ڤێن) .

| | | | |
|---|---|---|---|
| پرسین | پرس[119] | : | دەپرسم |
| پشکنین | پشك | : | دەپشکنم |
| پۆشین | پۆش | : | دەپۆشم |
| تاشین | تاش[120] | : | دەتاشم |
| توانین | توان | : | دەتوانم |
| هاڕین | هاڕ | : | دەهاڕم |

... هتد .

٢-ئەو چاوگانەی زۆربەی زۆریان بەر ڕێگە بنەڕەتی‌یەکە دەکەون :

ا- تێنەپەڕی بە (ین) کۆتایی هاتوو .

| چاوگ | ڕەگ | |
|---|---|---|
| لەرزین | لەرز | دەلەرزم |
| تەزین | تەز | دەتەزم |
| ڕزین | ڕز | دەڕزم |
| کۆکین | کۆك | دەکۆکم |
| تەپین | تەپ | دەتەپم |
| وەڕین | وەڕ | دەوەڕم |
| خەنین | خەن | دەخەنم |
| خزین | خز | دەخزم |
| تۆقین | تۆق | دەتۆقم |
| تەقین | تەق | دەتەقم |
| لەقین | لەق | دەلەقم |
| چەقین | چەق | دەچەقم |
| فڕین | فڕ | دەفڕم |

(119) ئێرانیی کۆن (پرس) ؛ ئاوێستا (فرەس) ؛ فارسیی کۆن (فرەس) .

(120) ئێرانیی کۆن (تاخش) ؛ ئاوێستا (تاش ، تەشە) ؛ هیندیی کۆن (تەکش) .

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕوانین | ڕوان | : | دەڕوانم |
| بەزین | بەز[131] | : | دەبەزم |

... و گەلێکی دی

**تێبینی :**

لە کۆمەڵە چاوگی تێنەپەڕی بە (ین) کۆتایی هاتوودا ، تەنیا (ژین) و (زاین) بەر دەستووره بنەڕەتی‌یەکە ناکەون .

ب- تێپەڕی بە (ان) کۆتایی هاتوو :

| چاوگ | رەگ | | |
|---|---|---|---|
| هێنان | هێن | : | دەهێنم |
| پێوان | پێو | : | دەپێوم |
| گێڕان | گێڕ | : | دەگێڕم |
| کێڵان | کێڵ[132] | : | دەکێڵم |
| شێلان | شێل | : | دەشێلم |
| بێژان | بێژ[133] | : | دەبێژم |
| وێران | وێر[134] | : | دەوێرم |

... هتد .

(131) ئێرانیی کۆن و ئاوێستا (فمز)

(132) ئێرانی کۆن و ئاوێستا (کمر)

(133) ئێرانیی کۆن و ئاوێستا (فمك)

(134) ئێرانیی کۆن و ئاوێستا (فمر)

ب)پاشگری (-ۆك ، -نۆك ، -ۆك / -ۆکە) هەر بە ڕەگی کرداری تێنەپەڕەوە دەلکێن .

ج)پێشگری (نە - ، پێ -) و پاشگری (-ەك ، -دە / -یدە ، -ە ، -ش / -شت ، -گە / -گا ، -مێ) لەگەڵ ڕەگی هەردوو کرداری تێپەڕیش و تێنەپەڕیش ڕێك دەکەون .

د)پاشگری (-وو) لەگەڵ کرداری کارا بزردا دێت .

ە)پێشگری (بە - ، نە -) و پاشگری (-مر ، -ا ، -یار ، -گا ، -نۆك ، -ندە ، -نە / -یدە) لەگەڵ ڕەگدا ناوی کارا سازدەکەن . پاشگری (-وو) یاریدەی ڕۆنانی ناوی بەرکار دەدا . پاشگری (-ست ، ش / -شت ، -اك) لە پێکهێنانی ناوی چاوگدا بەشداردەبن . پاشگری (-گە / -گا ، -مێ) کەرەستەی ناوی جێگەن . پێشگری (پێ -)و پاشگری (-ك lk - ، -کە ، -نگ ، -ۆکە)ش لە دروست کردنی ناوی ئامێردا بەشداری دەکەن .

پاشگری (-ۆك ، -ەك) دەبنە کەرەستەی ناوی کاراش و ناوی ئامێریش . پاشگری (-ە)ش هی ناوی کارا و ناوی چاوگ و ناوی ئامێر .

ز)پاشگری (-وو ، -ە ، -کار ، -گە / -گا) لەگەڵ ئەوەدا ، کە لەگەڵ ڕەگی کردارا دێن ، لە هەمان کاتدا دەکەونە دوا قەدیشەوە .

١٩)وشەی واتادار و ڕەگ پێکەوە ناوی کارا و ناوی بەرکار و ناوی ئامێر سازدەکەن و ناوی چاوگ و ناوی جێگا پێك ناهێنن . وشە واتادارەکەی ناوی کاراش دەشێ (ناو) ، یان (ناوەڵناو) ، یان (ناوەڵکردار) بێ ؛ هی ناوی ئامێر (ناو) ، یان (ناوەڵکردار) ؛ ئەوی ناوی ئامێریش تەنیا (ناوەڵکردار) .

# رێژه و كات

رێژه بەو حاڵەتە رێزمانییە دەوترێ ، كە پێوەندیی ڕوودان (یان هەل و مەرج) بە واقیعەوە دەردەبڕێ . رێژه یەكێكە لە فۆرمە بنەڕەتییەكانی دەربڕینی پێوەندیی گوزارەیی . بۆ تەواو دیاری كردنی ، دەبێ ئەوەش لەیاد نەكەین ، كە رێژه وەنەبێ پێوەندیی خودی ڕوودانەكە بە واقیعەوە ڕابگەیەنێ ، بەڵكو ئەو پێوەندییە نیشان دەدا ، كە وا لە ڕستەدا لە نێوان ڕوودان و كارادا پەیدا دەبێ .

لە زمانی كوردیدا ڕاست وایە تەنیا ئەو رێژانە جیابكەینەوە ، كە لە ڕووی وشەسازییەوە جیاوازییان لە نێواندا هەیە و بە فۆرمی پێكهاتن یان شێكاری دەردەبڕرێن .

جیاوازیی پرسیار و ئەرێنی (مثبت) ، یان ئەرێنی و نەرێنی (منفی) سەر بەو بواری واتایەن ، كە رێژه ڕایان دەگەیەنێ ، چونكە هەموو ئەو جیاوازییانە بریتین لە جیاوازیی پێوەندی بە واقیعەوە . بەڵام لە زمانی كوردیدا نە پرسیار بە ئاوازی تایبەتی ڕادەگەیەنرێ یان بە یاریدەی ئامرازی پرسیار دەردەبڕێ ( ڕوونكردنەوەی پێوەندیی ئەو كەرەستانە دەكەوێتە باسی ڕستەسازییەوە ) . بەڵام جیاوازیی ئاواز خاسیەتی سەرپاكی ڕستەكە دیاری

دەکا ، نەك چەند ئەندامێکی (ئاواز – واتە گۆڕینی دەنگ لە بەرز و نزمیی دەربڕینی وشەیەکدا دەشێ تەنیا لە ڕێی پێوەندیی گۆڕینی هێز و ئاوازی دەنگەوە لە سەرلەبەری ڕستەیەکدا دیاری بکرێ) . سەرباری ئەوەش ، وەنەبێ گۆڕینی ئاواز تەنیا پێوەندیی بە واقیعەوە ڕابگەیەنێ ، بەڵکو چەند لایەنێکی دیش دەگرنەوە ... ئامرازی پرسیاریش ناتوانرێ وەك ماکێکی پێکهێنێنی فۆرمی کردار تەماشا بکرێ (تەنانەت لە ڕووی شێکارییشەوە) ، چونکە مەرج نی یە تەنیا بە کردارەوە بەندبێ ، بەڵکو دەشێ بە هەر ئەندامێکی ڕستەوە پێوەند بێ . هەرچی نەرێتییشە ، وەك پرسیار بە یاریدەی ئامراز ڕادەگەیەنرێ . هەروەها وەنەبێ تەنیا بە فۆرمی کردارەوە بەندبێ و وەك ماکێکی پێکهێنێنی فۆرمی کرداریش خۆی نانوێنێ .

بەڵام فۆرمی کردار بە نیشانەی (بـ - bi)ەوە بە ڕێژەیێکی تایبەتی دادەنرێ ، ئەویش بە پێی ئەو بەڵگەیەی کە ئەو نیشانەیە لە ڕستەدا هەر دەورێك ببینێ ، هەمیشە پێوەندی بە فۆرمی کردارەوە هەیە ، نەك بە وشەیێکی دیکەوە .

لە دیاریکردنی ڕێژەدا پێویستە ئەو فۆرمە جیاوازانەی کردار لەبەرچاو بگیرێن ، کە پێوەندیی ڕوودان بە واقیعەوە ڕادەگەیەنن . کەچی زوو لە لێکۆڵینەوەی هەندێ زماندا بە ڕێژەیێکی نەناسراو تەماشا دەکرا [191]. تا ماوەیێکی درێژیش هەر بەو چەشنە باو بوو . بەڵام لە ڕاستیدا چاوگ تەنیا ناوی ڕوودانێك ڕادەگەیەنێ و پەنجە بۆ پێوەندیی ڕوودان بە واقیعەوە ڕاناکێشێ .

---

[191] هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردیش چاوگیان بە ڕێژەیێکی کردار داناوە ، بەوێنە بڕوانە : تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، بەرگی دووەم ، ل ۹ – ۱۰ ...

لە دەست نیشان کردنی ڕێژەکانی کردار لە زمانی ؟وریدا ناتوانین ئەو فۆرمانەی خاوەنی یەک پێکهاتنی ڕێزمانین بە ڕێژەی جیاواز دابنێین ، ئەگەرچی پێوەندیی جیاوازی ڕوودانیش بە واقیعەوە ڕابگەیەنن . چونکە ئەم حاڵەتە مەسەلەی واتای جۆربەجۆری یەک ڕێژەیە . بۆ موونە یەک گرتنی فۆرمی ڕابوردوو لەگەڵ نیشانەی (بـ - bi)دا واتای مەرج ش و ئارەزووش ... دەدا [١٩٢] . بەڵام جیاوازیی وشەسازی لە نێوان ئەو حاڵەتان دا نییە و بۆیە ئێمە ئەو فۆرمانە وەک یەک ڕێژە تەماشا دەکەین و واتای جۆ بەجۆریان ناکەینە بنەمای جیاوازیی ڕێژەیان .

لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا لە ڕووی وشەسازییەوە دەتوانین سێ ڕێژە جیابکەینەوە : (١-ئیخباری ؛ ٢-ئینشائی ؛ ٣-داخوازی) [١٩٣].ئەم سێ ڕێژەیە لەگەڵ یەکتردا خاوەنی یەک پێوەندی نین . هەروەها دەشێ ڕێژەی ئیخباری بە ڕێژەی ڕاستەوخۆ ناوبەرێ و دوو ڕێژەکەی دیش بە ڕێژەی تیان .

---

(١٩٢) لەسەر ئەم بنەمایە هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ڕێژەی مەرجی و ئیحتیمالی و ئیلزامی ... یان جیاکردووەتەوە (بەونە بڕوانە : د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٣٧ – ٣٨ ؛ نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٦١ – ١٧١؛ زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٤ – ٣٩ ؛ ق. کوردۆییف ، دەستووری زمانی کوردی – بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٦٤ – ٢١٠ ؛ ک. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٨٤ – ٩٣ ؛ ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٦٤ – ٦٩ ...)

(١٩٣) زانایان لە کرداری ئێرانیی کۆندا چوار ڕێژە (١-ئیخباری ؛ ٢-ئینشائی ؛ ٣-فەرمیی – ئیحتیمالی – مەرجی ؛ ٤-داخوازی)یان جیاکردووەتەوە و هەندێ جاریش (ئارەزوو و قەدەغە)شیان لەگەڵیان دادەنێن ، کە ئەمەیان پتر تایبەتییەکی بەکارهێنانی کاتی ڕابوردووە (بڕوانە : ڕ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٦٤).

لە هەندێ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و زمانانی دیدا وا نیشان دراوە ، ڕێژەی ئیخباری ئەوە ڕادەگەیەنێ ، کە لە ڕاستیدا ڕوو دەدات یاخود ڕووی داوە . ئەم جۆرە دیاریکردنە ناتەواوە . لە ناوەرۆکی ڕێژەی ئیخباریدا پێوەندیی ڕوودان بە واقیعەوە ڕاناگەیەنرێ . ئەگەر ئەم پێوەندییە لە ڕستەدا ڕابگەیەنرێ ، ئەوە بە هۆی فۆرمی ئیخبارییەوە نییە ، بەڵکو بە وەسیلەی دییە – واتە بە یاریدەی وشەی سەر بە بار و دۆخ یان ئامراز یان ئاواز . دوو ڕێژەکەی دی بە تەواوی نیشانی ئەوە دەدەن ، کە لە واقیعدا هیچ ڕووی نەداوە ، بەڵام دەبێ شتێك ڕووبدات ، یاخود دەبوایە لە بار و دۆخێکی زانراودا ڕووی بدایە .

لە ڕووی وشەسازییەوە ڕێژەی ئیخباری هیچ نیشانەیێکی تایبەتی نییە ، بەڵام لەوەدا لە ڕێژەکانی دی جیا دەبێتەوە ، کە ڕێژەی ئیخباری بە ڕێك و پێکی بە پێی کات دەگۆڕێ ، بەڵام ڕێژەکانی دی بەو شێوەیە نین .

ڕێژەی ئینشائی بەر لە هەر شت ئەو ڕوودانە ڕادەگەیەنێ ، کە لە واقیعدا بەجێنایەت ، بەڵام لە هەل و مەرجێکی ناسراودا دەکرا بەجێ بێت یان بەجێ بهێنرێت . لەبەر ئەوەی ئەو فۆرمە تەنیا ڕوودانێك ڕادەگەیەنێ ، کە لە هەل و مەرجێکی ناسراودا بەجێ بێت ، بۆیە زاراوەیێکی بێ لایەنی (ئینشائی)مان بۆ پەسەند کرد ، ئەگەرچی دەشزانین (modus conlunctivus)ی لاتینی واتای (ڕێژەی بەیەك گەیاندن ، بەیەکەوە بەستن ) دەگەیەنێ .

(بـ – bi) کە نیشانەی هەرە گرنگی ڕێژەی ئینشائییە لە کرداری (بوون)ەوە وەرگیراوە (ڕەنگە ڕەگی کاتی ئێستای کردارەکە بێت) .

ڕێژەی داخوازی لە ڕووی کاتەوە تەنیا ئێستا و ئایندەی هەیە و ڕابوردووی نییە . لە ڕووی کەسەوە تەنیا فۆرمی کەسی دووەمی تاك و کۆی هەیە و کەسی یەکەم و سێیەمی نییە . ئەم ڕێژەیە نیشانە و پێکهاتنی تایبەتیی خۆی هەیە .

* *

کات وەك دەوروبەر یەکێکە لە فۆرمەکانی هەبوونی واقیعی جیهان . بە باوەڕی ئێنگلس " کرۆکی دەوروبەر و کات فۆرمی بنەڕەتیی هەموو هەبوونێکن : هەبوون بەبێ کات هەمان بێ داناییی گەورەی هەبوونە بە بێ دەوروبەر " [194]. ف. ئی. لینینیش گەشەی بەم رایە داوە و وتوویە : " ... چۆن شت و تەن دیاردەی سادە و کۆمەکی دەرك نین ، بەڵکو واقیعی مەوزوعین و کار دەکەنە سەر هەستمان ، بە هەمان چەشن دەوروبەر و کاتیش فۆرمی سادەی دیاردە نین ، بەڵکو فۆرمی واقیعیی مەزووعیی هەبوونن . لە جیهاندا جگە لە ماددەی بزوێن هیچ شتێکی دی نییە و ماددەی بزوێنیش بە بێ دەوروبەر و کات ناتوانێ ببزوێ " . [195]

لە پێکهاتنی وشەسازیی زمانی کوردیدا پێوەندیی دەوروبەر بەتایبەتی لە فۆرمی جۆربەجۆری کاتی کرداردا بەباشی دەبینرێ . بەم جۆرە کاتی رێزمانی وەك یەکێك لە فۆرمەکانی ڕەنگدانەوەی واقیعیی مەزووعیی هەبوونی کات لە زماندا خۆی دەنوێنێ .

ئێمە لە هەر هەواڵێك لە ڕووی پێوەندی بە کاتەوە وردبیینەوە ، هەمیشە کەڵك لە مەودای جیابوونەوە وەردەگرین . لە رێزماندا ئەو مەودای جیابوونەوەیە بریتییە لە دەمی ئاخاوتن . بەپێی ئەو بۆچوونە دەشێ بڵێین کاتی رێزمانی بەندە بە هۆش و ئاگای ئاخێوەرەوە . کاتی ئێستا وەك یەك کەوتن لەگەڵ دەمی ئاخاوتندا تەماشا دەکرێ . کاتی رابوردوو - وەك پێش ئەو دەمە ؛ کاتی ئایندەش وەك دوای . لە ڕاستیدا جیاکردنەوەی کاتەکانی رێزمانی بەپێی مەبەستی ئاخێوەر (یان نووسەر) دیاری دەکرێن . با تەماشای ئەو نموونەیە بکەین :

[194] ف. ئێنگلس ، دژی دیورینگ ، چاپی ١٩٥٠ ، ل ٤٩ .

[195] ف. ئی. لینین ، کارە کۆکراوەکانی ، ب ١٤ ، ل ١٦٢ .

خۆ تاکو دەمرم لێم نابێتەوە
کەواتە ، واتەی چیم لێ بێتەوە
(پیرەمێرد ، ل ١١٠)

ئەم وشانە بۆ ئەو دەمەی پیرەمێرد نووسیونی ، کاتی ئایندەیان ڕاگەیاندووە ( واتە - دوای نووسینی وشەکان ) ، بەلاّم بۆ ئێمە بوونەتە ڕابوردوو . لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ، ئەوە لەبەرچاو بگرین ، کە خودی دەمی ئاخاوتن دەمێک نییە خۆیەکیەتی دیاریبکرێ و بە تەواوی پێوەندی بە هۆش و ئاگای قسەکەرەوە هەبێ ، بەڵکو ڕەنگدانەوەی پێوەندیی هەبوونی مەوزووعی‌یە بە بێ ئاخێوەر . دەمی ئاخاوتن ، واتە ئەو دەمەی شتێك دەوترێ یان دەنووسرێ و بەپێی کاتی ڕوودان هاوجووت دێن و کاتی ئێستا ڕادەگەیەنێ . ئەوەی پێشیشی دەکەوێ کاتی ڕابوردووە و ئەوەش کە بە دوایدا دێ کاتی ئایندەیە . هەرچی دەمە پێوەندی هەر بە هۆش و ئاگای قسەکەرەوە نییە ، بەڵکو بەو کەسانەشەوە هەیە کە ڕووی قسەکردنیان تێ دەکرێ . ئەم دەمەش بەپێی تێپەڕبوونی مەوزووعیی کاتەوە دەشێ بە تەواوی دیار بێ .

بۆ لێکۆڵینەوەی کاتی ئێستا لە باری واتاوە ، بەر لە هەر شت پێویستە سنوور لە نێوان کاتی ڕەها (المطلق)و پێوەند (النسبي) دابنرێ . کاتی ڕەها ڕاستەوخۆ پێوەندیی پرۆتسێس بە دەمی ئاخاوتنەوە ڕادەگەیەنێ . کاتی پێوەند پێوەندیی پرۆتسێس بە کاتەوە وا ڕادەگەیەنێ ، کە جێبەجێ بوونی پرۆتسێسێك بە کردارێکی دی دەربڕدرابێ . بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو فۆرمە لە بارێکدا دەتوانێ واتای کاتی ڕەها بدا و لە بارێکی دی‌دا واتای کاتی پێوەند بگەیەنێ . هەرسێ کاتە بنەڕەتی‌یەکەی زمانی کوردی ، بەر لە هەر شت واتای ڕەهایان هەیە ، بەلاّم لە حالاّتی دیاری کراودا دەتوانن واتای پێوەندیش ڕابگەیەنن . پێویستە سنوور لە نێوان بەکارهێنانی کات لە ڕستەی سەرەکی و

ڕستەی شوێنکەوتوودا دابنرێ . واتای کاتی پێوەند بە زۆری لە ڕستەی شوێنکەوتوودا دەردەکەوێ .

کاتی ئێستا پتر خاوەنی واتای جۆربەجۆرە . دوو واتای بنەڕەتی هەیە : یەکەم – ڕووداوێك ڕادەگەیەنێ ، کە لەگەڵ دەمی ئاخاوتندا یەك بکەوێ ؛ دووەم – ڕووداوێك ، کە بە بەردەوامی جێبەجێ دەکرێ ، لە گشت کاتێکدا و لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ دەمی ئاخاوتندا یەك دەکەوێ .

کاتی ئێستا لەتەك ئەو دوو واتا بنەڕەتییەدا ، گەلێ جاریش بۆ دەربڕینی ڕووداوێك بەکاردێنرێ ، کە لە ڕابوردوودا ڕووی دابێ ، یان بۆ ڕووداوێك کە لە ئایندەدا ڕوو بدات . بەکارهێنانی کاتی ئێستا بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵێك ، کە لە زوودا ڕووی دابێ ، زیندوویەتییێکی گەورە بە گێڕانەوەی چیرۆك دەدات و لە لاتینیدا بۆ ئەم جۆرە دەربڕینە زاراوەی (Praesens historicum) – واتە ( کاتی ئێستای مێژوویی ) بەکاردەبرێ .

کاتی ئێستا هەروەها بۆ دەربڕینی واتای کاتی ئایندەش بەکاردێنرێ : (سبەینێ دەچین بۆ سەیران ) . وشەی بار و دۆخی (سبەینێ) بە ئاشکرایی ڕوودان لە ئایندەدا نیشان دەدا .

کاتی ئایندەش بۆ ڕاگەیاندنی کاتی ڕابوردوو بەکاردێنرێ . کاتی ڕابوردووش وێڕای واتای ڕاستەوخۆی ، کە ڕاگەیاندنی ڕوودانی بەسەرچووە ، هەروەها دەتوانێ کاتی ئێستا یان ئایندەش نیشان بدا .[196]

---

(196) لە بەشێکی زۆری ئەو لێکۆڵینەوانەدا ، کە لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە نووسراون ، لەلەك ئاتەواوی و جیاوازی لە دیاری کردنی کاتەکانی کرداردا ، هەڵەی تێکەڵ کردنی کات و ڕێژەش بەدی دەکرێ . مامۆستا سەعید صدقی کابان لە لاپەڕە (35)ی کتێبی (مختصر صرف و نحوی کوردی "(1928)"دا ڕاست کرداری لە ڕووی کاتەوە بەسەر سێ جۆردا ، "1-ڕابوردوو (ماضی) ؛ 2-ئێستە (حال) ؛ 3-لەمەوپاش (استقبال) " دابەش کردووە ، بەڵام لە لاپەڕە (36)دا ، کە دەڵێ "فعل – چوار قسمە 1-فعل ماضی ؛ 2-فعل حاڵ ؛ 3-فعل استقبال ؛ 4-فعل امر " ، ئەوە ڕێژەی داخوازی تێکەڵ بە کات کردووە . بەدوا ئەمەشدا ، کە پێنج جۆری ڕابوردووی باس کردووە ؛ "ماضی پێنج نەوعە – 1-ماضی

-

لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا ئەگەرچی کرۆکی گەردانی ئێرانیی کۆن دەبینرێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی ڕێژە و کاتی کردار گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە .[197]

---

▪

شهودی ؛ ٢- ماضي نقلي ؛ ٣-ماضي استمراري ؛ ٤-ماضي بعيد ؛ ٥-ماضي انشائي " (ل ٣٦) ، ڕێژەی ئینشائی ، کە باسێکی سەربەخۆیە بەکاتی ڕابوردووی داناوە .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی "ڕێزمانی کوردی" (١٩٦٠)دا لە ژێر سەرناوی "ئەمەکانی کردارها" نووسیویە :

"فرمان لە زمانی ئێمەدا ، بەپێی ئەو دەمانەی کە لیا ڕوونەدا ، ئەتوانرێ بکرێ بە سێ بەشی سەرەکیی‌یەوە :

١-فرمانی ڕابوردوو

٢-فرمانی ئادێ

٣-فرمانی داخوازی " (ل ١٦١) .

... "فرمانی ڕابوردوویش پێنج بابەتی هەیە "١-فرمانی شهودی ، ٢-فرمانی نزیک ، ٣-ڕابوردووی دوور ، ٤-ڕابوردووی ئیستیمراری ، ٥-ڕابوردووی ئینشائی " (ل ١٦١ – ١٧١) بە هەمان جەشنی مامۆستا سەعید صدقی کابان کات و ڕێژەی تێکەڵ بە یەک کردووە .

د. نسرین فەخری لە نامەی دوکتۆرییەکەیدا ، بۆ کاتی ڕابوردوو پێنج جۆری دیاری‌کردووە : ١-ڕابوردووی سادە ؛ ٢-ڕابوردووی بەردەوام ؛ ٣-ڕابوردووی تەواو ؛ ٤-ڕابوردووی دوور ؛ ٥-ڕابوردووی دێرین (کورتەی نامەی دوکتۆری ، ل ١٧)و جۆری دواییان ، واتە (ڕابوردووی دێرین) لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێ .

... هتد .

[197] ر. ل. تسابۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٦٤ .

---

-١-

# ڕێژەی ئیخباری

لە زمانی کوردیدا کردار لە ڕێژەی ئیخباریدا لە ڕووی کاتەوە بەسەر دوو جۆری بنەڕەتی‌دا دابەش دەکرێ :

١-کاتی ڕانەبوردوو .

٢-کاتی ڕابوردوو .

## کاتی ڕانەبوردوو

کرداری ڕانەبوردوو ئەو کردارەیە ، کە پرۆتسێسی ڕوودانێک لە دەمی ئاخاوتن یاخود دوای ئاخاوتندا نیشان دەدات .

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا کردار ﻉ تێ‌پەڕ بێ و ﻉ تێ‌نەپەڕ ، ﻉ سادە و ﻉ دارێژراو و ﻉ لێکدراو بۆ پێکهێنانی فۆرمی ڕانەبوردووی نیشانەی (دە / ئە)[١٩٨] دەخرێتە پێش ڕەگی کاتی ڕانەبوردوویەوە و بەدوا ڕەگەکەشیدا جێناوی لکاوی جۆری بێ هێز دادەنرێ . وەک :

[١٩٨] لە زمانە ئێرانیکاندا نیشانەی (دە / ئە) بۆ کاتی ڕانەبوردوو بەرچاونەکەوتووە ، بەڵام لە زمانی بلووجیدا لە کاتی ڕابوردووی بەردەوامدا (ئە) هەیە ، کە شێوەی مۆرفێمی (ئەک)ە ، وەک : "مان – ئە – کورت – ون" (من – ئە / دە – م – کرد) (بڕوانە : ف. ئا. فرۆلۆف ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤٩) .

| چاوگ | | | نیشانە | ڕەگ | جێناو | کرداری ڕانەبوردوو |
|---|---|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | سادە | گرتن<br>کردن | دە / نە<br>دە / نە | گر<br>کە | م ... ین ...<br>م ... ین ... | دەگرم / نەگرم ... دەگرین / نەگرین ...<br>دەکەم / نەکەم ... دەکەین / نەکەین ... |
| | داڕێژراو | داگرتن<br>ڕاکردن | دە / نە<br>دە / نە | گر<br>کە | م ... ین ...<br>م ... ین ... | دادەگرم / دانەگرم ... دادەگرین / دانەگرین ...<br>ڕادەکەم / ڕانەکەم ... ڕادەکەین / ڕانەکەین ... |
| | لێکدراو | ڕێکگرتن<br>بەخێوکردن | دە / نە<br>دە / نە | گر<br>کە | م ... ین ...<br>م ... ین ... | ڕێکدەگرم / ڕێک نەگرم ... ڕێک دەگرین / ڕێک نەگرین<br>بەخێودەکەم / بەخێو نەکەم... بەخێو دەکەین/بەخێو نەکەین |
| تێنەپەڕ | سادە | کەوتن<br>بوون | دە / نە<br>دە / نە | کەو<br>بـ bi | م ... ین...<br>م ... ین... | دەکەوم / نەکەوم ... دەکەوین / نەکەوین<br>دەبم / نەبم ... دەبین / نەبین |
| | داڕێژراو | هەڵکەوتن<br>دابوون | دە / نە<br>دە / نە | کەو<br>بـ bi | م ... ین...<br>م ... ین... | هەڵ دەکەوم / هەڵ نەکەوم ... هەڵ دەکەوین / هەڵ نەکەوین<br>دادەبم / دانەبم ... دادەبین / دانەبین |
| | لێکدراو | سەرکەوتن<br>ئازادبوون | دە / نە<br>دە / نە | کەو<br>بـ bi | م ... ین...<br>م ... ین ... | سەردەکەوم / سەرنەکەوم... سەردەکەوین / سەرنەکەوین<br>ئازادەبم / ئازاد نەبم... ئازادەبین / ئازاد نەبین |

لە دیالێکتی ژووروشدا بە هەمان چەشنی دیالێکتی خوارووە و تەنیا ئەوەندە نەبێ کە گۆڕانێکی کەمی فۆنەتیکی بەسەر نیشانەکەدا دێت و دەبێتە (د – di) [١٩٩]

| چاوگ | | نیشانە | ڕەگ | جێناو | کاتی ڕانەبوردوو |
|---|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | نڤیسین | د di<br>دێ | نڤیس | م... ن... | دنڤیسم ... دنڤیسن<br>دێنڤیسم ... دێنڤیسن |
| تێنەپەڕ | کەتن | د di<br>دێ | کەڤ | م... ن... | دکەڤم ... دکەڤن<br>دێکەڤم ... دێکەڤن |

فۆرمی کاتی ڕانەبوردوو دەکرێ بۆ ئەم مەبەستانە بەکاربهێنرێ :

١–پرۆتسێسی ڕوودان لە کاتی ئاخاوتندا :

من گریە ، ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین
من لەعلی بەدەخشان و ، ئەتۆ لوئلوئی لالا

(نالی ، ل ١١٥)

لەو کێوە بەرزە ئەکەویە خوارێ
ڕیزە مرواریت لە دەم ئەبارێ

(پیرەمێرد ، ل ١٢٢)

---

[١٩٩] لە هەندێ بەشە دیالێکتی ژووروودا (د – di) ناوترێ و هەر وەک دیالێکتی خوارووی (دە) بەکاردێنرێ . بەوێنە کوردەکانی تورکمەنستان و ئازەربایجان دەڵێن :

ئەز دەکەڤم

(بڕوانە : ق. خ. باکایێڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٧٦ )

ئەبلەھ دبینم وی ھەلا

ھەرچی ژ دل بت یاری چەرخ

(جزیری ، ل ١٩٠)

٢-پرۆتسێسی ڕوودان لە کاتی ئایندەدا :

کە بادی یەئسی خۆمم بردە لا ، ئەم عارفە توند بوو

وتی ئاخر سبەینێ جەژنە ، خوێنی تۆ لە پێ دەگرم

(مەحوی ، ل ٢١٨)

گەر تەطرە خۆی بەمان خوێنت نەکرێتە کاسە

ژیانی کامەرانی بە ھەوڵ و ڕەنجی شانە

(بێکەس ، ل ٦٤)

مویەکی ئەز ژ تە نادم بە دوو سەد زین و شرینان

چ دبت گەر تو حەسێب کی م ب فەرھاد و مەمێ

(جزیری ، ل ٤٣٢)

٣-گێڕانەوەی ڕوودانێك لە ڕابوردوودا ڕووی دابێ :

پار کە لە شەقلاوە بووم لەبیر دەبینم ئازاد بەرەو پیرم دێ

٤-پرۆتسێسی درێژەپێدان و بەردەوامی و دووپاتبوونەوە :

ئەی باڵداری ئێسك سووك ،
بلبلی دەنووك بچووك ،
باغچە بە باغچە ئەفری ،
(گۆران ، ل ١٠٢)

جۆگەی ناوەکان تیایا فەتیس ماو
هەر ئەڕۆن ناگەن پێچی شاخ تەواو .
(گۆران ، ل ١٢٧)

باریك و لووس و نازگ وەك زولفی خاوی بادا
وەك شاخی گوڵ بە لادا ، شیرین ئەشی دەرێنێ
(وەفایی ، ل ١٩٣)

بیست و حەوت ساڵە بە بێ زیاد و کەم
ئەپارێمەوە ، هەر هاوار ئەکەم
(بێکەس ، ل ٧٧)

هەموو ڕۆژێ لەبەر سەیری بتی ئەو بەژن و باڵایە
لەسەر ڕێیدا ئەوەستم من ، هەتاکو ناوی پێم دایە
(هەردی ، ل ٧٧)

ئێستاش ئەو پڕ کار دەکن

٥-پرۆتسێسی ڕوودانی کارێك ، کە ڕاستی‌یێك نیشان بدا . ئەو ڕاستی‌یەش دەشێ هەمیشەیی بێ و هەر سێ کاتەکە (ئێستا و ئاینده و ڕابوردوو) وەك یەك بگرێتەوە :

تا پیرێ نەمرێ ، هەزار جوان نەمرێ .

(پەندی پێشینان ، ل ١٤٦)

سۆزی شمشاڵ ئەخەمە کار دەمی ئێواران :

پۆل پۆل ئافرەت ، شێردۆشی جوان ، ئەکشێ بۆ ناو ڕان !

(گۆران ، ل ٥٠)

منداڵ حەز لە یاری دەکا

دەوڵەمەند باش دەژی

ئەم شیرێ پێژ تو ئالێ کانیێ ڤەدخون ، ئەم ژ نەخوشیێ ناترسن .

... هتد (٢٠٠)

کاتی ڕانەبوردووش دوو جۆرە :

ا-کاتی ئێستا .

ب-کاتی ئاینده .

لە بەشێکی زۆری زمانەکانی جیهاندا ئەو دوو کاتە (ئێستا و ئاینده) فۆرمی جیاوازیان هەیە . لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا لە ڕووی فۆرمەوە جیاوازی لە نێوان فۆرمی کاتی ئێستا و کاتی ئاینده‌دا نییە و هەردووکیان

---

(٢٠٠) شایانی باسە ، بەتایبەتی مامۆستایان ، نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، ل ١٧٧ ؛ د. زاورێ یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، ل ٩٥ - ٩٦ ؛ ج. خ.باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٧٧ - ١٧٨ ... باسی بەشێک لەو بەکارهێنانەی فۆرمی کاتی ڕانەبوردوویان کردووە ... هەندێ لە نموونەکانی کرمانجیی ژووروم لە باکاییڤەوە وەرگرتووە ...

هەر یەک قاڵبیان هەیە و جیاکردنەوەیان یان لە ڕستەدا ،هەرەکەوێت یان بە هۆی باری دەوروبەرییەوە ئاشکرا دەبێت ، یان لە ڕێی بەکارهێنانی وشەی تایبەتییەوە ڕوون دەبێتەوە [٢٠١]. بەڵام لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا نەک هەر بە ئاسانی جیاوازی لە نێوان فۆرمی کاتی ئێستا و کاتی ئایندەدا دەکرێ ، بەڵکو بۆ جیاکردنەوەیان نیشانەی مۆرفۆلۆژییش هەیە .

لە کرمانجیی خوارووودا بۆ جیاکردنەوەی کاتی ئێستا و کاتی ئایندە هیچ نیشانەییەکی وشەسازی نییە . جیاکردنەوەیان بە ڕێگەی لێکسیکی - واتە بە یاریدەی هەندێ وشە (بەتایبەتی ئاوەڵکردار)ەوە مەبەست دەردەبڕێ .

بەوێنە بۆ پتەوکردن و نیشاندانی بەجێهێنانی پرۆتسێسی ڕوودان لە دەمی ئاخاوتندا گەلێ جار (وا ، ئەوا ، ئێستا ، هەنووکە ...) بەکاردێنرێ . وەک :

وا دێم

ئەوا دێم

ئێستا دێم

هەنووکە دێم

... هتد .

فێری فرمێسکمە گولاڵەی دەورم

وا لە داخی تۆ بێهۆشا ئەمرم

(پیرەمێرد ، ل ١٦٣)

---

[٢٠١] زمانی ئێرانیی کۆن و فارسیی ناوەڕاست و فارسیی تازە کاتی ئایندەیان پاراستووە (بڕوانە : د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٤٤) .

ـۆ بەجێهێنانی کارێکیش لە ئایندەدا وشـە و دەستەواژەی وەك :
(سـ ـەینێ ، دووسبەی ، بەیانی ، دووبەیانی ، ساڵێکی دی ، ساڵێکی تر ،
هاو ـێ ، بەهارێ ، ئەم هاوینە ... تۆزێکی تر ، پاش ماوەیەك ... )
بەکاردێنرێ . وەك :

ساڵێکی دی دەڕۆم بۆ هەندەران
تۆزێکی تر دەنووم .
... هتد .

بۆ یەك شەو لای دایە ئەم دێکیە ڕێی وێڵم ،
بەیانی ، ڕۆژهەڵات ، سوار ئەبم جێی دێڵم ...

(گۆران ، ل ٢٦)

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا وەك وتمان ، بۆ جیاکردنەوەی کاتی
ئێستا و کاتی ئاینده نیشانەی وشەسازی هەیە :

*کاتی ئێستا :
نیشانەی (د – dI) + ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار + جێناوی لکاوی
بێهێز :

ئەز دنڤیسم = د + نڤیس + م
ئەز دکەڤم = د + کەڤ + م
ئەز گورا ژنا خوە دکم ...

(کوردۆ ، ل ٤٥)

مەمێ گۆت : "میرۆ ، دلێ منی لیبیانە !
ئەز نەنێرم گوتنێن تە نە گوتنێن حاکم و میرانە
شەرتێ مێرێ حاکم ئەوسانە :
بەرێ دپرسن سەبەبێن تشتانە

(مەمێ ئالان ، ل ١٢٤)

*کاتی ئاینده :

نیشانەی (دێ ، وێ) + ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار + جێناوی لکاوی بێهێز :

ئەز دێ کەڤم
ئەز وێ کەڤم
ئەڤە ئەز دێچمە مالا خویشکا خوە ...

(خالید حسەین ، ل ٧)

... هتد .[٢٠٢]

واتە نیشانەی (د – di) بۆ کاتی ئێستایە و (دێ)و (وێ)یش هی کاتی ئاییندەیە .[٢٠٣]

---

[٢٠٢] مەکیسی خەمۆ (ئەزێ دەکەڤم)ی بە کاتی ئێستای ناسراو داناوە و (ئەز دکەڤم)یشی بە کاتی ئێستای نەناسراو لە قەڵەم داوە (د. مەکیسی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی "وڵاتان و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست " ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٤٤) . بەڕێی باوەڕی ئێمە ، حاڵەتی یەکەم – (ئەزێ دەکەڤم) کاتی ئایندەیە و (ئەز دەکەڤم)یش کاتی ئێستایە . هەرچی ئەو (ێ)یەی کۆتایی (ئەز)ی حاڵەتی یەکەمە ، کورتەی (دێ) یان (وێ)ی نیشانەی ئایندەیە و هەر بۆیەش کە دەچێتە سەر جێناوی کەسیی جوداش وەك حاڵەتی جودایی (دێ) و (وێ) دەوردەبینێ .

[٢٠٣] لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروویشدا بەشە دیالێکتی ئەمولۆ هەیە ، کە فۆرمی کاتی ئایندەی نییە . بەوێنە لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی تورکمەنستاندا وەك دیالێکتی کرمانجیی خواروو بۆ کاتی ئێستا و ئایندە یەك فۆرم بەکاردێنن (بڕوانە : ع. خ. باکاییف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ١٨٠) .

# کاتی ڕابوردوو

کـردلری ڕابـوردوو ئـەو کردارەیـە ، کـە پرۆتسێنسـی ڕووداندکـەی پێـش ئاخاوتن بکەوێ

لە زمانی کوردیدا کرداری ڕابوردوو چوار جۆری هەیە :

١-ڕابوردووی نزیك .

کەرەستەی بنەڕەتیی فۆرمی کاتی ڕابوردووی نزیك قەدی کردار و جێناوی لکاوە

أ-ئەگەر کردار تێنەپەڕ بێ ، ئەوە جێنـاوی دەسـتەی بـێ‌هێز وەردەگرێ .
کردارەکەش ج سادە و ج داڕێژراو و ج لێکدراو بێ ، جێناوەکە دەکەوێتە دوای قەدەوە .

| | | |
|---|---|---|
| سادە | بوون | بووم ... بووین ... |
| | کەوتن | کەوتم ... کەوتین ... |
| واتە | قەد + جێناوی لکاوی بێ‌هێز . | |
| داڕێژراو | دابوون | دابووم ... دابووین ... |
| | داکەوتن | داکەوتم... داکەوتین ... |
| واتە | پێشگر + قەد + جێناوی لکاوی بێ‌هێز | |
| لێکدراو | ئازادبوون | ئازادبووم ... ئازاد بووین ... |
| | سەرکەوتن | سەرکەوتم ... سەرکەوتین ... |
| واتە | وشەیێکی واتادار + قەد جێناوی لکاوی بێ‌هێز . | |

ب-هەرچی کرداری تێپەڕە جێناوی لکاوی بەهێز وەردەگرێ ، بەلام :
*ئەگەر کردارەکە سادەبێ ، جێناوەکە دەکەوێتە دوای قەدەکەیەوە وەك :

| | | |
|---|---|---|
| گرتن | – | گرتم ... گرتمان |
| کردن | – | کردم ... کردمان |
| واته | قەد | جێناوی لکاوی بەهێز . |

*بێتو کردار دارێژراو یان لێکدراو بن ، ئەوە جێنارەکە لە پێش قەدی کردارەکەوە دێت . وەك :

دارێژراو

| | | |
|---|---|---|
| | داگرتن | دامگرت ... دامانگرت |
| | راکردن | رامکرد ... رامانکرد |
| واته | پێشگر + جێناوی لکاوی بەهێز | جێناوی لکاوی بێهێز . |

لێکدراو

| | | |
|---|---|---|
| | رێگاگرتن | رێگامگرت ... رێگامانگرت |
| | بەخێوکردن | بەخێومکرد... بەخێومانکرد |
| واته | وشەیێکی واتادار + | جێناوی لکاوی بەهێز + قەدی کردار |

ئەم جۆرە فۆرمە – واتە فۆرمی رابوردووی نزیك بە گشتی رووداناێك رادەگەیەنێ ، کە لە کاتی رابوردوودا رووی دابێ و کۆتایی هاتبێ (ئازاد چوو بۆ قوتابخانە)... لە ناوەرۆکی ئەم فۆرمەدا واتای کورتی و درێژی ، بەردەوامی و کۆتایی نەهاتن نییە ، بەڵام هەندێ جار مەبەستی رستە و بوونی وشەی خاوەن واتای بارودۆخ وای لێدەکەن واتای بەردەوامی و کۆتایی نەهاتن بگەیەنێ . وەك

هەزار جار هات و هیچی نەکرد

مام بارام چەند ساڵێك لەسەر جێگە کەوت

وشەی سەر بە کات و بارودۆخ دەتوانن کاریکاتە سەر فۆرمی کاتی ڕابوردووی نزیك و واتای ئاییندەی پێ ڕابگەیەنن وەك :

کەمێ بووەستە ، وا هاتم

کەی هاتم ئامەکەت دەدەمێ

ئەگەر سبەینێ هاتم گلەیی مەکە

هەر کە هاتم یەکسەر بۆت باس دەکەم

یا توربەتێ ، یا غوربەتێ یا ڕێ بشکێنین

هەر مونتەظیرە "نالی" ئەگەر مرد و ئەگەر ما

(نالی ، ل ۱۲۱)

سبەینێ کە جەنگ دامرکایەوە

ئاگری هەرا و شەڕ کوژایەوە

(بێکەس ، ل ٦۹)

۲-ڕابوردووی بەردەوام .

کەرەستەی بنەڕەتیی فۆرمی کاتی ڕابوردووی بەردەوام بریتی‌یە لە نیشانەی (دە / ئە)و قەدی کردار و جێناوی لکاو :

أ-ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بێ بە هەمان شێوەی ڕابوردووی نزیك جێناوی لکاوی بێهێز وەردەگرێ و جێناوەکەش لە هەموو شێوە ڕۆنانێکی کردارەکەدا هەر دەکەوێتە دوای قەدەوە .

واته : نیشانەی (دە / ئە) + قەد + جێناوی بێهێز . وەك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| سادە | بوون | - | دەبووم ... دەبووین ... |
| | كەوتن | - | دەكەوتم ... دەكەوتین ... |
| داڕێژراو | دابوون | - | دادەبووم ... دادەبووین ... |
| | داكەوتن | - | دادەكەوتم ... دادەكەوتین ... |
| لێكدراو | ئازادبوون | - | ئازاددەبووم ... ئازاددەبووین ... |
| | سەركەوتن | - | سەردەكەوم ... سەردەكەوین ... |

ب-كرداری ڕابوردووی بەردەوامی تێپەڕ هەروەك كرداری ڕابوردووی نزیك جێناوی لكاوی بەهێز وەردەگرێ ، بەڵام :

*ئەگەر كردارەكە سادە بێ جێناوەكە دەكەوێتە پێش قەدی كردارەكە و دوای نیشانەكەوە . وەك :

| | | |
|---|---|---|
| گرتن | - | دەمگرت ... دەمانگرت ... |
| كردن | - | دەمكرد ... دەمانكرد ... |

*بێتو كردار داڕێژراو یان لێكدراو بێ ، ئەوە جێناوەكە لە پێش نیشانەكەوە دێت . وەك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| داڕێژراو : | داگرتن | - | دامدەگرت ... دامانەدەگرت ... |
| | ڕاكردن | - | ڕامدەكرد ... ڕامانەدەكرد ... |
| لێكدراو : | ڕێگاگرتن | - | ڕێگامدەگرت ... ڕێگامانەدەگرت ... |
| | بەخێوكردن | - | بەخێومدەكرد ... بەخێومانەدەكرد ... |

ئــەم جــۆرە فۆرمــە ڕوودانێکــی ڕابــوردووی وا ڕادەگەیــەنێ ، کــە پرۆتسێسەکەی بەردەوام بێ و کۆتایی دیار نەبێ . وەك :

جادە چۆڵ و سێبەر بوو ، کات بەیانی ،

ئەڕۆیشتم خەیاڵاوی ئەمڕوانی :

(گۆران ، ل ٣٤)

لەبەر خەندەی لەبی لەعلی ئەتۆ بو

کەوا شەککەر دەباری ، گوڵ دەپشکووت

(نالی ، ل ١٥٠)

هەر لە ئەجدەوە تا هەردەی دوجەیل

بۆ لەیل ئەگەڕام دەروون لەغەم کەیل

(پیرەمێرد ، ل ١١٥)

*بۆ دووبارە بوونەوەی کارێك لە ڕابوردوودا :

بەمنداڵی هەموو ڕۆژێکی هەینی دەچووین بۆ سەیران

هەر لەگەڵ ئەمەی تفەنگێك ئەهات وەختەبوو ڕۆحم بچێت ...

(لەخەوما ، ل ٣٠)

*لە بارودۆخی مەرجیی نەهاتنەدی ڕووداننێك :

ئەگەر بە دوعا نەبوو ، پشقل بە خورما نەبوو

(پەندی پێشینان ، ل ٣٠)

٣-ڕابوردووی تەواو :

کەرەستەی بنەڕەتیی فۆرمی ڕابوردووی تەواو بریتی‌یە لە قەدی کردار و نیشانەی (وو)و جێناوی لکاو . یاخود دەشێ بوترێ لە ئەشەپێدانی فۆرمی ناوی کاراوە دروست بووبێ :

أ-ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بێ بە هەمان چەشنی ڕابوردووی نزیک و بەردەوام جێناوی لکاوی بێ‌هێز وەردەگرێ و جێناوەکەش لە گشت چەشنە ڕۆنانێکی کرداردا هەر لە پاش قەدەوە دێت .

واتە : قەد + نیشانەی (وو) + جێناوی بێ‌هێز .

| | | | |
|---|---|---|---|
| سادە | بوون | - | بووم ... بووین ... |
| | کەوتن | - | کەوتووم ... کەوتووین |
| داڕێژراو | دابوون | - | دابووم ... دابووین ... |
| | داکەوتن | - | داکەوتووم ... داکەوتووین ... |
| لێکدراو | ئازادبوون | - | ئازادبووم ... ئازادبووین ... |
| | سەرکەوتن | - | سەرکەوتووم ... سەرکەوتووین ... |

ب-کرداری ڕابوردووی تەواوی تێپەڕ ، وەک ڕابوردووی نزیک و ڕابوردووی بەردەوام تەنیا جێناوی بەهێز وەرناگرێ ، بەڵکو لەیەک کاتدا هەردوو جۆرەکە - واتە بەهێزیش و بێ هێزیش وەردەگرێ .

*ئەگەر کردار سادە بوو :

قەدی کردار + نیشانەی (وو) + جێناوی بەهێز + جێناوی بێ‌هێز

| | | |
|---|---|---|
| گرتن | - | گرتوومە ... گرتوومانە |
| کردن | - | کردوومە ... کردوومانە |

*داڕێژراو :

پێشگر + جێناوی بەهێز + قەدی کردار + نیشانەی (وو) + جێناوی بێهێز

| | | |
|---|---|---|
| داگرتن | - | دامگرتووە ... دامانگرتووە ... |
| ڕاکردن | - | ڕامکردووە ... ڕامانکردووە ... |

*لێکدراو :

وشەی واتادار + جێناوی بەهێز + قەدی کردار + نیشانەی (وو) + جێناوی بێهێز .[201]

---

[201] نووسەرانی ڕێزمانی کوردی (جگە لە مامۆستا مەسعوود محەممەد ، بڕوانە : ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ١٧٩) وایان داناوە ، کە کرداری یاریدەدەر هاوبەشی پێکهاتنی کاتی ڕابوردووی تەواو دەکا - واتە ئەو (ە)یەی لە کۆتایی کەسی سێیەمدا دێت بە کرداری یاریدەدەریان داناوە (بەوێنە بڕوانە ، بەرهەمەکانی تۆفیق وەهبی ، نووری عەلی ئەمین ، محەممەد ئەمین هەورامانی ، عەبدوڵڵا شاڵی ، فەنالی کوردۆ ، کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، زاری یووسف ... و گەلێکی تر ) .

من وای بۆ دەچم (ە) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەم بێ و کرداری یاریدەدەر نەبێ . بۆ بەڵگەی ئەم ڕایەش ئەوەندە بەسە ، کە بڵێین ئەگەر کەسی کردارەکە بکەین بە سێیەمی کۆ ، ئەوە ئەو (ە)یە دەبێ بە (ن) . وەک :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| گرتوویە | ... | گرتوویمانە | گرتوومن | ... گرتوومانن ... |
| دام گرتووە | | ... دامان گرتووە | دام گرتوون | ... دامان گرتوون ... |
| ڕێکام گرتووە | | ... ڕێکامان گرتووە | ڕێکام گرتوون | ... ڕێکامان گرتوون ... |

(بۆ زانیاریی تەواو لەبارەی جێناوی "ە"وە ، بڕوانە ، ل ١٤٢ - ١٤٩ی بەشی دووەمی ئەم کتێبە) .

ڕێگاگرتن - ڕێگامگرتووه ... ڕێگامانگرتووه ...

بەخێوکردن - بەخێومکردووه ... بەخێومانکردووه ...

ئەم جۆرە فۆرمەی ڕابوردوو ، ئەگەرچی دەتوانن چەند حاڵەتێکی جۆراوجۆر دیاری بکا ، بەڵام بە زۆری ئەنجامی ڕووداوێك رادەگەیەنێ ، کە ئەسەر و ئەنجامی لە کاتی ئێستادا هەبێ . وەك :

فەرشی کەفی بەری پێتە نەرگس

سەری داخستووه وەك چاوی حەیا

(نالی ، ل ١٢٦)

عەشرەت هاوارە ، عەشرەت هاوارە

کەوتوومە ئاراس ئاو بێبوارە

(پیرەمێرد ، ل ١١٦)

... داوای جەزایەکی زۆریان لێکردووه ، ئەویش پارەی نەبووه بیدا ماڵەکەیان فرۆشتووه .

(لە خەرمانا ، ل ٣٦)

بەئاسمانەوە ئەستێرەم دیوه ،

لە باغچەی بەهار گوڵم چنیوه ،

شەونمی درەخت لە ڕووم پڕاوه ،

لە زەردەی زۆر گەل سەرنجم داوه ،

(گۆران ، ل ٩)

٤-ڕابوردووی دوور :

کەرەستەی بنەڕەتیی فۆرمی ڕابوردووی دوور بریتی‌یە لە قەدی هەر کردارێك و قەدی کرداری (بوون)و جێناوی لکاو .

ا-ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بێ :

قەدی کردارێکی تێنەپەڕ + قەدی کرداری بوون + جێناوی بێ‌هێز

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | : | بوون | - | بووبووم ... بووبووین ... |
| | | کەوتن | - | کەوتبووم ... کەوتبووین ... [٢٠٥] |
| دارێژراو | : | دابوون | - | دابووبووم ... دابووبووین ... |
| | | داکەوتن | - | داکەوتبووم ... داکەوتبووین ... |
| لێکدراو | : | ئازادبوون | - | ئازادبووبووم ... ئازادبووبووین ... |
| | | سەرکەوتن | - | سەرکەوتبووم ... سەرکەوتبووین ... [٢٠٦] |

ب-بێتو کردارە ڕابوردووە دوورەکە تێپەڕبێ

سادە :

قەدی هەر کردارێکی تێپەڕ + قەدی کرداری (بوون) + جێناوی بەهێز

---

[٢٠٥] پێم هەموو بووبوو بە بلوق ، هەناسە برکێە پێ کەوتبوو ...

(لەخەوما ، ل ٢٩ -٣٠)

لە ڕێگاکانا گوڵە زەرد یەکسەر

بووبووە زنجیرەی لەلاری پشتەسەر

(پیرەمێرد ، ل ١٤١)

[٢٠٦] میوەم دی لە لوتی شێوەی عوریانا

گرز بووبوو لەناو گەڵا ڕزیانا

(پیرەمێرد ، ل ١٥٠)

گرتن – گرتبووم ... گرتبوومان ...

کردم – کردبووم ... کردبوومان ...

داڕێژراو :

پێشگر + جێناوی بەهێز + قەدی هەر کردارێکی تێپەڕ + قەدی کرداری (بوون) :

داگرتن – دامگرتبوو ... دامانگرتبوو ...

ڕاکردن – ڕامکردبوو ... ڕامانکردبوو ...

لێکدراو :

وشەی واتادار + جێناوی بەهێز + قەدی هەر کردارێکی تێپەڕ + قەدی کرداری (بوون) .

ڕێگاگرتن – ڕێگامگرتبوو ... ڕێگامانگرتبوو ...

بەخێوکردن – بەخێومکردبوو ... بەخێومانکردبوو ... [٢٠٧]

فۆرمی کرداری ڕابوردووی دوور ڕوودانێك ڕادەگەیەنێ ، کە ڕوودانەکەی پێش ڕوودانی کردارێکی دی بکەوێ .

---

[٢٠٧] جوابیان نووسیبوو بە شەونم لەسەر گیا

تا ئاسمان پرشکی بەدی تێوە هەڵزا

(پیرەمێرد ، ل ١٠٧)

بە دوو زوڵفی وەك زنجیر

پێم بەسترابوو وەك نێچیر

(پیرەمێرد ، ل ١٦٢)

بەوێنە ، کە دەڵێین : (کاتێ چووین بۆ لای ئازاد ، نووستبوو) ، ئەوە ئاشکرا دیارە ، کە (نووستن)ی ئازاد پێش (چوون)ی ئێمە کەوتووە - واتە بەر لەوەی بچینە لای ئازاد ، ئەو نوستبوو .

فۆرمی کرداری ڕابوردووی دوور تەنیا هەر ڕووداوێك ڕاناگەیەنێ ، کە ڕووداوەکەی پێش ڕوودانی کردارێکی دی کەوتبێ ، بەڵکو ئەوەش نیشان دەدا ، کە ئەو ڕووداوە دەشێ پێوەندی بە کاتێکی دیاری کراوەوە هەبێ . لەم هەل و مەرجەدا دەکرێ لە پێش فۆرمی ناوبراوەوە وشەی سەر بە بارودۆخی ، وەك : (دوێنێ ، پێرێ ، پار ، پێرار ... ) بەکاربهێنرێ :

ئازاد پار هاتبوو بۆ بەغدا

(

**تێبینی :**

١-لە کاتی ڕابوردوودا کرداری تێنەپەڕ جێناوی بێهێز وەردەگرێ و کرداری تێپەڕیش جێناوی بەهێزی دەخرێتە سەر .

٢-کردار کە تێنەپەڕ بوو چ ساد بێ و چ داڕێژراو و چ لێکدراو لە گشت حاڵەتێکی ڕابوردوودا - واتە (نزیك ، بەردەوام ، تەواو ، دوور) بێ ، جێناو لە کۆتاییەوە دێت .

٣-هاتنی جێناوی لکاو لەگەڵ کرداری تێپەڕدا بە دوو جۆر دەبینرێ :

أ-ئەگەر کردارەکە سادە بێ لە حاڵەتی ڕابوردووی نزیك و ڕابوردووی تەواو و ڕابوردووی دووردا دەکەوێتە کۆتایی و لە حاڵەتی ڕابوردووی بەردەوامدا لە پێش قەدی کردارەکەوە دێت .

ب–بێتو کردارەکە ناسادە (داڕێژراو یان لێکدراو) بێت ، لە حاڵەتی ڕابوردووی نزیک و ڕابوردووی تەواو و ڕابوردووی دووردا دەکەوێتە سەرەتای قەدی کردارەکە ، بەڵام لە حاڵەتی ڕابوردووی بەردەوامدا لە پێش نیشانەی (دە / ئە)وە دێت .

*　　*
*

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، هەروەک دیالێکتی کرمانجیی خواروو ، کرداری ڕابوردوو چوار جۆری هەیە : (١–ڕابوردووی نزیک ؛ ٢–ڕابوردووی بەردەوام ؛ ٣–ڕابوردووی تەواو ؛ ٤–ڕابوردووی دوور) . لە ڕووی دەور و گەیاندنی مەبەستیشەوە خاوەنی هەمان دەور و هەمان مەبەستن . وێڕای ئەوەش ، لەوەشدا بەتەواوی یەک دەگرنە ، کە کردارە تێنەپەڕەکان نەک هەر بە هەمان شێوەی خواروو جێناوە لکاوەکانی دەستەی بێهێز وەردەگرن ، بەڵکو وەک ئەویش لە کۆتاییەوە دێن . بەڕێنە :

١–ڕابوردووی نزیک :
ئەز کەتم
...
هوون کەتن
...[208]

---

[208] ... گولە ل ماعرێ سەر گەنجۆری ڕەشۆکانکی نەکەت ، لێ چوو ل دێلا ماعرێ سپی چیل کەت ...

(کوردێل ، ل ٣٥)

٢-ڕابوردووی بەردەوام :

ئەز دکەتم

...

هوون دکەتن

...[٢٠٩]

٣-ڕابوردووی تەواو

ئەز کەتمە

...

هوون کەتنە

...[٢١٠]

٤-ڕابوردووی دوور :

ئەز کەتبووم

...

هوون کەتبوون

...[٢١١]

جیاوزای تەنیا لە کرداری تێپەڕدا هەیە ، ئەویش هۆی ئەوەیە ، جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم - واتە بەهێزەکان ، کە لە دیالێکتی کرمانجیی

---

[٢٠٩] ... دەما ئەو برێقە دچوو ، شوین پێت وێ دبون لەقالێت زێری ...

(خالید حسین ، ل ٨)

[٢١٠] ئەم کەتە چۆلان و کەربەلانە .

(مەمێ ئالان ، ل ٤٠)

هەردوو ماعر ... جزیکاڤ کشیان چوون ، کەتنە مالا وێ ...

(کوردێ ، ل ٣٦)

[٢١١] زنا عەلی مەمەد ... بووبوو گورا هار ، ب مێرێ خوەدا کەتبوو ...

(کوردێ ، ل ٣٢)

خواروودا زۆر چالاکن و بە شێوەیێکی سەرەکی دەچنە سەر کرداری تێپەڕی ڕابوردوو ، لە دیالێکتی کوردیی ژووروودا بە هیچ چەشنێك نابینرێن

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا کرداری ڕابوردووی تێپەڕ بە دوو جۆر دەبینرێ :

أ-دەرکەوتنی جێناوی لکاوی دەستەی دووەم - واتە بێهێز :

ئەگەر لە ڕستەدا بەرکار هەبێ ، ئەو دەمە جێناوە لکاوە بێهێزەکان دێنە سەر کۆتایی کردار . وەك :

١-ڕابوردووی نزیك :

تە ئەز شاندم

من هوون شاندن

...

٢-ڕابوردووی بەردەوام :

تە ئەز دشاندم

من هوون دشاندن

....

٣-ڕابوردووی تەواو :

تە ئەز شاندم

من هوون شاندنە

...

٤-ڕابوردووی دوور :

تە ئەز شاندبووم

من هوون شاندبوون

ب–نەرنەکەوتنی جێناوی لکاو :

ئەگەر لە ڕستەدا بەرکار نەبێ ، ئەو کاتە جێناوی لکاو پەیدا نابێ و کردارەکە لە یەك فۆرمدا بۆ هەموو کەسەکانی ژمارەی تاك و کۆ دەبینرێ . وەك :

١–ڕابوردووی نزیك :




٢–ڕابوردووی بەردەوام :



٣-ڕابوردووی تەواو :




٤- ڕابوردووی دوور :



-٢-

# ڕێژەی ئینشائی

لە زمانی کوردیدا کردار لە ڕێژەی ئینشائیدا ، هەروەك ڕێژەی ئیخباری بەسەر ڕابوردوو و ڕانەبوردوودا دابەش دەبێ و (بـ - bi)و (با)و (ایە)ش سێ نیشانەی گرنگی ئەو ڕێژەیەن .

### کاتی ڕانەبوردوو

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا چۆن لە ڕێژەی ئینخباریدا کردار ج تێپەڕبێ و ج تێنەپەڕ ، ج سادە و ج دارێژراو و ج لێکدراو نیشانەی (دە // ئە) دەخرێتە پێش کاتی ڕانەبوردوویەوە و بە دوا ڕەگەکەشیدا جێناوی لکاوی جۆری بێهێز دادەنرێ ، لە ڕێژەی ئینشائیشدا بە هەمان جۆرە و تەنیا ئەوەندە هەیە نیشانەی (بـ - bi) لە بریتی (دە // ئە) دادەنرێ . لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا ئەم نیشانەی (بـ - bi)ە بە هەمان شێوەی دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەبینرێ .

*تێنەپەڕ :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | | بوون | - | ببم ... ببین ... |
| | | کەوتن | - | بکەوم ... بکەوین ... |
| دارێژراو | : | دابوون | - | دابم ... دابین ... |
| | | داکەوتن | - | دابکەوم ... دابکەوین ... |

| | | | |
|---|---|---|---|
| لێکدراو | ئازادبوون | – | ئازادبیم ... ئازاد ببین ... |
| | سەرکەوتن | – | سەربکەوم ... سەربکەوین ... |

*تێپەڕ

| | | | |
|---|---|---|---|
| سادە | گرتن | – | بگرم ... بگرین ... |
| | کردن | – | بکەم ... بکەین ... |
| داڕێژراو | داگرتن | – | دابگرم ... دابگرین ... |
| | ڕاکردن | – | ڕابکەم ... ڕابکەین ... |
| لێکدراو | ڕێکاگرتن | – | ڕێکابگرم ... ڕێکابگرین ... |
| | بەخێوکردن | – | بەخێوبکەم ... بەخێوبکەین ... |

فۆرمی کاتی ڕانەبوردووی ئینشائی دەشێ بۆ مەبەستی دەربڕینی هیوا و ئاوات و مەبەست و توانست و تکا و دوعا و پاڕانەوە و نیاز و ڕازیبوون و جەخت و هاندان و هەڕەشە و پەسەندکردن و ڕاڵبوون و گومان و دوودڵی و ترس و پرس و مەرج ... بەکاربهێنرێ .

چەند نموونەیەك :

ئاواتە خوازم کە زوو بێنبگەی
بەشەرتێ کە من ڕەنجەڕۆ نەکەی

(بێ کەس ، ل ١٥٤)

چ خۆشە دەستەیەك دڵسۆز و یاران
ڕەفیقی یەکتری بێ غەرزکاران
بە تاقم پێکەوە فەسڵی بەهاران

بچینە بەزم و ڕەزم و کەیف و سەیران
لەسەر ناوێ بە کۆمەڵ دابنیشین
بە نەشئەی بەستەوە بادە بنۆشین

(بێ کەس ، ل ١٥٧)

نای بۆ دەنگ خۆشێك لەگەڵ شمشاڵێ
بە نائێنایەوە تیر بۆم بناڵێ

(پیرەمێرد ، ل ١٠٨)

بە ڕەنگی زەرد و شێوەی دەست و شمشاڵی گزا ، دەروێش
حەزم کرد بەستەیەك ببیەم سەرلەسەر حوزن و ماتەم بێ

(گۆران ، ل ١١٩)

... ئەمویست سەعاتێك زووتر بگەمە جێی مەقصەد و هەموو ئومێدێکم لـەوێ پێك بێت و لەم ناڕەحەتی و ترس و لەرزە نەجاتم ببێت ...

(لەخەوما ، ل ٣١)

کەرووی لێتیشت گەردی شیعرم ،
هەی جوانەمەرگ خۆم ! هەی بمرم ! ..

(گۆران ، ل ٣٩)

ساخوایە هەلکەی کزەی شەماڵێ
هەوای زەنگی غەم لە دڵ بماڵێ

(پیرەمێرد ، ل ١٠٨)

لە ناکەس کارپیا ، خاکم بەسەر ، ڕۆیی بە با عومرم
خودا ! تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپیی کەسێ دەمرم

(مەحوی ، ل ٢٢٠)

شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت دەم وەکوو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە
(بێکەس ، ل ٥٦)

ڕۆڵە ، لای‌لایە ... (شێرکۆ) لای‌لایە ...
یاخوا شێرانە بێیتە ناو کایە ...
(بێکەس ، ل ١٥٣)

دەگەی نەخچیری صەد دڵ هەر بە تیری
ئیلاهی هەر بمێنێ دەست و بازووت
(نالی ، ل ١٥١)

ڕۆژی تێکۆشانە ، سادەی هیمەتێ تاکوو زووە
بەشکو لەم حاڵە نەجاتمان بێ و لە دیلی دەربچین ...
(بێکەس ، ل ٧٩)

... ئەبێ سبحەینێ ئەم کوڕە بە (ضابط) قەید بکات ...
(لەخەوما ، ل ٤٦)

جارێ ئەبێ بزانین ئەمانە لە کوێوە هات
چی چاکترە لەمانە بۆ بەرزیی وڵات
(پیرەمێرد ، ل ٢٥١)

بەسەر پایزی زەردا با بە خوڕ بگری ، بەکوڵ بگری ،
لەسەر ئاخر گەڵا ، ئاخر چڵی تەنیایی گوڵ بگری !
(گۆران ، ل ١٦٥)

به ناهم گەر ڕەقیبانت بسووتێن نەی گوڵی ڕەعنا
مەرەنجە ، توو خودا شوغلە لە ناقاری جەقل چ بکا ؟
(مەحوی ، ل ١٤)

جی بچێنیت ، ئەوە ئەدروویتەوە
(پەندی پێشینان ، ل ١٧٨)

بچێتە سەر سیروان وشکی دەکا
(پەندی پێشینان ، ل ٨١)

بۆ گریەیی تۆ ڕەنگە منیش هێندە بگریم
گەوهەر برژێنین بە بولەندیی قەد و باڵات
(نالی ، ل ١٢٩)

منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم
دەترسم من برۆم ، بشکێ سوپاتان
(نالی ، ل ٣١٩)

... هەر خێرا خێرا ئەمپرسی ، زۆرمان ماوە بگەینە شار یان نا ؟
(لە خەوما ، ل ٣١ – ٣٢)

... هتد (٢١٢)، (٢١٣)

---

(٢١٢) شایانی باسە ، مامۆستا نووری عەلی ئەمین "ڕێزمانی کوردی ، ل ١٧٨ – ١٧٩"و د. زاری یووسف "دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، ل ٩٧ – ٩٨" ... باسی هەندێ لەو مەبەستانەی دەربڕینی ڕانەبوردووی ئینشائیيان کردووە .

(٢١٣) لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ڕێژەی کاتی ڕانەبوردووی ئینشائی بە جۆرێك لە کرداری داخوازی لە قەڵەم داوە و بە ناوی (فەرمانی ناسەربەخ)ەوە لێی دواوە (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ٢٢٢ – ٢٢٣) ، کەچی وشەکانی (بکەوتیامایە ، بم گرتبایە ، بووبم ، گرتبم ...)ی بە ڕێژەی ئینشائی داناوە . لە ڕاستیدا هەردوو جۆرەکە ڕێژەی ئینشائین و ئەمونەدە هەیە (بخوێنن ، بچم ، بمرێ ، بیکەی ،

هەندێ کرداری ئەو نموونانە ، ئەگەرچی دەشێ پرۆتسیسی ڕوودانی کارێك ، کە ڕاستییێك نیشان بدا ڕابگەیەنێ یاخود مەبەستێکی گشتیی بەرفراوان بگرێتە خۆ ، بەڵام زوربەی زۆریان پرۆتسێسی ڕوودان لە کاتی ئاییندەدا دەخەنە ڕوو و بۆیە هەڵە نییە ، ئەگەر فۆرمی ڕانەبوردووی ڕێژەی ئینشائی بە کاتی ئایندە دابنرێ . وا پێ‌دەچێ لەبەر هەمان هۆش بێ ، لە هەندێ لێکۆڵینەوەی سەر بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، وشەکانی : (بکەڤم ، بکەڤی ، بکەڤە ، بکەڤن ...) بە کاتی ئایندە دانراون .

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا نیشانەیێکی وا نییە بچێتە سەر فۆرمی کاتی ئێستا و بیکاتە کاتی ئایندە ، بەڵام لە دیالێکتی ژووروی کەردیدا فۆرمێکی تایبەتی بۆ کاتی ئایندە پەیدابووە ، ئەویش ئەوەیە ، کە نیشانەی (دێ) ، (وێ) دەخرێتە دوای وشەی کاراوە یان بەتەنیا بەکاردێنرێ یان لە شێوەی جێناوی لکاوی (ێ)دا دەردەبڕێ . وەك :




---

-

بکات ...) لە کاتی ڕانەبوردوودان و (بکەوتبامایە ، بە گرتبایە ، بووبم ، گرتبم ..)یش لە کاتی ڕابوردوودان . لە کاتێکدا کە ئەم ڕەخنەیە لە لیژنەی ناوبراو دەگرم ، پێ لەو ڕاستییەش دەنێم ، کە خۆشم لە بەرگی یەکەمی بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا (ل ١٧٨ ، ١٨١ ، ١٨٦ - ١٨٧ ...)دا تووشی هەمان هەڵە بووم .




... هتد .[۲۱٤]

نیشانەکانی (دێ)و (وێ) ئەگەرچی تا ئێستا لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەلیان لەبارەوە نەکراوە و بە تەواوی ئەسڵیان ساغ نەکراوەتەوە ، بەڵام هەندێ ڕا و بۆچوون نیشان دراوە ، کە شایانی باسن :

لەبارەی (دێ)وە د. جەمال نەبەز نووسیویە : " یا بریتی‌یە لە گەردان کردنی چاوگەی کاری (ویستن) ، چونکە گەردان کردنی ئەم چاوگەیە و بەکارهێنانی بۆ پیشاندانی کاری هاتوو ، هێندێ جار لە کرمانجیی نێوەڕاستیشدا دەبینرێ . بۆ وێنە جاری وا هەیە کە بتەوێ لە پاشەڕۆژدا بچیت بۆ بەغدا دەڵێیت : (دەمەوێ بچم بۆ بەغدا) . واتا بە بەکارهێنانی کاری (دەمەوێ) وای پیشان دەدەیت کە لە پاشەڕۆژدا (نەك ئێستە) دەچێت بۆ بەغدا . دە کاری هاتوو لە کرمانجیی ژووروودا ؛ ڕەنگە هەر ئەم (دەمەوێ)یە بێ لە بنچینەدا . ئەوجا دەبێ بزانین کە وشەی (دەوێ) بە کرمانجیی ژووروو (دڤێ)یە . کەواتە دەبێ ئەو (دێ)یە لەم (دڤێ)یەوە هاتبێ . واتا (دڤێ) بووە بە

[۲۱٤] لە سەرجەمی ئەو لێکۆڵینەوانەدا ، کە لەم کێشەیە دواون ، ئەو حاڵەتەیان بە کاتی ڕانەبوردووی جۆری دووەم لە قەڵەم داوە و بە لای ئەوەدا نەچوون ، کە ئەمە کاتی ئایندە بێ لە ڕێزمی ئێستایدا (بە وێنە بڕوانە ، ق. کوردۆیێڤ ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ۱۹۵۷ ، ل ۲۰۷ – ۲۰۸ ؛ چ. خ. باکایێڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۳ ، ل ۱۸۰ – ۱۸۱ ؛ ی. ل. تساپۆلۆڤ ، لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۸ ، ل ٦٥ – ٦٦ ...) .

(دێ) و (دێ)ش بووه به (ئێ) . واتا بۆ وێنه (ئەز دڤێ بچم) بووه به (ئەز دێ بچم)و ئەوجا بووه به (ئەزێ بچم) .

ئا لەم ڕووەوە - ئەگەر ئەم لێکدانەوەیەی سەرەوە ڕاست بێ - دەبینین فارسیی تازەش هەر ئەم ڕێیەی گرتووە بۆ داتاشینی کاری هاتووە . واتا دۆخی هاتوو (حالة المستقبل)ی لە چاوگەی کاری (خواستن) - واتا (ویستن)ەوە دروست کردووە . بۆ وێنە کە بڵێیت : (من میروم) - واتا (من دەڕۆم) ، بەڵام کە بڵێیت : (من خواهم رفت) - واتا (من دەمەوێ - لەمەولا - بڕۆم) . بە کورتی (من بە تەمام بڕۆم) .

یابریتییە لە کەسی سێیەمی کاری (هاتن) کە (دێ)یە . واتا ئەوەی بە عەرەبی (یاتی) دەگرێتەوە . بەم جۆرە کە گوتت (ئەز دکەڤم) ماناى (انا اقعُ) - واتا (من دەکەوم) . بەڵام کە گوتت (ئەز دێ کەڤم) ئەمە مانای (انا یاتی وقت او یوم اقعُ فیه) . واتا (من کاتێك دێ کە دەکەوم) . بە کورتی (انا ساقعُ)ی عەرەبی دەگرێتەوە" (زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٤٦) .

ڕ. ل. تسابۆلۆڤیش دەربارەی (وێ) وتوویە : "لە ئەنجامی بەراوردکردنی شێوازی دەربڕینی فۆرمی ئایندەی کوردی لەگەڵ ئەو جۆرە فۆرمانەی زمانە ئێرانییەکاندا ڕەنگە بگەینە ئەنجام . لە زمانی فارسیدا بۆ ئەم بەکارهێنانە لە بناغەی کاتی ئێستای کرداری (خواستن)ەوە فۆرمی تایبەتی دروست بووە . لە زمانی سوگدی و خوارەزمیشدا لە بناغەی کاتی ئێستای (کەم) - واتە (ویستن)ەوە هەمان فۆرم پێکهاتووە . دەشێ بیر بۆ ئەوە بچێ ، کە لە کرمانجیی ژووروشدا (وێ) لە بناغەی کاتی ئێستای کرداری (خواستن)ەوە ، کە (خواز)ە کەرتبێتەوە . لە کرمانجیی خواروودا ئەو کردارە لە فۆرمی (ویستن)ەوە وەرگیراوە و لە شێوەی بناغەکەیدا کە (وێ)یە دەرکەوتووە ، بەڵام لەم

دیالێکتەدا فۆرمی تایبەتی بۆ دەربڕینی کاتی ئاییندە نییە و پێکهاتنی ئەو حاڵەتە بە یاریدەی وشەی تر سازدەبێ .

بەپێی بوونی قاڵبی وەك (شیان) ، بیر بۆ ئەوە دەچێ کە نیشانەی (وی) بناغەی (ویان) بێ ، کە لە شێوەی ئاکرێدا بەکاردێنرێ" ( لە بارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٦٤ - ٦٧) .

لەو تێکستە کوردییانەی ناوچەی بادینانی عێراقدا ، کە د. مەکسیمی خەمۆ تۆماری کردوون (دا)ش وەك (دێ ، وێ) نیشانەی کاتی ئاییندە خۆی دەنوێنێ . بۆ نموونە : (ئەز دا کەڤم ، تو دا کەڤی ...) [٢١٥]. سەبارەت بەم حاڵەتە ئەم نووسەرە وتوویە : ئەم فۆرمەی کاتی ئاییندە لە شێوەی بادیناندا هەیە یەکجار کەم بەکاردێنرێ و یاریدەی ڕاگەیاندنی ڕوودانێکی ڕابوردووی مەرجی دەدات[٢١٦] ...

مامۆستا جگەر خوێن یش لە لاپەڕە (١٥٢ - ١٥٣ )ی کتێبی "اوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی)دا (ئێ)یشی لەگەڵ (دێ ، وێ)دا بە نیشانەی کاتی ئێستا داناوە و (ئێ نان بخوێ ؛ ئێ ئیعۆ چی ...)یشی بە نموونە بۆ هێناونەتەوە .

---

[٢١٥] سەرنج ڕاکێش ئەوەیە ، کە لەم حاڵەتەدا نیشانەی (ب - bi) نییە .

[٢١٦] د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی بادینانی کوردستانی عێراق ، کتێبی "وڵاتان و میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نێزیك و ناوەڕاست" ، ب ٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل ٣٤٦) .

# کاتی ڕابوردوو

ڕیژەی ئینشائی‌یش وەك ڕێژەی ئیخباری چوار جۆر ڕابوردوو (١-نزیك ؛ ٢-بەردەوام ؛ ٣-تەواو ؛ ٤-دوور)ی هەیە و بە هەمان شێوەش جێناو وەردەگرن .

١-ڕابوردووی نزیك :

ا-تێنەپەڕ

سادە : بوون – بووبام ... بووباین ...

کەوتن – کەوتبام ... کەوتباین ...

واتە : قەد + نیشانەی (با) + جێناوی لکاوی بێ‌هێز

داڕێژراو : دابوون – دابووبام ... دابووباین ...

داکەوتن – داکەوتبام ... داکەوتباین ...

واتە : پێشگر + قەد + (با) + جێناوی لکاوی بێ‌هێز

لێکدراو : ئازادبوون : ئازادبووبام ... ئازادبووباین ...

سەرکەوتن : سەرکەوتبام ... سەرکەوتباین ...

واتە : وشەیێکی واتادار + قەد + (با) + جێناوی لکاوی بێ‌هێز

ب-تێپەڕ :

| | | | |
|---|---|---|---|
| سادە | گرتن | - | گرتبام ... گرتبامان ... |
| | کردن | - | کردبام ... کردبامان ... |
| واتە | قەد | + | (با) + جێناوی لکاوی بەهێز |
| دارێژراو | داگرتن | : | دامگرتبا ... دامانگرتبا |
| | ڕاکردن | : | ڕامکردبا ... ڕامانکردبا |
| واتە | پێشگر | + | جێناوی لکاوی بێهێز + قەد + (با) |
| لێکدراو | ڕێگاگرتن | - | ڕێگامگرتبا ... ڕێگامانگرتبا |
| | بەخێوکردن | - | بەخێومکردبا ... بەخێومانکردبا |
| واتە | وشەیێکی واتادار | + | جێناوی لکاوی بەهێز + قەد + (با) |

٢-ڕابوردووی بەردەوام .

ا-تێنەپەڕ

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| سادە | : | بوون | - | ببووبامایە ... | یاخود | ببوومایە ... |
| | | | | ببووبایتایە ... | | ببوویتایە ... |
| | | کەوتن | - | بکەوتباماپە ... | | بکەوتمایە ... |
| | | | | بکەوتبایتایە... | | بکەوتیتایە ...[٣١٢] |
| واتە | : | ب | + | قەد + با + جێناوی بێهێز + ایە | | |
| یاخود | : | ب | + | قەد + جێناوی بێهێز + ایە . | | |
| دارێژراو | : | دابوون | - | دابووباماپە ... | یاخود | دابوومایە |
| | | | | دابووبایتایە ... | | دابوویتایە |
| | | داکەوتن | - | داکەوتباماپە ... | | داکەوتمایە |
| | | | | داکەوتبایتایە ... | | داکەوتیتایە |

---

[٣١٢] خۆزگەم ئەمەیە ئێستە تۆ

بهاتیتایە گفت وگۆ

(بێکەس ، ل ١٥٥)

واتە : پێشگر + قەد + با + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە .

یاخود : پێشگر + قەد + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە .

لێکدراو ئازادبوون – ئازادبووبامایە ... یاخود ئازادبوومایە

ئازادبووبایینایە ... ئازادبووینایە

سەرکەوتن سەرکەوتبامایە ... سەرکەوتمایە

سەرکەوتبایینایە ... سەرکەوتینایە

واتە : وشەیێکی واتادار + قەد + با + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە .

یاخود وشەیێکی واتادار + قەد + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە .

ب– تێپەڕ

سادە : – بم گرتبایە[218] ... یاخود بمگرتایە

بمان گرتبایە ... بمانگرتایە

کردن – بم کردبایە ... بمکردایە ...

بمانکردبایە ... بمانکردایە ...[219]

واتە : ب + جێناوی لکاوی بەهێز + قەد + با + ایە .

یاخود : ب + جێناوی لکاوی بەهێز + قەد + ایە .

داڕێژراو : داگرتن – دامبگرتبایە ... یاخود دامبگرتایە

دامانبگرتبایە ... دامانبگرتایە

ڕاکردن – ڕامبکردبایە ... ڕامبکردایە

ڕامانبکردبایە ... ڕامانبکردایە

واتە : پێشگر + جێناوی لکاوی بەهێز + ب + قەد + با + ایە .

---

(218) کاتێ کە (با)و (ایە) پێکەوە دێن لە دوو بزوێنی (ا)ی کۆتایی (با)و (ا)ی سەرەتای (ایە)یە یەکێکیان دەمێنێتەوە ، چونکە لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن پێکەوە نایەن .

(219) ئەگەر کاوێژی بکردایە ، گۆشتی نەخورا

(پەندی پێشینان ، ل ٣١)

یاخود پێشگر + جێناوی لکاوی بەهێز + ب + قەد + ایە .

ئیکدراو ڕێگاگرتن - ڕێگامبگرتبایە ... یاخود ڕێگامبگرتایە

ڕێگامانبگرتبایە ... ڕێگامانبگرتایە

بەخێوکردن - بەخێومبکردبایە ... بەخێومبکردایە

بەخێومانبکردبایە ... بەخێومانبکردایە

واتە وشەیێکی واتادار + جێناوی لکاوی بەهێز + ب + قەد + با + ایە .

یاخود : وشەیێکی واتادار + جێناوی لکاوی بەهێز + ب + قەد + ایە .

## ٣-ڕابوردووی تەواو

### ا-تێنەپەڕ

سادە : بوون - بوویم ... بووین ...

کەوتن - کەوتیم ... کەوتین ...

واتە : قەد + ب + جێناوی لکاوی بێهێز

دارێژراو : دابوون - دابوویم ... دابووین ...

داکەوتن - داکەوتیم ... داکەوتین ...

واتە : پێشگر + قەد + ب + جێناوی لکاوی بێهێز

لێکدراو ئازادبوون - ئازادبوویم ... ئازادبووین...

سەرکەوتن - سەرکەوتیم ... سەرکەوتین ...

واتە : وشەیێکی واتادار + قەد + ب + جێناوی لکاوی بێهێز

### ب-تێپەڕ

سادە : گرتن - گرتبم ... گرتبمان ...

کردن - کردبم ... کردبمان ...

واتە قەد + ب + جێناوی لکاوی بەهێز

دارێژراو داگرتن - دامگرتبێ... یاخود - دامگرتبێت

دامانگرتبێ... - دامانگرتبێت

ڕاکردن | ڕامکردبێ ... | ڕامکردبێت
--- | --- | ---
| ڕامانکردبێ ... | ڕامانکردبێت

واته: پێشگر + جێناوی لکاوی بەهێز قەد + ب + جێناوی لکاوی بێ هێز

لێکدراو: ڕێگاگرتن — ڕێگامگرتبێ ... یاخود ڕێگامگرتبێت

ڕێگامانگرتبێ ... ڕێگامانگرتبێت

بەخێوکردن — بەخێومکردبێ ... بەخێومکردبێت

بەخێومانکردبێ ... بەخێومانکردبێت

واته: وشەیێکی واتادار + جێناوی لکاوی بەهێز + قەد + ب + جێناوی لکاوی بێ هێز

## ٤–ڕابوردووی دوور :

### ا–تێنەپەڕ

سادە: بوون — بووبووبامایە ... یاخود بووبوومایە

بووبووبایینایە... بووبووینایە

کەوتن — کەوتبووبامایە... کەوتبوومایە

کەوتبووبایینایە کەوتبووینایە

واته: قەدی هەر کردارێك + قەدی کرداری (بوون) + با + جێناوی لکاوی بێ هێز + ایە

یاخود: قەدی هەر کردارێك + قەدی کرداری (بوون) + جێناوی لکاوی بەهێز + ایە

دارێژراو: دابوون — دابووبووبامایە یاخود دابووبوومایە ...

دابووبووبایینایە دابووبووینایە ...

داکەوتن —داکەوتبووبامایە داکەوتبوومایە...

داکەوتبووبایینایە داکەوتبووینایە ...

واته: پێشگر + قەدی هەر کردارێك + قەدی کرداری (بوون) + با + جێناوی لکاوی بێ هێز + ایە

یاخود: پێشگر + قەدی هەر کردارێك + قەدی کرداری (بوون) + جێناوی لکاوی بەهێز + ایە

لێکدراو: ئازادبوون — ئازادبووبووبامایە یاخود ئازادبووبوومایە

ئازادبووبووبایینایە ئازادبووینایە ...

سەرکەوتن –سەرکەوتبووبامایە        سەرکەوتبوومایە

سەرکەوتبووباینایە        سەرکەوتبووینایە

واتە : وشەی واتادار + قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + با + جێناوی لکاوی بێ هێز + ایە

یاخود : وشەیێکی واتادار + قەدی هەرکردارێک + قەدی کرداری (بوون) + جێناوی لکاوی بێ هێز + ایە

ب–تێپەڕ

ساده    گرتن – گرتبوومانایە ...        گرتبوومایە

کردن – کردبوومانایە        کردبوومایە ...

واتە    قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + با + جێناوی لکاوی بە هێز + ایە

یاخود    قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + جێناوی لکاوی بەهێز + ایە

دارێژاو    داگرتن – دامگرتبووبایە ...    یاخود    دامانگرتبووایە

دامانگرتبووبایە        دامانگرتبووایە ...

ڕاکردن – ڕامکردبووبایە        ڕامکردبووایە ...

ڕامانکردبووبایە        ڕامانکردبووایە ...

واتە : پێشگر + قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + با + جێناوی لکاوی بێ هێز + ایە

یاخود : پێشگر + قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + جێناوی لکاوی بەهێز + ایە

لێکدراو    ڕێگاگرتن – ڕێگامگرتبووبایە ...    یاخود    ڕێگامگرتبووایە

ڕێگامانگرتبووبایە        ڕێگامانگرتبووایە ...

بەخێوکردن –بەخێومکردبووبایە        بەخێومکردبووایە ...

بەخێومانکردبووبایە        بەخێومانکردبووایە ...

واتە : وشەی واتادار + جێناوی لکاوی بەهێز + قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + با + ایە

یاخود : وشەی واتادار + جێناوی لکاوی بەهێز + قەدی هەر کردارێک + قەدی کرداری (بوون) + ایە

تێبینی :

(بـ – bi)و (با)و (ایە) سێ نیشانەی کرداری ڕابوردووی ئینشائین :

١-وا پێدەچێ ئەو نیشانەی (ب - bi)ەی لە پێش ڕەگی ڕانەبوردووی ئینشائی‌یەوە بە ڕەوانی و بێگرێ دێت و دەردەکەوێ ، لە کاتی ڕابوردووشدا هەر هەبێ ، چونکە :

ا-لە کاتی ڕابوردووی بەردەوامدا بە هەمان شێوە خۆی دەنوێنێ - واتە لە سەرەتای بناغەی کردارەکەوە دێت . وەك :

ڕانەبوردوو : بکەوم ... بگرم ...

ڕابوردوو : بکەوتبامایە ... بەگرتبایە ...

ب-لە کاتی ڕابوردووی تەواودا دەکەوێتە دوا قەدی کردارەوە . وەك :

کەوتبم

گرتبم

جـ- لە هەندێ حاڵەتدا ، بەتایبەتی لە کرداری تێنەپەڕی ڕابوردووی نزیکدا ، وا پێدەچێ بە ئەسڵ هەبێ و بۆ سووکردن و ئاسانی ڤووت بدرێ . وەك :

بکەوتبام - کەوتبام

د- واش ڕێ دەکەوێ بە هیچ چەشنێك بەکارناهێنرێ ، جا هۆ ڤورسیی دەربڕین بێ یان هەر شتێکی دی . بەوێنە ، لە کرداری تێپەڕی ڕابوردووی نزیکدا دەوترێ : گرتبام ، کردبام ... و ناوترێ : بگرتبام ، بکردبام ...

٢-نیشانەی (با) هەمیشە بە دوا قەدی کرداردا دێت : (کەوتبام - کەوت + با + م ؛ گرتبام - گرت + با + م ؛ بکەوتبامایە - ب + کەوت + با + م + ایە ؛ بم گرتبایە - ب + م + گرت + با + ایە ...)و ئەمیش گەڵێ جار و لە زۆر ناوچە

قـووت دەدرێ و لـە بریتـی (بکەوتبامایـە ، بم گرتبایـە ، کەوتبووبامایـە ، گرتبووبامایـە ...) دەڵێـن : (بکەوتمایـە ، بم گرتایـە ، کەوتبوومایـە ، گرتبوومایە ...)

٣-لە وشەیەکدا ع هەرسێ نیشانەکە (بـ - bl، با ، ایە) هەبن و ع دوانیان ، هـەرگیز (ایـە) لـە پێـش (بـا)وە نایـەت و (بـا)ش ناکەوێتـە پێـش (بـ - bl)ەوە . وەك :

*بوونی هەرسێ نیشانەکە . وەك :

بکەووتبامایە

ب   با   ایە

*بوونی دوانیان :

١- (ب)و (با) :

بکەوتبام

ب   با

ب_(با)و (ایە) :

کەوتبووبامایە

با   ایە

فۆرمی کاتی ڕابوردووی ئینشائی بە زۆری بۆ مەبەستی داوا و ئـاوات و ئـارەزوو و دوعـا و پاڕانـەوە و مـەرج و پـرس و پێویسـتی و ئیحتیمـال و تەصەوور ... بەکاردێنرێ و لە ڕاگەیاندنی ئەو واتایانەشدا بەتایبەتی ئامراز و وشـەی وەك : (خۆزگە ، کاشـکی ، بریـا ، بـەڵکو ، ئەگـەر ، دەبـوو ، دەبوایـە ، دەبێ ، ڕەنگە ، دەشێ ...) هاریکاری دەکەن .

چەند نموونەیێک :

خۆزگە بڕۆیشتمایە و ڕزگارم بووایە .

کاشکی بمدیایە و کتێبەکەم لێوەربگرتبایە .

بریا بچووبوومایە و گلەییم نەهێنایەتە سەر ـ ۆم .

بریا بمردایە و لەسەر جێگە نەکەوتبایە

بەڵکو کەوتبم و هەستم پێ نەکردبێ .

ئەگەر بچووینایە ، پێیان دەزانی .

دەبوو بمان گرتبایا و تێرمان تێ هەڵبدابایە .

دەبوایە بمان کریبایە

دەبێ زوو هاتبێ و زوو ڕۆیشتبێ

ڕەنگە چووبێ بۆ بازاڕ .

دەشێ گەڕابێ و ئێمەیان نەدۆزیبێتەوە .

... هتد .

لە زمانی کوردیدا لە نێو هەر چوار جۆرە ڕابوردووەکەی ئینشائیدا ، ڕابوردووی بەردەوام لە هەموان پتر بەکاردێ و بە دوا ئەریشدا ڕابوردووی تەواو و ڕابوردووی دوور . هەرچی ڕابوردووی نزیکە یەکجار کەم لە کاردایە .

فۆرمی کاتی ڕابوردووی نزیک بە گشتی بۆ ڕوودانی کارێک لە کاتی ڕابوردوودا بەکاردێنرێ و هەندێ جاریش بۆ ڕاگەیاندنی ڕوودانێک لە کاتی ئێستادا بەکاردەبرێ دیارە هەر لەبەر ئەو هۆیەشە ، کە هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ئەم فۆرمەیان بە (کاتی ڕابوردووی ئێستا ناوبردووە (بەڕێنە ، بڕوانە : چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، ل ٢٠٢) .

ناوبردنی فۆرمی ڕابوردووی بەردەوامیش بە (کاتی ڕابوردووی ئایندە) لەبەر ئەو هۆیەیە ، کە ئەو فۆرمە ئەگەرچی بە گشتی بۆ نیشاندانی ڕوودانێك لە کاتی ڕابوردوودا لە کاردایە ، بەڵام جارجارە بۆ دەربڕینی ڕوودانێك لە کاتی ئایندەشدا بەکاردێنرێ .

لەبەر ئەوەی لە فۆرمی ڕابوردووی تەواودا لەتەك ڕابوردوویيدا هەندێ جار ئایندەیی هەیە ، بۆیە ئەم جۆرە کاتە بە (کاتی ڕابوردوو - ئایندە - مەرجی)ش ناودەبرێ .

هەرچی فۆرمی ڕابوردووی دوورە بۆ ڕاگەیاندنی کاتی ئێستا یان کاتی ئایندە بەکارنابرێ . وا دیارە ، کە ئەم فۆرمە بە (کاتی ڕابوردوو) ناودەبرێ ، لەبەر ئەوەیە ڕوودان تەنیا لە کاتی ڕابوردوودا نیشان دەدا .

* * *

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا چۆن کردار لە ڕێژەی ئیخباریدا چوار جۆر ڕابوردووی هەیە و تەنیا تێنەپەڕەکانیان جێناوی لکاو (دەستەی بڕهێن) وەردەگرن ، لە ڕێژەی ئینشائیشدا بە هەمان چەشنە .

١-ڕابوردووی نزیك :






واتە : قەدی کردار + ب + جێناوی لکاوی بێ‌هێز

٢-ڕابوردووی بەردەوام :







واتە : ب + قەدی کردار + ا + جێناوی لکاوی بێ‌هێز + ا

٣-ڕابوردووی تەواو :






واته : ب + قەدی کردار + ا + جێناوی لکاوی بێهێز + ا

٤-ڕابوردووی دوور :







واته : قەدی هەر کردارێك + قەدی کرداری (بوون) + ا + جێناوی لکاوی بێهێز + ا

تێبینی :

١-بە ڕواڵەت لەوە دەچێ نیشانەی (با)و (ایە)ی کرمانجیی خواروو لە کرمانجیی ژووروودا هەر (ا)یەکەیان مابێ و دەنگەکانی دیان تێدا چووبن - واتە (ب)ی (با)و (یە)ی (ایە) نەمابن . ئەگەر ئەمە وابێ ، ئەوە دەتوانین بڵێین نیشانەکانی ڕێژەی ئینشائیی هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردی وەك یەکن - واتە چۆن لە کرمانجیی خوارروودا (ب)و (با)و (ایە) [٢٢٠] سێ نیشانەی گرنگی

---

[٢٢٠] ئەو (ایە)یەی کوردی لە زمانی پشتۆدا لە قاڵبی (ای)دا دەبینرێ ، وەك "کە تا لیدلای" (ئەگەر تۆ بتدیایە) ... (ن. ئا. دفۆریانکۆف ، زمانی پشتۆ ، ل٧١ .

رێژەی ئینشائی ، لە کرمانجیی ژووروشدا بە هەمان چەشنە و تەنیا ئەوەندە هەیە کە (با)و (ایە)یان بەر یاسای سوانی دەنگ کەوتوون :

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی خواروو |
| --- | --- |
| بکەتابا | بکەوتبامایە |
| ب ا ا | ب با ایە |
| کەتبوویاما[٢٢١] | کەوتبووبامایە |
| ا ا | با ایە |

ئەوەی لەو بەرانبەر یەکتر راگرتنە رواڵەتییە گرنگتر بێ ، ئەوەیە کە لە زمانی ئاوێستادا (ا) نیشانەی رێژەی ئینشائییە[٢٢٢]. لە گەردانی کرداری جۆری دووەم و سێیەم و چوارەمی زمانی لاتینیدا هەر (ا) نیشانەی ئەو رێژەییە و لە کۆتایی بناغەوە دێت[٢٢٣] (بەرێنە : recipi – a – m – بەرد – با – م) ... بەو پێیە دەبێ (ا)یەکەی کرمانجیی ژووروو وەك ئەسڵەکەی مابێ و گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێ ، بەڵام لە دیالێکی کرمانجیی خوارووا لێی زیاد کرابێ و بووبێ بە (با)و (ایە) .

٢-فۆرمی رابوردووی بەردەوام و فۆرمی رابوردووی تەواو لە کرمانجیی ژوورووا خاوەنی یەك پێکهاتنن ، بەڵام لە کرمانجیی خوارووا فۆرمیان جیاوازە .

---

[٢٢١] دیارە لێرەشدا بۆنە (ی – y) پەیدابووە ، چونکە (ا) بە دوا (وو)دا هاتووە و دوو بزوێن پێکەوە نایەن .

[٢٢٢] بڕوانە : س. ن. سوکولۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٩٥ – ٩٦ .

[٢٢٣] بڕوانە : ن. م. لێمیگ ، زمانی لاتینی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ١٠١ – ١٠٢ .

## -٣-

# ڕێژەی داخوازی

واتای گشتیی ڕێژەی داخوازی ، فەرمان و داوا و تکاو ورباکردنەوەیە بۆ بەجێهێنانی کارێك لە لایەن کەسێکەوە (تاك) ، یان چەند کەسێکەوە (کۆ) . لە ڕووی کاتەوە تەنیا ئێستا و ئایندەی هەیە و ڕابوردووی نییە . لە ڕووی کەسەوە تەنیا فۆرمی کەسی دووەمی تاك و کۆی هەیە و کەسی یەکەم و سێیەمی نییە . ئەم ڕێژەیە نیشانە و پێکهاتنی تایبەتیی خۆی هەیە . کەرەستەی پێکهێنانی بریتییە لە ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار و نیشانەی (ب – b؛ بـ – bi) لە پێشییەوە[٢٢٤] و جێناوی کەسیی لکاو لەدوایەوە ("ە" بۆ کەسی دووەمی تاك و "ن – n، ن – in" بۆ کەسی دووەمی کۆ) . وەك :

---

[٢٢٤] کردار سادەبێ یان ناسادە ، نیشانەی (بـ) لە پێش ڕەگەکەیەوە دێت . وەك ؛

سادە ؛ فڕین – بفڕە

کڕین – بکڕە

داڕێژراو ؛ هەڵگرتن – هەڵ بگرە

داخستن – دابخە

لێکدراو ؛ فریاکەوتن – فریابکەوە

خێراکردن – خێرابکە

تێنەپەڕ :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | + | وەست (وەستان) | + | ە / ن | - | بوەستە / بوەستن |
| ب | + | فڕ (فڕین) | + | ە / ن | - | بفڕە / بفڕن |
| ب | + | ب (بوون) | + | ە / ن | - | ببە / ببن |
| ب | + | مر (مردن) | + | ە / ن | - | بمرە / بمرن |
| ب | + | کەو (کەوتن) | + | ە / ن | - | بکەوە / بکەون |

... (٣٢٥)

تێپەڕ :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ب | + | هێن (هێنان) | + | ە / ن | - | بهێنە / بهێنن |
| ب | + | کڕ (کڕین) | + | ە / ن | - | بکڕە ، بکڕن |
| ب | + | خوێن (خوێندن) | + | ە / ن | - | بخوێنە ، بخوێنن |
| ب | + | گر (گرتن) | + | ە / ن | - | بگرە ، بگرن |

... هتد (٣٢٦)

---

(٣٢٥) لێبووە بە خوێنی عاشقە ، ئەی دڵ ؛ ببە بە خوێن
ئەو لێوە ، مژدە بێ ، دڵی پڕ خوێو نە کەرمەك

(مەحوی ، ل ١٩٢)

بۆ وەفاکردن بە وەعدەی هاتنی بمرە ، وتی
کەس نیە ئیحتاری کا وا هاتوە وادەی وەفات

(مەحوی ، ل ٥٧)

(٣٢٦) لەسەر مەیتی بخوێنە
وەفای جوانی بنوێنە

(گۆران ، ل ٨٨)

کەسی دووەمی تاکی ڕێژەی داخوازی جێناوی کەسیی لکاوی (ە) وەردەگرێ و کەسی دووەمی کۆش (ن) . ڕێژەی داخوازی فۆرمی کەسی یەکەم و سێیەمی نی‌یە ، چونکە فەرمان و داوا و تکا ، کە سەرجەمیان داخوازین ، بۆ بەجێ هێنانیان ڕوودەکرێتە کەسی دووەم . بەڵێ کاتێ ئامرازی وەك (با ، دەبا ...) لەگەڵ کەسی یەکەم یان سێیەمدا بەکاردێنرێ : (با بڕۆین ، دەبا بڕۆین ... با بڕوا ، دەبا بڕوا ...) [٢٢٧] کەمێ واتای داخوازی تێدایە ، بەڵام لە ڕاستی‌دا ئەمە ڕێژەی ئینشائی‌یە ، نەك داخوازی [٢٢٨] .

---

ڕێژن لە پیاو بکرە و گەنم لە ژن .

(پەندی پێشینان ، ل ٢٥٠)

قاسید وتی پێم ، بگرە سەبر ، خانم ئەوا دێت !

سافەرموو ، سەبر بێ بە فیدای خاکی بەری پێت !

(گۆران ، ل ٣٦)

[٢٢٧] با شەو بڕوا سەحەر بێ ، باغی گوڵان وەبەر بێ

گەر تۆ مەیلت لەسەر بێ ، کافر ئیسلامی ناوە

(وەفایی ، ل ١٥٢)

بەسەر پایزی زەردا با بە خەیر بگری ، بە گوڵ بگری

لەسەر ئاخر گەڵا ، ئاخر چڵی لەنیایی گوڵ بگری !

(گۆران ، ل ١٦٥)

[٢٢٨] شایانی باسە ، مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانیش لەو ڕایەدایە ، کە ئە جۆرە ڕێژانە ، ڕێژەی داخوازی نین و لەو بارەوە ، دەڵێ : "دیارە ، کاری فەرمان ، هەمیشە لە نێوان دوو کەسدایە ، فەرمان لە یەکەمەوە دەردەچێ ، دووەم جێبەجێی دەکات ، ئەگەر ... بە هۆی سێیەمەوە گەیەندرا بە دووەم ... لەو وەختە لە شێوەی فەرمانی دەردەچێ ... بڕۆم ... بڕوا " (زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا ، ل ٢٠٤) .

ئەو کردارەی ڕەگی کاتی ئێستای کۆتایی بەدەنگی نەبزوێن دێت ، لە ڕێژەی داخوازیدا بە ئاسانی جێناوی کەسی لکاوی (ە) یان (ن) وەردەگرێ . وەك :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بـ | + | نووس (نووسین) | + | ە / ن | - | بنووسە / بنووسن |
| بـ | + | ماڵ (ماڵین) | + | ە / ن | - | بماڵە / بماڵن |
| بـ | + | مژ (مژین) | + | ە / ن | - | بمژە / بمژن |
| بـ | + | خەو (خەوتن) | + | ە / ن | - | بخەوە / بخەون |

...[٣٣٩]

ئەگەر ڕەگی کاتی ئێستای کردار کۆتایی بە دەنگی بزوێن بێت ، ئەوە وەك حاڵەتی نەبزوێن بۆ کەسی دووەمی کۆ جێناوی لکاوی (ن) وەردەگرێ ، بەڵام هەرچی جێناوی لکاوی (ە)ی کەسی دووەمی تاکە بە شێوەیێکی دی دەبینرێ .

١-کەسی دووەمی کۆ :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بـ | + | گەڕێ (گەڕان) | + | ن | - | بگەڕێن |
| بـ | + | نوو (نووستن) | + | ن | - | بنوون |

[٣٣٩] لە سندووقی پری سینەم بترسە
کە ئاگر بەربداتە تەخت و تابووت

(نالی ، ل ١٤٩)

وا خەمی ممە ڕوخسارەیی تۆ غائیبە قوربان
بنوارە چلۆن نەقشە لەنێو دیدەیی تەڕما

(نالی ، ل ١٤٩)

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ب | + | كە (كردن) | + | ن | - | بكەن |
| ب | + | ڕۆ (ڕۆیشتن) | + | ن | - | بڕۆن |

... هتد[330]

٢–کەسی دووەمی تاك :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ب | + | گەڕێ (گەڕان) | + | ە | - | بگەڕێ |
| ب | + | نوو (نووستن) | + | ە | - | بنوو |
| ب | + | كە (كردن) | + | ە | - | بكە |
| ب | + | ڕۆ (ڕۆیشتن) | + | ە | - | بڕۆ |

... هتد[331]

---

[330] ڕێگەی هەوا طەریقەتی عیشقە ، دە "مەحویا"

وەرن و ڕیا بڕژێن و (و صلوا علی الرسول)

(مەحوی ، ل ٣٠٨)

[331] وەك هەنگ بگەڕێ و گوزرانی بلێ ،

لادە چار جارێ بۆ بەرینی گوڵێ .

(گۆران ، ل ١٥٣)

گشت هاوارێانە لە بەختی نوستوو

من هاوار ئەكەم بەختە زوو بنوو

(پیرەمێرد ، ل ١٥٠)

هەم هەم عەنانی ئاهم و ، هەم هەم ڕیكابی ئەشك

ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشكە بكە ، هەستە بێ قوصوور

(نالی ، ل ١٧٧)

لەبەر ئەوەی (ن) دەنگی نەبزوێنە بە ئاسانی بەدوا ئەو جۆرە ڕەگانەدا دێت ، بەڵام (ە) ، کە خۆی بزوێنە ناشێ بەدوا بزوێندا بێت ، چونکە لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن پێکەوە نایەن و لەبەر ئەوە تێ دەچن .

لە هەندێ ناوچەی کوردەواریدا ، بەتایبەتی لە کردلری ، وەك : (بنوو ، بخۆ ...)دا ، کە کۆتاییان بە (وو ، ۆ) هاتووە ، دەگۆڕێن بە (ۄ - W)ی نەبزوێن و جێناوی کەسیی لکاوی (ە) وەردەگرن . وەك :

بنوە .

بخوە

...

تەنانەت لە شێوەی سلێمانیشدا ، ئەم دیاردەیە بەرچاو دەکەوێ ، کە هەندێ جار لە بریتی (بدروو ، ببزوو ، بسوو ، بگروو ...) فۆرمی (بدروە ، ببزوە ، بسوە ، بگروە ...) بەکاردەبرێ .

کرداری (چوون) ، کە (چ - či) ڕەگی کاتی ئێستایەتی ، لە ڕێژەی داخوازیدا (ۆ) وەردەگرێ : (بچۆ)[٢٣٢].

فۆرمی (بچۆ) لە هەندێ بەشە دیالێکتی کوردیدا لە شێوەی (بچە) یان (بچوو)دا بەرچاو دەکەوێ .[٢٣٣]

---

-

هەرملێمك سەختە ، بڕۆ بیگرە .

(پەندی پێشینان ، ل ٤٩)

[٢٣٢] د. زاری یوسف لەو بارەیەوە نووسیویە دەڵێ : "دەشێ ئەم فۆرمە بەهۆی ولێکچوونی لەگەڵ فۆرمی داخوازیی کرداری (ڕۆیشتن) - (بڕۆ)وە دروست کرابێ" (دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، ل٩٨) .

[٢٣٣] بڕوانە : دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، ل ٤٩ ؛ د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، ل ٤٧ ...

کرداری (هاتن) ، کە ڕەگی کاتی ئێستای (ێ)یە ، بەپێی دەستوور لە ڕێژەی داخوازیدا دەبێ بە (بێ ، بێن)و ئەمەش لە گەڵ شوێندا بەکاردێنرێ . بەڵام ئەم کردارە شێوەیێکی دی هەیە ، کە (وەرە ، وەرن )ە[٢٣٤] و تەنیا جێناوەکان بەپێی دەستوورە گشتییەکەی دروست بوونی ڕێژەی داخوازین ، دەنا نە (وەر) ڕەگی (هاتن)ە و نە (بـ) لە ناواندا هەیە .[٢٣٥]

شایانی باسە ، لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، ڕێژەی داخوازی بە هەمان شێوازی دیالێکتی کرمانجیی خواروو دروست دەبێ واتە : (بـ + ڕەگی کاتی ئێستای کردار + جێناوی کەسیی لکاو) . وەك :

بـ + نڤیس (نڤیسین) + ە / ن - بنڤیسە / بنڤیسن

بـ + کەڤ (کەڤتن) + ە / ن - بکەڤە / بکەڤن

---

[٢٣٤] ئۆ کە حۆرت ، وەرە تێ جەننەتی دیدەم . چ حەکەی

بەم دڵەی پڕ لە شەرەر و سینەیی سۆزانەدا !!

(نالی ، ل ٩١)

ڕێکەی هودا تەریقەتی عیشقە ، دە " مەحویا "

وەرن و بیا بڕۆن و (صلوا علی الرسول)

(مەحوی ، ل ٢٠٨)

[٢٣٥] د. نەسرین دەربارەی ڕێژەی (وەرە) نووسیویە ، " (وەرین) بە مانای (هاتن) دێ . ئەم کارە لە کرمانجیی ژووروودا ماوە ، بەڵام لە کرمانجیی نێوەڕاستدا ، تەنیا دەمکانی فەرمان ، واتا (وەرە) ماوە " (زمانی یەکگرتووی کوردی ، ل ١٠٦ ، پ ٥٠) . لەو فەرهەنگە کوردییانەی لەبەر دەستمان بە هیچ جۆرێك (وەرین) بە واتای (هاتن) لێك نەدراوەتەوە (بڕوانە ، ق. کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی - ڕووسی ، ل ٧٨٨ ...) . جەرکەزی بەکۆش بوون و ئاشکرا لە پاڵ وشەی (وەرە)دا نووسیویە ، "ڕێژەی داخوازی تاکی کرداری (هاتن)ە " (ل ٥٠٣) . بەڵام هێندە هەیە ، کە لە فەرهەنگەکەی قەناتی کوردۆدا ، وشەی (وەرانین) ، نەك (وەرین) مانای جوارەمی بە (هێنان) ، نەك (هاتن) لێك دراوەتەوە (بڕوانە ، ل٧٨٧) .

... (٣٣٦)

وێکچوونی ڕێژەی داخوازیی هەردوو دیالێکتە سەردکییەکەی کوردی بە چەشنێکە ، کە لە هەموو سەرێکەوە یەکدەگرنەوە . بۆ نموونە ، نەك هەر ئەو نموونانەی سەرەوە ، کە ڕەگی کاتی ئێستایان کۆتایی بە دەنگی نەبزوێن هاتووە و بە هەمان شێوەی کرمانجیی خواروو جێناوی (ە)و (ن)یان وەرگرتووە ، بەڵکو ئەو ڕەگانەش ، کە کۆتاییان بە دەنگی بزوێن دێ ، بە یەك چەشن خۆیان دەنوێنن - واتە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، ئەگەر ڕەگی کاتی ئێستای کردار کۆتایی بە دەنگی بزوێن بێت ، ئەوە وەك حاڵەتی نەبزوێن بۆ کەسی دووەمی کۆ جێناوی لکاوی (ن) وەردەگرن ، بەڵام بۆ کەسی دووەمی تاك هەرچی جێناوی (ە)یە دەرناکەوێ :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|
| بدروو | بدروو |
| بچوو | بچوو |
| بکە | بکە (٣٣٧) |
| ... هتد . | |

---

(٣٣٦) ... بێژە ، خودێ ژ کێ ستاندییە ...

(کوردیل ، ل ٣٥)

بمنگین یەك شاندە بەر بەحرێ ، گۆت : "لاو هەلە هەرە بنێرە ج داعوا ڤان خەلکان ؟

(مەمێ ئالان ، ل ٤٢)

(٣٣٧) پرسیارێ ل مە جارەك بکە شیرین دەمعنا من

کو بەرێتینە فراقا تە ل سەر دەرد و غەمێ

(جزیری ، ل ٤٢٠)

لە هەندێ ناوچە ، بەتایبەتی سەر بە دیالێکتی ژووروودا ، لە باری تاکدا (ە) تێدەچێت . وەك :

بخور ، بکوژ ، بفروش ، بکر ، بمر ...[228]

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ڕێژەی داخوازی (چوون ، ڕۆین) دەبێتە (هەرە)[229] و هی (ئانین)یش دەبێتە (وەینە) . هەرچی (هاتن)ە وەك کرمانجیی خواروو (وەرە)یە .[240]

دروست بوونی ڕێژەی داخوازی لە دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا ، وەك یەکە و لە باری مۆرفۆلۆژی‌یەوە جیاوازی‌یان لە نێواندا نی‌یە . ئەوەتە لە بەشە دیالێکتی هەورامانیشدا هەر لە (بـ + ڕەگی کاتی ئێستا + جێناوی لکاو) پێك دێ . وەك : بتاشە ، بچنە ، بکێشە ...[241]

---

[228] بڕوانە : ق. کوردۆییڤ ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، ل ٢٠٨ – ٢٠٩ ؛ جگەر خوێن ، ئاوا ئو دەستوورا زمانی کوردی ، ل ١٥٤ ... بەلام من وای بۆ دەچم ، کە ئەمە ئەفسیری زمانی فارسی بێت .

[229] بەنگین یەك ساندە بەر بەحری ، گۆت : "لاو هەلە هەرە بنێرە چ داموا ڤان خەلکانە !

(مەمی ئالان ، ل ٤٣)

... گۆت "هەرن ، ئیرۆ ئێڤارێ عەلی مەمەدێ ل ئۆدا خوەدا ڕۆنێ ...

(کوردۆ ، ل ٣٦)

[240] ... دبێژە : "زوو وەرە ، شیر بەژە ..." .

(کوردۆ ، ل٤٢)

[241] بڕوانە : محەممەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٢٠٣ – ٢٠٤.

تێبینی :

١-ئەوە بەرچاو دەکەوێ ، کە هەندێ جار لە دیالێکتی خوارووودا (وە)و لە دیالێکتی ژووروودا (ئـە) لـە بریتـی (بـ)ی نیشـانەی داخـوازی بـەکاردەبرێن . وەك :

وەکە ، وەخۆ ...

ئەکە ، ئەخۆ ...

٢-لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا دیاردەیێکی یەکجار تایبەتی و سەرنج ڕاکێش هەیە و بەڵگەش وا ڕادەگەیەنن ، کە لە زوودەوە هەبووبێ ، چونکە چۆن ئەمڕۆ بەکاردێنرێ ، لە شیعری شاعیرانی زووی ناوچەکەدا ، بە هەمان شێوە دەبینرێ . ئەو دیاردەیەش ئەوەیە ، کە پاشکۆی (-رە) دەخرێتە سەر کۆتایی هەندێ کرداری داخوازیی تاك . وەك :

چوون - بچۆ ، بچۆرە

ڕۆیشتن - بڕۆ ، بڕۆرە

هاتن - بێ ، بێرە

بردن - ببە ، ببەرە

خستن - بخە ، بخەرە

شتن - بشۆ ، بشۆرە

مانەوە - بمێنەوە ، بمێنەرەوە

ڕشتن - بڕێژە ، بڕێژەرە

سڕینەوە - بسڕەوە ، بسڕەرەوە

... هتد .[242]

بە وێنە :

گەر بێ خەبەری لەم ئەحوالانە

شەوی بچۆرە ئەو چاخانانە

(بێکەس ، ل١٠٦)

بلێ : بە قوربان ، تۆ ناوت پاکە

بمانخەرە ڕێی یەکێتی و چاکە

(پیرەمێرد ، ل١٣٤)

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ سەیرانت دەوێ

بت بەمە قەندیل ئەگەر گولزاری کوێستانت دەوێ

(ئەسیری ، ل ٣٩)

٣-لە وتنی وشەی ناسادەدا بە زۆری (ب)ی داخولزی تێدەبڕێ . وەك :

دانیشە - دابنیشە

ڕاکە - ڕابکە

ڕاخە - ڕابخە

سەرخە - سەربخە

فریاکەوە - فریابکەوە

خێراکە - خێرابکە

... هتد .

(٢٤٢) واش پێدەچێ ، کە ئەو (رە)یە بە شێوەیەکی سەرەکی بخرێتە سەر ئەو کردارانەی ڕەگیان بە بزوێن کۆتایی دێت . ئەوەتە لەو نموونانەدا ، کە هێناومانەتەوە ، تەنیا دوا دوو کرداریان کۆتایی ڕەگیان نەبزوێنە .

بەوێنە :

ئەی شێوە شۆخ ، ئەی پەری !

دانیشە لای ژوور سەری ،

(گۆران ، ل٩٠)

وەتەن هەڵڕێژە ئەشکی خوێنینت

با بەرز بێ سەدای شین و ناڵینت

(بێ کەس ، ل٦٢)

سەیرکە هام فەردان ، هام دەردو هام مەشق

نازك خەیاڵان ماسیی دەریای عەشق

(پیرەمێرد ، ل٢٤٤)

گەر ئێشی ڕۆحتە ، کە نەبوو کەس بە دەستەوە

دەستهەڵگرە لە ڕۆح و مەبە ئیلتیجا بە کەس

(مەحوی ، ل١٤٧)

فۆرمی ڕێژەی داخوازی لە زمانە ئێرانی‌یەکانی دیشدا وێنەی یەکێتی لەگەڵ کوردی نیشان ئەدەن :

لە زمانی بلووجیدا فۆرمی تاکی داخوازی بە خستنەسەری نیشانەی (بـ b ، بـ bl) بۆ سەر ڕەگی کاتی ئێستای کردار پێك دێ . وەك :

بپرۆش (بڕووخێنە)

برە (برۆ)

بۆ پێکهێنانی کۆ (it)ی جێناوی کەسیی لکاوی کەسی دووەمی کۆ ئەخرێتە سەر ڕەگی کردارەکە . وەك :

بپرۆشت (بپرووخێنن)

برەت (بڕۆن) [٢٤٣]

لە زمانی پشتۆدا کردلری داخوازیی تاك لە ڕەگی کردلری کاتی ئێستا و (ە، پێك دێ . وەك :

گۆرە (بڕوانە)[٢٤٤]

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بۆ کەسی دووەمی تاك ، ڕەگ بە ڕووتی بەکاردێ و لە حاڵەتی کۆشدا (ێت) دەخرێتە سەر ڕەگ . وەك :

کەرتەن (کردن) :

ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی (کون)ە

کون (بکە)

کونێت (بکەن)

کەمێن جاریش لە حاڵەتی کەسی دووەمی کۆدا کۆتایی ێ (ە) بەرچاودەکەوێ . وەك :

بەرێە (ببەن)

کەنێە (بکەن) [٢٤٥]

---

[٢٤٣] ل. ئا. فورژئۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٤٢.

[٢٤٤] ن. ئا. دفۆریانکۆف ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٥٣ .

[٢٤٥] ل. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٩٠ – ٩١ .

# کرداری یاریدەدەر

ئەرکی ڕێزمانیی کرداری یاریدەدەر بریتی‌یە لە نیشاندانی پێوەندیی شتێك یان دیاردەیێك بەخاسیەتی‌یەوە: ئەو ئازا بوو ؛ ئەو بوو بە مامۆستا ... هتد . لە دەربڕینی ئەم پێوەندی‌یەدا واتای ڕێزمانیی کرداری یاریدەدەر هاوبەشە . وێڕای ئەوە ، هەر یەکەشیان خاوەنی تایبەتێتی واتای سەربەخۆی خۆیەتی .

بێگومان ، ئەو کردارەی واتای جۆربەجۆری هەیە ، دەشێ بەتایبەتی پێوەندیی نێوان واتای و دۆخی ڕێزمانی‌یەکەی وەك یەك نەبن . لەباری ڕوونیی واتای لێکسیکی‌دا ، واتای ڕێزمانی دەکەوێتە پلەی دووەمەوە ، بەڵام لە حاڵەتی کزبوونی واتای لێکسیکی‌دا دێتە پلەی یەکەم . بەو پێیە ، ئەگەر کرداری خاوەن واتای تەواو دەوری یاریدەدەری ببینن ، ئەوە بە واتای لێکسیکیی ڕوونەوە خۆی دەنوێنن و واتای هاوبەشیان زۆر ئاشکرا نی‌یە... لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی ژمارەیێك لەو جۆرە کردارانە بەرچاو دەکەون ، بەڵام ڕادەی هەرە دیاری کزبوونی واتای لێکسیکی لە کرداری (بوون)دا دەبینرێ .

(بوون) چاوگێکی تێنەپەڕە .

قەدی ئەم کردارە ، وەك هەموو چاوگێکی کوردی بە لێکردنەوەی (ن)ی چاوگ سازدەبێ :

بوون – ن = بوو

هەرچی چۆنێتی وەرگرتنی ڕەگەکەیەتی ، وەك کردای (چوون)ی تێنەپەڕی هاوەڵی بەر ڕێکە بنەڕەتی‌یەکە دەکەوێ - واتە لابردنی (ن)ی چاوگ و دەنگەکەی پێشەوەی (وو) -

بوون - وون - ب

(بوون) وەك کرداری بوونەك (فعل الکینونة) بە مانای (کان ، اصبح ، صار ...) دێت - واتە (کان واخواتها)ی عەرەبی دەگرێتەوە .

کرداری (بوون) بە هەر واتایێك بێت و وەك کردارێکی تەولو لە مەیداندا بێ ، یان وەك کردارێکی یارێدەدەر دەور ببینێ ، لە ڕووی ڕێژە و کات و ئەرێتی‌یەوە وەك گشت کردارێکی تێنەپەڕی دی خۆی دەنوێنێ :

# -باری ئەرێتی-

## -١-

## ڕێژەی ئیخباری

١-کاتی ڕانەبوردوو :

دە / ئە - ب - م [٢٤٦]

دە / ئە - ب - ین

...

واتە بۆ پێکهێنانی فۆرمی ڕانەبوردووی ، نیشانەی (دە / ئە) دەخرێتە پێش ڕەگی کاتی ڕانەبوردوویەوە و بە دوا ڕەگەکەشیدا جێناوی لکاوی بێ‌هێز دادەنرێ .

[٢٤٦] کابراکە پیاوێکی باش بوو ، ولێ هەزار جاریش مەنوونیش ئەبم

(لە خەوما ، ل ٣٠)

٢-کاتی ڕابوردوو :

ا)ڕابوردووی نزیک

بوو - م

بوو - ین

...[٢٤٧]

واتە : قەد + جێناوی لکاوی بکەر

ب)ڕابوردووی بەردەوام

دە - بوو - م

دە - بوو - ین

...[٢٤٨]

واتە : نیشانەی (دە / ئە) + قەد + جێناوی لکاوی بکەر

ج)ڕابوردووی تەواو

بوو - م bûwim

بوو - ین bûwîn

---

(٢٤٧) دەمێک بوو چاوەڕێی بەهارێکی وا بووم مژدەبێ باری

سەرم بخوە کەچی هێشتا شەرمنۆکانە بۆ یاری

(پیرەمێرد ، ل ١٢٥)

... لەبەر ئەو باران و ڕەهێڵەیە ، نیو سەعات زیاتر بەم گێرمە و کێشەیەوە بووین ...

(لە شەڕدا ، ل ٣٢)

(٢٤٨) چی دەبوو بەفر شەکر بوایە

سەرمایە نەبوو بۆ ئەم سەرمایە

(پیرەمێرد ، ل ١٢٨)

...[٢٤٩]

واته : قەد + نیشانەی (وو) + جێناوی بێهێز

د)ڕابوردووی دوور

بوو - بوو - م

بوو - بوو - ین

...[٢٥٠]

واته : دووپات بوونەوەی قەد + جێناوی لکاوی بێهێز

---

[٢٤٩] ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری (کالنی‌ها) ،

یاخۆ بووە بە تەریقەیی شۆرش و نشوور !!

(نالی ، ل ١٨٦)

گوڵە پڕ بووە لە ئەفسانەی دڵداری ،

بە لەعنەت بێ زوهرەی جوانی و عەیاری ،

(گۆران ، ل ٣٧)

[٢٥٠] ڕێم هەموو بووبوو بە بلۆق ...

(لە خەوما ، ل ٢٩ — ٣٠)

لە ڕێکاکانا گوڵمزمرد یەکسەر

بووبووە زنجیرەی تەلای پشتەسەر

(پیرەمێرد ، ل ١٤١)

-٢-

# ڕێژەی نیشانی

١-کاتی ڕانەبوردوو :

ب - ـبـ - م

ب - ـبـ - ین

... (٢٥١)

واتە : نیشانەی (ب) + ڕەگ + جێناوی لکاوی بێهێز

٢-کاتی ڕابوردوو :

أ)ڕابوردووی نزیک

بوو - با - م

بوو - با - ین

...

(٢٥١) لامەعە "نالی" لە ئەنباری جیرانەی سالەکان

گەرچی بیبە خۆشەچینی مانەبی خەرمانی ڕەزم

(نالی ، ل ٣٠٤).

لەبۆ حەرامە زەڕەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق

بێی بە شێر و مەگەر هەڵگری لە دنیا دەست

(مەحوی ، ل ٧٠)

واتە : قەد + نیشانەی (با) + جێناوی لکاوی بێهێز

ب)ڕابوردووی بەردەوام

ب - با - م - ایە یاخود ب - بوو - م - ایە

ب - با - ین - ایە ب - بوو - ین - ایە

... (٢٥٢)

واتە : ب + قەد + با + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە

یاخود : ب + قەد + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە

ج)ڕابوردووی تەواو

بوو - ب - م

بوو - ب - ین

...

واتە : قەد + ب + جێناوی لکاوی بێهێز

د)ڕابوردووی دوور

بوو - بوو - با - م - ایە بوو - بوو - م - ایە

بوو - بوو - با - ین - ایە بوو - بوو - ین - ایە

...

واتە : دووپات بوونەوەی قەد + با + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە

یاخود : دووپات بوونەوەی قەد + جێناوی لکاوی بێهێز + ایە

---

(٢٥٢) زەمانێکی زۆر خۆش بوو برادەر

کاتێکی هەر لێرا بووبایە برادەر

(بێکەس ، ل٩٠)

-٣-

## ڕێژەی داخوازی

ب – بـ – ە

ب – بـ – ن [٢٥٣]

واتە : کەرەستەی پێکهێنانی بریتی‌یە لە ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی و نیشانەی (بـ – bi) لە پێشی‌یەوە و جێناوی کەسیی لکاو لە دوایەوە ( "ە" بۆ کەسی دووەمی تاك و "ن" بۆ کەسی دووەمی کۆ .

### باری نەرێنی

١–لەگەڵ فۆرمی ڕانەبوردووی ئیخباری‌دا ئامرازی (نا) بەکاردێنرێ :

نا – بم

نا – بین

... [٢٥٤] یاخود

٢–لە ڕانەبوردووی ئینشائی و گشت جۆرێکی ڕابوردووی ئیخباری و ئینشائی‌دا (نە) وەردەگرێ . وەك :

---

[٢٥٣] ... کورە ... ڕوونەوە بن

(لە خەوما ، ل ٣٢)

[٢٥٤] فەضیلەی نەسل و فەسڵ ئیسانی پێ نابێ بە صاحیب فەضل

کە تۆ کۆنەی ، بە تۆ چی مامە ڕیشی باب و باپیرت !

(مەحوی ، ل ٦٧)

*رانەبردووی ئینشائی :

نە - بم

نە - بین

... [255]

| ئینشائی | ئیخباری | رابوردوو |
|---|---|---|
| نەبووبام | نەبووم | ١-نزیك |
| نەبووبامایە | نەدەبووم | ٢-بەردەوام |
| نەبووبام | نەبووم nebûwim | ٣-تەواو |
| نەبووبوومایە ... [257] | نەبووبووم ... [256] | ٤-دوور |

---

[255] داخۆ نەبی بە هەمبەری سارایی (خاك و خۆڵ)
هەتا نەکەی بە خاکی (سولەیمانی)یا عوبوور

(نالی ، ل ١٨١)

جیلوەت لە چاوم ون نەبێ
هەرگیز لای تۆ نوستن نەبێ !

(گۆران ، ل١٤)

[256] من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم با لێنەگەی
حەپس و لێهەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە

(بێکەس ، ل ٥٥)

داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام)!؟
پیرو تولاندە لەمن نەبووە (داری پیرەمەسوور)!؟

(نالی ، ل١٨)

[257] دەموت دو چاوی خۆمە ئەگەر (بەکرەجۆ)یی لەشك
نەبوایە لیژ و بێ پەمەر و گەرم و سوێر و سوور

(نالی ، ل١٨٠)

٣-بۆ داخوازی (مە)ی دەچێتە سەر :

مەبە

مەبن

... [٢٥٨]

کـردارى (بـوون) بـە چەشـنى کـردارى (کـردن) لـە پێکـهێنانى کـردارى لێکدراودا دەورێکى گەورە دەبینێ و یارێدەى ڕۆنانى سەدان کـردارى وەك : (ڕەش + بوون – ڕەش بوون ؛ سوور + بوون – سووربوون ؛ گەورە + بوون – گەورەبوون ؛ پیر + بوون – پیربوون ؛ هار + بوون – هاربوون ؛ هەژار + بوون – هەژار بوون ؛ گەرم + بوون – گەرمبوون ؛ جوان + بوون - جوانبوون ؛ شیر + بوون – شیربوون ؛ خڕ + بوون – خڕبوون ؛ پڕ + بوون – پڕبوون ... سەرما + بـوون – سـەرمابوون ؛ گـەرما + بـوون – گـەرمابوون ؛ ئامـادە + بـوون – ئامادەبوون ؛ سوار + بوون – سواربوون ... دەر + بوون ، دەربوون ... یـەك + بـوون – یـەك بـوون ...) دەدا و هاریکـارى دەیـان کـردارى داڕێـژراوى ، وەك : (دابوون ، ڕابوون ، هەڵبوون ، تێدابوون ، پێوەبوون ...) دەکا و لـە سـازکردنى چەندین وشەى وەك (بووە ، بوونەوەر ...) بەشدار دەبێ .

ئەم کردارە لـە حاڵەتى ناسادەییشدا وەك حاڵەتى سادەى کات و ڕێـژە و نەرێتى بەپێى دەستوور دەڕوا .

کێشەى کردارى (بوون) لەوە ئاوکێشتر و فرەلایەنتر و پڕ دەمەتەقێتره ، کە باسمان کرد . کێشەى بنەڕەتى‌یش ئەوەیە : ئایا ئـەم کـردارە کردارێکـى

---

[٢٥٨] بەر خودایە و بەس ، لە شەیطانی شەقی "مەحوی" پەناە

پەس لە غەدری شەیطەنەت پیشە مەبە بەر کەس شکات

(مەحوی ، ل٦١)

تەواوە یان کردارێکی یاریدەدەرە ؟ ئەگەر تەواوە چۆن یاریدەدەرە و ئەگەر یاریدەدەرە چۆن تەواوە ؟ ئەگەر تەواوە و بووە بە یاریدەدەر چ تایبەتێتی‌یێك گۆڕیوێتی ؟ ئایا لەو گۆڕانەیدا پێویست دەکا فۆرمی بگۆڕێت و واتای نوێ پەیدا بکات ؟

بابڕوانینە ئەو چەند ڕستەیە :

١-دەمەو نیوەڕۆ بوو بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە ...

هاوین لە شەقڵاوە بووم .

ئەو کچە هەر بۆ خۆت دەبێ .

... (٢٥٩)

٢-ئازاد بوو بە مامۆستا .

ئازاد دەبێ بە مامۆستا .

ئازاد ببە بە مامۆستا .

... (٢٦٠)

---

(٢٥٩) سەیرێ بوو ، لە خەو هەستام کە ڕوانیم بەفرە باریوە

سلێمانی ئەڵێی بەلقیسە ، ئارای زیوی پۆشیوە

(پیرەمێرد ، ل١٢٥) .

ملێ ، گوڵزاری دڵداری و بەهەشتی خۆشەویستی بوو

وەکو بتخانە مەیدانی جێی جوانی پەرستی بوو

(هەردی ، ل٥٩)

(٢٦٠) دنیا لە پاش نیوەڕۆوە بوو بە هەور و هەڵڵا ...

(لە خەوما ، ل٢١)

بووە بە کیسکەکەی هەباسی خاس

(پەندی پێشینان ، ل ٩٧)

٣-گۆزەکە پڕبوو .

گۆزەکە پڕدەبێ .

...[٣٦١]

٤-کە من چووم ، میوانەکە هاتبوو .

ئازاد زمانی بستێ دەرکێشابوو

...[٣٦٢]

٥-دەبوو زوو بڕۆیشتایە

دەبێ زوو بچی

■

لە سایەی چاوەکانی بوومە ڕەندی خەرابات

لەلای پیری مەیخانە خەرقەم لە گرۆی مەی ناوە

(وەفایی ، ل ١٥٢)

[٣٦١] گوڵە پڕبووە لە لەفسانەی دڵداری ،

بە لەحەمەت بێ زوخرەی جوانی و مەیاری !

(گۆران ، ل٣٧)

بەحەشت کە پڕبێ لە وشکە سۆفی

ئاوالە خوازم کە لە سەقەر بم

(بێکەس ، ل١٢٨)

[٣٦٢] دەستیان گرتبوو پرجۆش و خرۆش

گۆرانی بێژیان بلبلی دەنگ خۆش

(پیرەمێرد ، ل١٤٢)

... هەناسە برکێ پێ کەوتبوو ، زمانی بستێ دەرکێشابوو ...

(لە خەرما ، ل٣٠)

... [٢٦٣]

٦–ئازاد لە کوێیە ؟

دەبێ چووبێ بۆ سەیران

... [٢٦٤]

(بوو) لە ڕستەی یەکەمدا ، کە بوونی (نیوەرۆ) ڕادەگەیەنێ ، بە ڕوونی کاتی ڕووداوەکە نیشان دەدا و دەچەسپێنێ . کردارێکی تەواوە و بە تەنیا و بێ یاریدە ئەرکی گوزارە دەبینێ ... بەڵام لە ڕستەی دووەمدا ئەگەرچی دیسان بە ئاشکرا کاتی تێدا دیاری کراوە ، بەڵام کردارێکی ناتەواوە ، چونکە ئەرکە بنەڕەتییەکەی گۆڕاوە بە گۆڕانکاری لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی و لە چەمکی (بوون)ی ڕووت لایداوە [٢٦٥]. لە ڕستەی سێیەمدا (پڕبوون)ی (گۆزە) دەردەخا ، کە بە دەمی ڕابوردووەوە بەندە . لێرەشدا هەر یاریدەدەرە ، چونکە وەك ڕستەی دووەم مەبەست تەنیا (بوون)ە ڕووتەکە نییە و نە ئاوەڵناوەکە (پڕ)و نەکردارەکە – (بوون) ، بەتەنیا ئەنجام نادەن . (بوون) لەم ڕستەیەدا بە یاریدەی ئاوەڵناوی (پڕ)ەوە توانیویەتی ببێتە گوزارەی نیهادەکەی ، کە (گۆزە)یە ... (بوو) لە ڕستەی چوارەمدا بووە بە پاشکۆی کرداری (هات)و تەنیا واتای "ماوە

---

[٢٦٣] ئەو جوانییە ئەڕوات و لە چاو گوم ئەبێ وەك ئاو

ئەو ڕۆژە ئەبێ دائیمە هەر وێنە بەرچاو ...

(هەردی ، ل٥٢)

... ولیان ، ئێمە هەرچییەکمان کردووە ئەبێ لەمشەو خۆمان بگەیەنینە ناو شار .

(لە خەوما ، ل ٣٠ – ٣١)

[٢٦٤] وێ بووە لەو ڕۆژەوە لێوی حەیات ئەفزاتی دێ

وا دەبێ شەرم و حەیا ، ئەی ئاگرین ، ئاوی حەیات

(مەحوی ، ل٥٦)

[٢٦٥] ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، کاری هەبوون ، گۆڤاری "کاروان" ، ل ٣٩ ، شوباتی ١٩٨٥ ، ل١٥ .

دووری نیشان دەدا و چەسپاندنی وجود لە ئارادا نییە"[٣٦٦] . لە ڕستەی پێنجەم و شەشەمدا بە تەواوی لە واتا بنەڕەتییەکەی دوور کەوتوونەتەوە . لە ڕستەی پێنجەمدا مانای (پێویستە) – (کان یجب ، ینبغی ، یجب ان ، من الضروری ، لازم) دەگەیەنێ و لە ڕستەی شەشەمیشدا مانای (یجوز ، جائز ، ممکن) دەدات .

ئەگەر ئەو ڕایە وەربگیرێ ، کە وشەی یاریدەدەر هەمیشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ بێ ، ئەوسا دەبێ دان بەوەدا بنرێ ، کە ئەو وشەیەی دەوری یاریدەدەری دەبینێ ، پێوەندی بە ئەسڵەکەیەوە نەبێ (واتە ، ئەو وشە یاریدەدەرە لە ئەسڵدا کردار نەبێ)و ئەو دەمە دەبێ کردارێکی تەواو و وشەیێکی یاریدەدەر جیابکرێنەوە . بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ، کە لە بەراوردکردنی (بوون) وەک وشەی یاریدەدەر و (بوون) وەک وشەیێکی تەواو ، دەردەکەوێ ، کە هەردووکیان یەک وشەن و لە دۆخی جیاوازی بەکارهێناندان .

بەر لە هەر شت لە ڕووی واتاوە (بوون) چ وەک وشەی یاریدەدەر و چ وەک وشەی تەواو بەکاربهێنرێ ، بەو ڕادەیە لەیەک جیانابنەوە ، کە لە خاسیەتی وشەی هاوبێژدا هەیە .

پێویستە ئەوەش لەبیرنەکەین ، کە لە زمانی کوردیدا دەشێ ژمارەیێکی هەمەجۆری کردار ، وەک کرداری یاریدەدەر بەکاربهێنرێن .

ئەو کردارە هەمەچەشنانەی ئەرکی کرداری یاریدەدەر دەبینن ، وەک یەک نین و ئەمەش هۆی تایبەتیتی واتایانە . بەڵام هەندێ کردار بە زۆری وەک یاریدەدەر بەکاردێنرێن و ئەویش بەتایبەتی (بوون) . هەرچی ئەوانی دییە بەدەگمەن ئەم ئەرکە دەبینن ، وەک : (هاتن ، هێنان / هانین ، خستن ، دان / دایین ، کردن / کرن ...) .

---

[٣٦٦] هەمان سەرچاوە ، ل١٩ .

دەتوانرێ نموونە بۆ ئەوە بهێنرێتەوە ، کە کرداری خاوەن واتای جیاواز زۆرە ، کە ئەو ئەرکە ببینێ .

لە هەمان کاتدا لە حاڵەتی بەکارهێنانی وشەدا لە دەوری یاریدەدەریدا ، واتای یاریدەدەری لەگەڵ ئەو حاڵەتانەدا ، کە کردارەکە بە واتای تەواو و سەربەخۆ بەکاردێ ، دەپارێزرێ . هەموو ئەمە ، ئەوە ئیسپات دەکا ، کە حاڵەتی یاریدەدەری نابێ بە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ ، یان کردنی دوو بەشە ئاخاوتن بە یەکێك . لە ڕاستیدا واتای یاریدەدەری بریتی‌یە لە ئەرکێکی ڕستەسازیی دیاریکراو ، کە وا خاسیەتی کردارە بە گشتی .

کرداری (بوون) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە هەمان فۆرم و هەمان ناوەرۆکی دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەردەکەوێ - واتە لە دیالێکتی ژووروودا (بوون) وەك کرداری تەواویش و یاریدەدەریش خۆی دەنوێنێ و لە ڕووی کات و ڕێژە و ئەرێتی‌یەوە هیچ جیاوازیێکی ئەوتۆی لەگەڵ دیالێکتی خوارووا نی‌یە[٣٦٧]. ئەو جیاوازییە کەمەش ، کە لە هەندێ بەشە دیالێکتدا لە

---

(٣٦٧) چەند نموونەیەك

ڕانەبوردووی ئیخباری :

کی‌ێت بن غەم ژ دل غافل و فەرزانە خلاس

کی دبت شوری جەنون کافر و دێوانە خلاس

(پەرتووکین هەکاری ، ل ١٣٧)

ڕانەبوردووی ئینشائی :

گەر کونجێ وەحدەتێ ڕوێ دەمەك شەیدات بم

وەك ت هەڵ خەلقێ دکم سەیرا عەجەب ڕسوات بم

(پەرتووکین هەکاری ، ل ١٣٧)

-

رابوردووی ئیخباری :

یارێ پور خوشنك ل بال بوو

ملیعرەك غایەت جەمال بوو

(جزیری ، ل ٣٥٦)

... چی ل هۆزا وی دبوو و دهۆزێن گشك فەهم دكر .

(کوردنز ، ل٤٢)

ماقبەت بوویە شەهیدێ سەرێ نوكێ موژگان

ژ جەفا غەمزەێ نەرگسێ مەستانە خلاس

(پەرتووین هەکاری ، ل ١٣٧)

... ئەو ژ مالێ هنباین حەو بوویوو ، بوویوو گورا هار .

(کوردنز ، ل ٣٣)

رابوردووی ئینشائی :

عەلی نكاربوو ژ وی خلاس ببوویا .

(کوردنز ، ل١٢)

... نكاربوو ژ ناڤ دەست و پێند وی مەرگەتا خلاسی ببوویوویا .

(کوردنز ، ل ٣٥)

نەرێتی :

ڤە سالێ نابت ب مەرمان و متالان

ئ لێ کت پرتووی جەنتمت نەهێتن

(پەرتووین هەکاری ، ل١٧٨)

... ئەو گوتنە کار نەبوویە ...

(کوردنز ، ل ٣٨) .

.. و گەلێكی دی .

بوونی بزوێنی (وو)ی درێژ به (ی)[٢٦٨] یان به دیفتۆنگی (وی)دا دەبینرێ ، دیاردەیێکی فۆنەتیکی‌ی ئاسایی یاسایی‌یه .

لەو جۆرە دیاردە فۆنەتیکی‌یه له هەندێ بەشه دیالێکتی هەردوو دیالێکتی سەرەکیی زمانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ . بۆ نموونه له بەشه دیالێکتی کوردی گەرمیان و ئەردەڵان و تورکمەنستان...دا (ب)ی (بوو) دەبێ به (و—W) :

دەوم ، دەوی ... دەون

ووم ، ووی ... وون

...

نەوم ، نەوی ... نەوان[٢٦٩]

(وو)ی (بوون) له بەشه دیالێکتی لوڕی‌دا له شێوەی (ی)دا[٢٧٠] و له هەورامانیشدا (یێ)دایه[٢٧١]. وەك :

لوڕی :

بی[٢٧٢] – بوو

هەورامانی :

بێ – بوو

---

[٢٦٨] مێرگه‌کی کیجەك هەبی ، نالێ وێ فاقاقاك بی ...

(خالید حسەین ، ل ٢٣)

[٢٦٩] بڕوانه :

ا) وەلوولی لەحەمەد ئالانی ، گەردانی (بوون) ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ ٨٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل١٣ .

ب) ج. خ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٧٣ ، ل ١٩٤ – ١٩٥ .

[٢٧٠] حەمید ئێزەد پەناه ، فەرهەنگی لەك و لوڕ (ئێنوان و بەراوردکردنی ، مەحموود زامدار) ، بەغدا ١٩٧٨ ، ل ٢٢٦ .

[٢٧١] محەمەد لەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی له ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٩٨ .

[٢٧٢] له زمانی ئینگلیزیشدا هەر (be) یه .

کرداری (هاتن) ، کە کردارێکی تەواوە [٢٧٣] و تێنەپەڕە ، لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە زۆری وەك کرداری یاریدەدەر خۆی دەنوێنێ ، ئەویش بەتایبەتی لەو بارەدا ، کە دەبێتە کەرەستەی پێکهێنانی دۆخی کارا بزربی : (ئەز هاتم دیتنێ) . لەبەر ئەوەی (هاتن) لەم حاڵەتەدا ناتوانێ وەك کردارێکی سەربەخۆ ئەرکی خۆی ببینێ و ئەو گوزارەیەی کە مەبەستی ڕستەکەیە بە دەستەوە بدات ، دەبێتە کردارێکی یاریدەدەر .

بەدوا کرداری (هاتن)دا هەمیشە کردارێکی تێپەڕ دێت ، کە مانای سەرەکی هەڵدەگرێت . ئەو کردارە سەرەکی‌یە گەردان ناکرێ و لە شێوەی چاوگیدا دەمێنێتەوە (لە هەندێ بەشە دیالێکتیشدا نیشانەی "ێ" یان "ە"ی دۆخی تیان وەردەگرێ) [٢٧٤] . هەرچی کرداری یاریدەدەری (هاتن)ە ، هەردەم دەکەوێتە پێش کردارە سەرەکی‌یەکەوە و وەك گشت کردارێکی تێنەپەڕی دی گەردان دەکرێ . [٢٧٥]

قەدی ئەم کردارە ، وەك هەموو چاوگێکی کوردی بە لێکردنەوەی (ن)ی چاوگ سازدەبێ :

هاتن - ن - هات

---

[٢٧٣] ... تێوارە هاتم مەزت بکەمەوە ، میوانت هات .

(لە خەوما ، ل٤٢ – ٤٣)

ڕۆژەکی دەوریش بابا هات و گوتە کوڕێ پادشێ ...

(کوردێ ، ل٩٥).

[٢٧٤] دەربارەی ئەو دیاردەیە ، لە باسی جۆنێتی گۆڕینی کرداری کارا دیار بۆ کرداری کار بزردا دواوین (بڕوانە ، ل ٣٢٦-٣٤٦) .

[٢٧٥] بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو لە بارەی گەردانی کرداری تێنەپەڕەوە ، بڕوانە لاپەڕە (٤٣-٦٧)ی ئەم بەرهەمە .

بەڵام چۆنێتی وەرگرتنی ڕەگەکەی ، بەر ڕێگە بنەڕەتی‌یەکە ناکەوێ و بە لابردنی دوو دەنگی کۆتایی و کردنی (ا) بە (ێ) پەیدا دەبێ . وێڕای ئەوەش بەر یاسای کورت کردنەوە کەوتووە و لە (هێ)وە بووە بە (ێ) . لە کاتی ئێستاشدا (د)ی موزارەعەتی دەبێ بە (ت) :

هاتن - تن - ها

ها > هێ > ێ : دەهێم > دێم > تێم

ئەز تێم گرتن / گرتنێ

ئەزێ بێم گرتن / گرتنێ

ئەز هاتم گرتن / گرتنێ

ئەز دهاتم گرتن / گرتنێ

ئەز هاتمە گرتن / گرتنێ

ئەز هاتبووم گرتن / گرتنێ

... ئەز نزانم من هند دیت دەرگەهـ هاتە ڤەکرن .

(خالید حسەین ، ل٨٩)

دەستەکا کەمیکا هاتن دیتن کو نولک تژی ناڤ سفرێت واتە پرسیان کر کا ئەڤە کێ وەکری‌یە .

(خالید حسەین ، ل٦٠)

ئەڤ ب خوەسەر نەچوو ، چوینا وی ب دلخۆشییا مە هەر سییانە .

کو یرۆ ژ مەمێ ڕە گوتنەک خراب بێتە کرن ، ئە ب مرنا مە گیانە .

(مەمێ ئالان ، ل١١٦)

"ڕاستە ، کولەکا مە هنەکی شاشە ، لێ هەما تێرا ڕووناکایی ڕند و ڕاست تێ دیتنێ ... "

(کوردێز ، ل١٧٧)

رۆژ هاتیە شراقێ

لەو دمرێن ژ کوڤانان

(جزیری ، ل٥٧٦)

کرداری (هاتن) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووشدا جارجارە لە دەوری یاریدەدەریدا دەبینرێ ، بەڵام لەم دیالێکتەدا بە پێچەوانەی دیالێکتی ژووروو لە پێش کرداری تێپەڕەوە نایەت ، بەڵکو دەکەوێتە پێش تێنەپەڕەوە . وێڕای ئەوەش یاریدەی سازدانی دۆخی کارا بزری نادات :

... کە ئەوم دی هەموو لەشم هاتە لەرزین .

(لە خەوما ، ل١٠)

هەرچی کرداری (کەوتن)ە ، کە بە چەشنی (هاتن) تێنەپەڕە ، لە (هاتن) چالاکترە و دەشێ بە دوایدا کرداری تێنەپەڕیش و تێپەڕیش بێت :

لەشم کەوتە لە رزین      ئازاد کەوتە کوشتن

(هاتن) کردارێکی تێنەپەڕە و (هێنان / هانین)یش شێوەی تێپەڕێتی . وەك وتمان (هاتن) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە زۆری دەبێتە کەرەستەی پێکهێنانی حاڵەتی کارا بزریی کردار و لەم بارەدا وەك کردارێکی یاریدەدەر خۆی دەنوێنێ . جا سەرنج راکێش ئەوەیە لە دیالێکتی خوارووا (هاتن) دەگمەن دەبێتە کرداری یاریدەدەر ، کەچی (هێنان / هانین) دەتوانێ چالاکانە دەوری یاریدەدەری ببینێ ، بەڵام وەك (هاتن) نابێتە هۆی دروست کردنی دۆخی کارا بزری ، بەڵکو دەبێتە یاریدەدەریی کردنی هەندێ کرداری تێنەپەڕ بە تێپەڕ ؛ بە وێنە (پێکەنین) ، (گریان) ... کە تێنەپەڕن ، ئەگەر لە پێشیانەوە (هێنان / هانین) بەکاربهێنرێ ، دەبنە تێپەڕ :

هێنانە پێکەنین

هێنانە گریان

...

لەم دیالێکتەشدا ، کاتێ (هێنان / هانین) وەك کرداری یاریدەدەر خۆی دەنوێنن ، هەمیشە دەکەوێتە پێش کرداره سەرەکی‌یەکەوە و وەك گشت کردارێکی تێپەڕ گەردان دەکرێ . بەلام کرداره سەرەکی‌یەکە گەردان ناکرێ و لە شێوەی چاوگیدا دەمێنێتەوە و هەردەم بە دوا کرداره یاریدەدەرەکەدا دێت :

ئازاد دەهێنمە پێکەنین

ئازادم هێنایە پێکەنین

ئازادم دەهێنایە پێکەنین

ئازادم هێناوەتە پێکەنین

ئازادم هێنابووە پێکەنین

ئازادم بهێنایەتە پێکەنین

...

پێویستە ئەوەش یادداشت بکەین ، کە کرداری (خستن) دەتوانێ هەمان دەوری (هێنان / هانین) ببینێ :

| | |
|---|---|
| ئازاد دەهێنمە پێکەنین | ئازاد دەخەمە پێکەنین |
| ئازادم هێنایە پێکەنین | ئازادم خستە پێکەنین |
| ئازادم دەهێنایە پێکەنین | ئازادم دەخستە پێکەنین |
| ئازادم هێناوەتە پێکەنین | ئازادم خستووەتە پێکەنین |
| ئازادم هێنابووە پێکەنین | ئازادم خستبووە پێکەنین |
| ئازادم بهێنایەتە پێکەنین | ئازادم بخستایەتە پێکەنین |

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا کرداری (دان / دایین) ئەگەرچی وەك (هاتن) چالاك نی‌یە ، بەلام تا ڕادەیێك لەسەر هەمان شێواز دەتوانێ دەوری یاریدەدەری ببینێ :

ئەو وی دەدا گرتنێ

ئەو ئەو دا گرتنێ

ئەم چەشنە بەکارهێنانەی کرداری (دان) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووشدا دەبینرێ :

ئەو منی دا بە گرتن

ئەوان ئێمەیان دا بە گرتن

لەو ڕستانەدا (دان) ، کە وەك کرداری سەبەخۆ ئەرکی نەبینیوە و بووەتە هۆی پێکهێنانی دۆخێکی تایبەتی ، دەشێ بە کرداری یاریدەدەر دابنرێ .

(دان) ، کە کردارێکی تێپەڕە ، بە دواشیدا هەر کرداری تێپەڕ دێت .

کرداری (کردن / کرن)یش لە هەندێ باردا ، بەتایبەتی کە دەوترێ (من ئازادم کرد بە مامۆستا ؛ گەرما بەفر دەکا بە ئاو ...) ... (کەفر کرن خیزە ؛ سۆر کرن سپی ...) بە چەشنی (بوون) وەك کرداری یاریدەدەر خۆی دەنوێنێ .

وێڕای (بوون) ، کە مەودای گۆڕانکاری لە باری بنەڕەتییەوە بۆ باری دی زۆر بەربڵاوە و کرداری (کردن)یش ، کە لە هەندێ حاڵەتی کەمدا لە چەمکی (کردن)ە ڕووتەکە لادەدات ، ڕواڵەتیان بە شێوەی هەمەچەشن دەبینرێ ... هەرچی سەرجەمی ئەو کردارانەی دی (هاتن ، هێنان / هانین ، خستن ، کەوتن ، دان ، کردن)یە ، تەنیا لە دۆخێکدا دەبنە یاریدەدەر ، کە چاوگ بە دوایاندا بێت . لەو حاڵەتانەدا مەبەست تەنیا نە بە چاوگە ڕووتەکە ڕادەگەیەنرێ و نە بە کردارە یاریدەدەرەکە ، بەڵکو بە هاریکاری هەردووکیان ئەنجام دەدرێ .

کەواتە هەموو ڕواڵەتێکی بەیەکەوە هاتنی کردارێك لەگەڵ کردارێکی دی ناکرێ تێیدا کردارەکەی پێشەوەی بە یاریدەدەر دابنرێ . بەوێنە لە ڕستەکانی (دەمویست سەرتانلێبدەم ؛ توانیم بڕۆم ؛ پاڵکەوتم بنووم ...)دا (دەمویست ، توانیم ، پاڵکەوتم...) یاریدەدەر نین ، چونکە نە واتای لێکسیکی و نە دۆخی ڕێزمانیی ئەوان و نە ئەمان (سەرتانلێبدەم ، بڕۆم ، بنووم ...) لە ڕووی ئاشکرایی و نائاشکرایی ؛ بەهێزی و بێهێزییەوە گۆڕانکارییان بەسەردا نەهاتووە .

# ئەو کردارانەی لە دەستوو لادەدەن

لە زمانی کوردیدا کرداری (هەبوون ، ویستن ، چوون ، هاتن ، زانین ، کارن ... ) لە هەندێ ڕووی وشەسازی‌یەوە لە دەستووری گشتی لادەدەن .

(هەبوون) :

(هەبوون) چاوگێکی لێکدراوە و لە دوو مۆرفیمی ڕیشەیی (Root morpheme)ی (هە)و (بوون) پێکهاتووە .

هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی (هە)یان بە پێشگر داناوە [٢٧٦].

لە ڕێی دوو بەڵگەی زانستی‌یەوە ، پێشگر نەبوونی (هە) ڕوون دەکەینەوە :

١-(هە) پێشگر نی‌یە ، چونکە لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا دەبینین ، بە تەنیا بەکاردەهێنرێ و جێناوی لکاوی دەخرێتە سەر و واتای تەواو دەگەیەنێ :

هەم ... هەیە ... هەین ... هەتە ... هەمانە ... هەیانە ...

ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن

هەم ناظیمی عوقوودن و هەم ناظیری نوموور

(نالی ، ل ١٨٤)

---

[٢٧٦] بڕوانە ، بڕوانە : نووری عەلی ئەمین ، چاوگی (بوون) و (هەبوون) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ ١٩ ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ٢٢٩ – ٢٥٦ .

چەند کەسانێ هەن لە گەنجی وەتەن
کە شەویان لێ هات هەر قومار ئەکەن

(بێکەس ، ل٩٢)

...

بەڵام ئەم تایبەتێتی‌یە لە کرۆکی پێشگردا نی‌یە و (ڕام ... ڕاین ... هەڵمان.. هەڵتان... ) نە بە تەنیا دەوترێن و نە واتا دەدەن...

٢-لە زمانە ئێرانی‌یە کۆن و نوێکان و گەلێ لە زمانە هیند و ئەورووپاییەکاندا ، بە هەمان شێوەی ئەمڕۆی کوردی ، یان بە شێوەیێکی یەکجار نێزیک لێوەی دەبینرێ :

ئەم کردارە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا خاوەنی ڕەگی (ه) بووە ، کە لە (ئەه)ی فارسیی کۆنەوە وەرگیراوە . کرداری یاریدەدەری خاوەن ڕەگی (ه) کردارێکی ناتەواو بوو و تەنیا فۆرمی کاتی ئێستای ڕێژەی ئیخباری و ڕێژەی ئینشائی هەبوو - بەوێنە کاتی ئێستای ڕێژەی ئیخباری بەم چەشنە بوو :

| | | تاک | کۆ |
|---|---|---|---|
| ١- | کەسی یەکەم | هەم | هێم |
| ٢- | کەسی دووەم | هێ (ه) | هێت |
| ٣- | کەسی سێیەم | هەست | هەند |

پاپەک ڕاپ پوس-ێ هەست (پاپەک کوڕی هەیە)

ئان ئەفزار کێ هەست ئوت بووت ئوت بێت (ئەو هێزە کە وا هەیە ، بووە و دەبێ)

فۆرمی کەسی سێیەمی تاکی حاڵەتی نەرێنیی ڕێژەی ئیخباری دەبێتە (نێست) :

کێ فتێرش ئێست (ئەوەی کە کۆتایی نییە)

(۲۷۷)...

لە زمانی بلووجیدا فۆرمی تەواوی ئەو کردارە (ئەست)ە و بەجیا بەکاردێ . بۆ نموونە :

- دست ک چن زەری و سۆزێ ئەست (بینیم لەوێ چەند زێڕ و پارە هەیە) .

ئەوەش نموونەی گەردان کردنی :

١-گەردانی فۆرمی تەواوی کاتی ئێستا

| تاک | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| دیالێکتی ڕۆژئاوا | دیالێکتی ڕۆژهەلات | دیالێکتی ڕۆژئاوا | دیالێکتی ڕۆژهەلات |
| ١-ئەستان ، هەستان ، ئەستون | ئەستان | ئەستن ، هەستن ، ئەستەن | ئەستوون |
| ٢-ئەستێ ، هەستێ ، ئەستەی | ئەستێ | ئەستت ، ئەستێ ، هەستت ، هەستێ | ئەستێ ئەستێ |
| ٣-ئەست ، ئەستەت ، ئەستێ ، هەست ، هەستەت ، هەستێ | ئەستێن | هەستەنت ، هەستەن ، ئەستەن | ئەستانت ، ئەستان ، ئەستەن |

٢-گەردانی کاتی ڕابوردووی :

| تاک | کۆ |
|---|---|
| ١-ئەستەیەن | ئەستەیوون |
| ٢-ئەستەیێ | ئەستەیێ |
| ٣-ئەستەی ، ئەستە | ئەستەیەنت ، ئەستەیەن |

(۲۷۸)...

(۲۷۷) ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ئاوەڕاست ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٦ ، ل۱۰۳-۱۰٦ .

(۲۷۸) ف. ئا. فرۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۰ ، ل ٤۳ - ٤٤ .

لە زمانی فارسیی نوێدا (هست)ە و لە زمانی ڕووسیشدا (یەست)ە ... لە زمانی ئەڵمانیدا (haben)و لە ئیسپانیدا (haber)ە .[٢٧٩]

(هەبوون) لە زمانی کوردیدا بە دوو واتا دێت : یەک - (بوون - وجود) ؛ دوو - (خاوەنێتی - تملك) . لە باری یەکەمدا واتە کاتێ بە مانای وجود دێت تێنەپەڕە ، بەڵام کاتێ واتای خاوەنێتی دەگەیەنێ تێپەڕە . ئەم تێنەپەڕی و تێپەڕییەشی چ لە پیوەندییدا بە بەرکارەوە و چ لە وەرگرتنی جیاوی لکاودا دەردەکەوێ .

# -باری ئەرێتی-

## -١-

## ڕێژەی ئیخباری

| | (بوون – وجود) | | (خاوەنێتی – تملك) | |
|---|---|---|---|---|
| | ئێستا | ئایندە | ئێستا | ئایندە |
| کاتی ڕانەبوردوو | هە – م | | هەیە | دەبێ / دەبێت |
| | هە – ین | Ø | هەمانە | دەمانبێ / دەمانبێت |
| | ... [٢٨٠] | | | |

---

[٢٧٩] ئومەر عزمی ، بەراوردکردنێکی (ڕابوردووی تەواو)ی کوردی لەگەڵ (perfect)ی زمانە ئەورووپاییەکان ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ ٢٤ ، ئەیلوولی ١٩٨٤ ، ل ٥ .

[٢٨٠] ... زۆر ئەحواڵێکی خراپ و ناخۆشم هەیە .

(لە خەوما ، ل٢٩)

**٢- کاتی رابوردوو**

| رابوردووی نزیک | رابوردووی نزیک |
|---|---|
| هەبووم | هەم بوو |
| هەبووین | هەمان بوو |
| ...(٢٨١) | |
| **ب- رابوردووی بەردەوام** | **رابوردووی بەردەوام** |
| Ø | هەم دەبوو |
| | هەمان دەبوو |
| ... | |
| **ج- رابوردووی تەواو** | **رابوردووی تەواو** |
| هەبووم hebûwin | هەم بووە hembûwe |
| هەبووین hebûwîn | هەمانبووە hemanbûwe |
| **د- رابوردووی دوور** | **رابوردووی دوور** |
| هەبووبووم | هەمبووبوو |
| هەبووبووین | هەمانبووبوو |
| ... | |

---

(٢٨١) بە باخچەی پاشادا ورە گەرام ، خوار و ژوور ،
زەرە هەبوو ، بۆم چنیت ! چنگ نەکەوت گوڵی سوور ،
(گۆران ، ل ١٧)

-٢-

## ڕێژەی ئینشائی

| | (بوون – وجود) | | (خاوەنیتی – تملك) | |
|---|---|---|---|---|
| [illegible] | هەیم | | هەمبێ | |
| | هەبین | | هەمانبێ | |
| | ...(٢٨٢) | | | |
| [illegible] | هەبوویام | | هەمبوویایە | هەمبولیە |
| | هەبوویاین | | هەمانبوویایە یاخود | هەمانبوایە |
| | ... | | | |
| [illegible] | Ø | | هەم نەبووبایە | هەم نەبولیە |
| | | | هەمان نەبوویایە یاخود | هەمان نەبولیە |
| | | | ... | |
| [illegible] | هەبوویامایە | هەبوومایە | هەم بوویایە | هەم بولیە |
| | هەبوویاینایە یاخود | هەبووینایە | هەمان بوویایە یاخود | هەمان بولیە |
| | ... | | | |
| [illegible] | هەبووبوویامایە یاخود | هەبووبوومایە | هەم بووبوویایە یاخود | هەم بووبوولیە |
| | هەبووبوویاینایە | هەبووبووینایە | هەمان بووبوویایە | هەمانبووبوولیە |

-٣-

## ڕێژەی داخوازی

| (بوون – وجود) | (خاوەنیتی – تملك) |
|---|---|
| هەبە | هەتبێ |
| هەبن | هەتانبێ |
| ... | |

(٢٨٢) هارەق و پارە لە هەردوو گەر سەرو ڕوحم هەبێ

چیمە ئیتر من بەسەر ئەڵمان و ڕووس و چیکەوە

(بێکەس ، ل١٣٧)

## باری نەرێتی

-١-

### ڕێژەی ئیخباری

| | | (بوون – وجود) | (خاوەنێتی – تملك) |
|---|---|---|---|
| ١-کاتی ڕانەبوردوو | | نیم | نیمە |
| | | نین | نیمانە |
| | | ...[283] | |
| ٢-کاتی ڕابوردوو | أ-نزیك | نەبووم | نەم بوو |
| | | نەبووین | نەمان بوو |
| | | ...[284] | |
| | ب-بەردەوام | نەدەبووم | نەم دەبوو |
| | | نەدەبووین | نەمان دەبوو |
| | | ... | |
| | ج-تەواو | نەبوومە | نەم بووە |
| | | نەبووینە | نەمان بووە |
| | | ...[285] | |
| | د-دوور | نەبووبووم | نەم بووبوو |
| | | نەبووبووین | نەمان بووبوو |
| | | ... | |

(٢٨٣) لە تەنیایی شەوی ژینا ، ئەتێم هەنگاوی گوڵڕانە
نی‌یە دەستێ ، دەرمبێنێ لە ناو ئەم گێژە وێرانە

(هەردی ، ل٧٩)

(٢٨٤) ڕۆژ نەبوو چاوم بە دیدار
شاد نەبێ ، نەسرەوێ ئازار

(گۆران ، ل٢١)

(٢٨٥) لە مشت و پەنجە ! وەکو مشتی شانە ڕەق کە دەڵێی
لە شانیدا نەبووە دەست و بڕدی گۆشت و گێر

(نالی ، ل ٢١١)

-٢-

## ڕێژەی ئینشانی

| | | (بوون – وجود) | (خاوەنێتی – تملك) | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١-كاتی ڕانەبوردوو | | نەبم | نەمبێ | | |
| | | نەبین | نەمانبێ | | |
| | | ...(٢٨٦) | | | |
| ٢-كاتی ڕابوردوو | أ-نزیك | نەبوریام | نەم بووبایە | | نەم بوایە |
| | | نەبوربایین | نەمان بووبایە | یاخود | نەمان بوایە |
| | | ... | | | |
| | ب-بەردەوام | Ø | نەم دەبووبایە | | نەم دەبوایە |
| | | | نەمان دەبووبایە | یاخود | نەمان دەبولیە |
| | | | ... | | |
| | ج-تەواو | نەبووبامایە | نەم بووبایە | | نەم بوایە |
| | | نەبووبایناپە | نەمان بووبایە | یاخود | نەمان بولیە |
| | | ... | | | |
| | د-دوور | نەبووبووماپە | نەم بووبووبایە | | نەم بووبولیە |
| | | نەبووبووبنایە | نەمان بووبووبایە | یاخود | نەمان بووبولیە |
| | | ... | | | |

-٣-

## ڕێژەی داخوازی

| (بوون – وجود) | (خاوەنێتی – تملك) |
|---|---|
| مەبە | نەتبێ |
| مەبن | نەتانبێ |

(٢٨٦) یاخوا کافریش نەبێ بە جەستەم
وێڵ و سەرگەردان بێلێن و خەستەم
(بێکەس، ل ٧٨)

تێبینی :

أ-(هەبوون) لە باری ئەرێنتی‌دا :

١-لە کاتی ئێستا و ئایندەی (بوون - وجود)و ئێستای (خاوەنێتی - تملك)ی ڕێژەی ئیخبارێدا نیشانەی (دە) وەرناگرێت و دەردەکەوێت : (هەم ... هەین) ؛ (هەمە ... هەمانە) و ئاوتریێ (دەهەم ... دەهەین) ؛ (دەهەمە ... دەهەمانە) ، بەلآم لەکاتی ئایندەی خاوەنێتی‌دا (دە) بەکاردێ و ئەویش بە تێ‌چوونی (هە) : (دەمبێ / دەمبێت ... دەمانبێ / دەمانبێت)

هەردوو ڕانەبوردووی ڕێژەی ئینشائیی وجود و خاوەنێتی نیشانەی (ب)ی ئینشائی‌یان لەگەڵدا ئاوتریێ و دەوترێ : (هەبم ... هەبین) ؛ (هەمبێ ... هەمانبێ) .

ڕێژەی داخوازیی (وجود)یش و (تملك)یشی (هەبوون) نیشانەی (ب)ی داخوازی‌یان لەگەڵ ناوتریێ و دەوترێ : (هەبە ... هەبن) ؛ هەتبێ ... هەتبێ .

٢-لە ڕانەبوردووی (ئێستا و ئایندە)ی ڕێژەی ئیخباریی حاڵەتی وجودیش و خاوەنێتی‌یشدا هیچ ئەسەرێکی مۆرفیمی دووەمی وشەکە نامێنێ ، واتە (ب)ی ڕەگی (بوون) ، کە دەبوو لە پێکهاتنەکەدا بەشداربێ ، نی‌یە .

٣-یاسای گشتیی وەرگرتنی جێناوی کەسیی لکاو بۆ کاتی ڕانەبوردووی تێنەپەڕیش و تێپەڕیش ، ڕێژەی ئیخباریش و ڕێژەی ئینشائیش ، هەر جۆری بێ هێزە - واتە دەستەی (م ، ی ، ، ، ین ، ن ، ن )ە ... ئەگەرچی (هەبوون)ی وجود بەپێی یاسا جێناوی لکاوی جۆری بێ‌هێزی دەچێتە سەر ، کەچی (هەبوون)ی خاوەنێتی جێناوی لکاوی جۆری بەهێز وەردەگرێ - واتە دەستەی (م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان)ی پێوە دەلکێ . ڕێژەی داخوازیی (هەبوون)ی خاوەنێتی بە هەمان چەشن لە جیاتی ئەوەی دەستەی بێ‌هێزی جێناوی کەسیی لکاو وەربگرێ ، دەستەی بەهێزی دەچێتە سەر .

٤-بەپێی دەستوور دەبوو کاتی ڕانەبوردووی (هەبوون)ی (وجود)یش و خاوەنێتی‌یش بەم چەشنە بێ :

| ڕێژەی ئیخباری | ڕێژەی ئینشائی | ڕێژەی داخوازی |
|---|---|---|
| هەدەبم | هەببم | هەببە |
| هەدەبین | هەببین | هەببن |
| ... | | |

٥-جاوگی (هەبوون)ی ڕێژەی ئیخباریش و ئینشائیش ، کە بە واتای وجود دێت ، کاتی ڕابوردووی بەردەوامی لێ پەیدانابێ .

ب-(هەبوون) لە باری نەرێنی دا :

١-لە گشت حاڵەتێکی نەرێنی‌ی (هەبوون)دا ، چ بە مانای وجود و چ بە واتای خاوەنێتی ؛ چ ڕێژەی ئیخباری و چ ئینشائی و چ داخوازی ؛ ڕانەبوردوو بێ یان ڕابوردوو .. (هە) تێ‌دەچێت .

٢-بەپێی یاسای گشتیی نەرێنیی زمانی کوردی ، نەرێنیی کردار ی (هەبوون) لە کاتی ڕانەبوردووی ڕێژەی ئیخباریدا ، دەبوو لە هەردوو حاڵەتی وجودیش و خاوەنێتی‌یشدا : (هەنابم ... هەنابین) بێت ، کەچی هەردوو مۆرفێمی (هە)و (بوون) تێ‌چوون و (ا)ی (نا)ش بووە بە (ی)و دەوترێ (نیم ... نین) ؛ (نیمە ... نیمانە) .

٣-لە کاتی ڕانەبوردووی ڕێژەی ئینشائی‌دا لە هەردوو باری وجود و خاوەنێتی‌دا تەنیا (هە) تێ‌دەچێ و (ب)ی ڕەگی (بوون) بەشداری دەکا و (نە)ش وەك دەستووری گشتی خۆی دەنوێنێ و دەوترێ (نەبم ... نەبین) ؛ (نەمبێ ... نەمانبێ) .

٤-لە کاتی ڕابردووی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائی و ، ڕێژەی دا ...لزیشدا ، دەمێ (هەبوون) بە واتای خاوەنێتی دێت ، لە بریتی ئەوەی بە ...ی یاسا جێناوی کەسیی لکاوی دەستەی بێهێز وەربگرن ، کەچی جێناوی کەسیی لکاوی دەستەی بەهێزیان دەچێتەسەر .

٥-تاکە جیاوازیی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائیی کرداری (هەبوون) بە هەردوو باری وجود و خاوەنێتییەوە ، لەگەڵ یاسای گشتیی ئەرێتیی سەرجەمی جۆرە کردارێکی ڕابوردوودا تێچوونی (دە)یە .

٦-لە کاتی ڕانەبوردوو و هەر چوار جۆری ڕابوردووی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائیدا و هەروەها هەموو حاڵەتێکی ڕێژەی داخوازیدا ، دەمێ (هەبوون) مانای وجود دەگەیەنێ ، لە وەرگرتنی جێناوی لکاودا لە یاسا لانادەن - واتە لە سەرپاکی ئەو دۆخانەدا جێناوی کەسیی لکاوی بێهێزیان دەچێتە سەر .

٧-لە ڕێژەی داخوازیدا ئامرازی (مە) و (نە) لە یاسا دەرنەچوون .

*　　　　*

*

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا (هەیین) و (هەبوون) هەیە . مامۆستا قەناتی کوردۆ دەڵێ : فۆرمی (هەیین) دێرینترە و لە ڕووی ڕەگەزەوە پێوەندی بە کرداری یاریدەدەری هەست (من)ی زمانانی ئێرانیی دێرینەوە هەیە .[٢٨٧]

کرداری (هەیین) تەنیا فۆرمی کاتی ئێستای هەیە و بۆ پەیدابوونی کاتی ڕابوردوو (هە)ی بنەمای لەگەڵ کرداری (بوون) - (لە "بووین"ەوە) یەک دەگرن و

(٢٨٧) ق. کوردۆییڤ ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢١٠ .

فۆرمی (هەبوون) پێیە دێلن .[288] (هەبوون) لە ڕووی کاتەوە فۆرمی ڕانەبوردوو و ڕابوردووی هەیە ؛ لە ڕووی ڕێژەوە خاوەنی فۆرمی ئیخباری و ئینشائی و داخوازییە ... هەرچی (هەبین)ە لەگەڵ ئەوەدا ، کە تەنیا فۆرمی کاتی ئێستای هەیە ، بەبێ نیشانەی (د / دە)ی موزارەعەتیش گەردان دەکرێ .[289]

هەردوو کرداری (هەبین) و (هەبوون) بە دوو جۆر بەکاردێنرێن : ١–وەك کردارێکی تەواو ؛ ٢–وەك کرداری یاریدەدەر . لە حاڵەتی یەکەمدا لەگەڵ (هە)ی بنەمایاندا گەردان دەکرێن ، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا بەبێ (هە) .[290]

وەك وتمان کرداری (هەبین) تەنیا فۆرمی کاتی ئێستای هەیە و ئەم فۆرمەش لە بنەمای (هە)ی جێناوی کەسیی لکاو پێك دێ :

ئەز هەمە

تو هەیی

ئەو هەیە[291]

ئەم
هوون — هەن[292]
ئەوان

---

[288] ق. کوردۆیێک ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٩٨ .

[289] سەرچاوەی ئاوبراو ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی ... ) ، ل ٣٤٠ .

[290] سەرچاوەی ئاوبراو دەستووری ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٩٩ .

[291] کاڤ کالان ژ مەرە دگوتن ئە بەحرێدە جەنەوەرەك هەیە ، مینا هەسپانە . مە گوت : "دەرەوە !"مە باوەر نەدکر گوتنا وان کالانە !

(مەمێ ئالان ، ل ٤٢)

[292] هەرچوو ماهر ... کو ئزان بوون کەفر ، کزجەك ل سەر ریا وان هەنە ، یان ئە ...

(گورێز ، ل ٣٦)

له دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا هەموو فۆرمەکانی کرداری (هەبوون) بە تەواوی وەك کرمانجیی خوارووە .

چەند نموونەیێك :

*کاتی ڕابوردووی نزیکی ڕێژەی ئیخباری

ئەز هەبووم

تو هەبووی

ئەو هەبوو (٣٩٣)

ئەم
هوون
ئەوان
→ هەن (٣٩٤)

*کاتی ڕابوردووی ڕێژەی ئینشائی

ئەز هەبووما

تو هەبوویای

ئەو هەبوویا

ئەم
هوون
ئەوان
→ هەبونا

(٣٩٣) مەتاف ولێن خۆزگان دە یەکی من هەبوو ...

(مەمێ ئالان ، ل ٤٢)

مێرەك هەبوو ، ناڤێ عەلی مەمەد بوو .

(گوربەلۆ ، ل ٣٦)

(٣٩٤) ... مارێت کەشتار هند لوا کەلیا هەبوون ...

(خالید حسەین ، ل٩٦)

*ڕێژەی داخوازی

هەبە

هەبن

لە فۆرمی نەرێنتی‌یشدا ، ئەگەرچی کەمێ جیاوازی لە نێوان دوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی کوردیدا دەبینرێ ، بەڵام ئەو جیاوازییە ، نەبووەتە هۆی لەیەك پچڕانی ئەو دۆخەی زمانی کوردی .

وەك وتمان (هەبێن) تەنیا فۆرمی کاتی ئێستای هەیە و ئەمەش شێوەی نەرێنتی‌یەتی :

نەرێنتیی ئەم حاڵەتە ئامرازی (نی)و (تونە) دەری دەبڕن ، کە شوێنی (هە) دەگرنەوە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەز | نینم | ئەز | تونەمە |
| تو | نینی | تو | تونەیی |
| ئەو | نینە [295] | ئەو | تونەیە |




(295) ژنکێ گوتێ : زەحمەت نینە ، هەرە جلکا ژ ناڤ بوخچکێ بینە دەر .

(خالید حسەین ، ل ٢٣)

(296) دائما دلێ من دەوا جو نینن

ژ وەجهێ کرەمێ تو هەر دەوا باش

(بەرنویێ هەکاری ، ل ١٣٥)

(297) .. چما بێ مینا لە فەت ئیدا تونەنە ...

(گەرێلا ، ل ٤٤)

لەم بارەدا هەندێ جار ئامرازی (نە)ش بەکاردێنرێ [٢٩٨]، بەلآم وەك (نـی) و (تونە) شوێنی (هە) ناگرنەوە :

| | |
|---|---|
| ئەز | نە هەمە |
| تو | نە هەیی |
| ئەو | نە هەیە |

ئەم
هوون ← نە هەن
ئەوان

ئەرێنیی کاتی ڕابوردووی ڕێژەی ئیخباری و ڕێژەی ئینشائی و هەروەها ڕێژەی داخوازی بە یاریدەی (تونە ، نی ، نە) سازدەبێ :

| ڕێژەی ئیخباری | ڕێژەی ئینشائی | ڕێژەی داخوازی |
|---|---|---|
| تونەبووم [٢٩٩] | تونەبووما | تونەبە ، تونەبن |
| نیبووم [٣٠٠] | نیبووما | |
| نەهەبووم | نەهەبووما | نەهەبە ، نەهەبن |

---

[٢٩٨] ق. کوردۆیێڤ ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢١٠ .

[٢٩٩] وەختەکی هەبوو تونەبوو ، تێچیرڤانەك هەبوو . ئاڤێ وی تێچیرڤانی میرزە مەموود بـوو . کەسەکی وی تونەبوو .

(کوردۆ ، ل ٨١)

ب خوەستنا خودێ زارۆێد وان تونەبوون .

(کوردۆ ، ل٣٢)

[٣٠٠] کەبڤا وی خوەش نیبوو ...

(کوردۆ ، ل٣٧)

کرداری (هەبوون) چۆن لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا دوو جۆر گەردان – واتە گەردانی تێنەپەڕ و گەردانی تێپەڕ-ی هەیە ، لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا بە هەمان چەشن لەتەك گەردانی تێنەپەڕدا ، گەردانی تێپەڕیشی هەیە . لە گەردانی تێنەپەڕدا وەك لێی دواین جیاوازییێکی ئەوتۆ لە نێوان ئەو دوو دیالێکتە سەرەکییەی کوردیدا نییە . هەرچی جیاوازیی گەردانی تێپەڕە ، ئەوەیە کە وەك هەموو کردارێکی دی تێپەڕ ، کاتی ڕابوردووی لە دیالێکتی خوارووودا بە یاریدەی جێناوە لکاوەکانی دەستەی یەکەم – واتە بەهێزەکان – دەردەبڕین ، بەڵام لە دیالێکتی ژوورووودا بە دوو ڕێگادا دەڕۆن : ١-ئەگەر لە ڕستەدا بەرکار هەبێ ، ئەو دەمە جێناوە لکاوەکانی دەستەی دووەم – واتە بێ هێزەکان – دێنە کۆتایی کردارەکە ؛ ٢-بێتو لە ڕستەدا بەرکار نەبێ ، ئەو دەمە جێناوی لکاو پەیدا نابێ و کردارەکە لە یەك فۆرمدا بۆ هەموو کەسەکانی ژمارەی تاك و کۆ دەبینرێ .

* *

(هەبوون)ی وجود لە بەشە دیالێکتی هەوراماندا لە شێوەی

"هەنا – هەم

هەنی[٣٠١] – هەیت

هەن[٣٠٢] ، هەنە – هەیە

[٣٠١] هەیرەز ماه و مەعلووم عامەن
ئاسمان هەنی فەضلی تۆ کامەن
(میرزا ئەلقادر ، ل١٦٤)

[٣٠٢] نە ئارامی هەن ، نەمۆ قەرارێ
جەی شار بەرمەشان ، هەرۆ هەزارێ
(صەیدی ، ل٢١٤)

هەنمێ - هەین

هەندێ - هەن

هەنێ - هەن"[٣٠٣] دا خۆی دەنوێنن و ، بە واتای خاوەنێتی‌یش قاڵبی :

"هەنمە - هەمە

هەنت - هەتە

هەنش - هەیەتی

هەنما - هەمانە

هەنتا - هەتانە

هەنشا - هەیانە"[٣٠٤] وەردەگرێ .

لە ناوچەی سنەو مەهاباد و کرماشان دەبینێ :

| وجود | خاوەنێتی |
|---|---|
| هەم | هەسم |
| هەیت | هەست |
| هەس | هەسی |
| هەین | هەسمان |
| هەن | هەستان |
| هەن | هەسیان[٣٠٥] |

---

خاسەر مەدینەی مونەوەرم هەن

من حوجرەی حەرەم پڕ گەوهەرم هەن

(میرزا ئەلقادر ، ل١٧٠)

[٣٠٣] محەممەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردەدا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل١٩٩ ؛ دکتر ابراهیم پور ، دستور زبان کردی ، تهران ؟ ، ل٤٣-٤٤ .

[٣٠٤] هەمان سەرچاوە ، زاری زمانی کوردی ... ل١٩٧ .

[٣٠٥] سەرچاوەی پێشوو ، دستور زبان کردی ، ل٣٨ - ٣٩ .

له شێوەی لوڕیدا :

| وجود | خاوەنێتی |
|---|---|
| هیسەم | |
| هیسی | |
| هێ | |
| هێسەم | |
| هێسید | |
| هێسەن [٣٠٦] | |

له زمانی فارسیی نوێشدا :

| وجود | خاوەنێتی |
|---|---|
| هستم | من دارم |
| هستی | تو داری |
| هست | او دارد |
| هستیم | ما داریم |
| هستید | شما دارید |
| هستند | انها دارند |

* *

[٣٠٦] حەمید ئیزەد پەناه ، فەرهەنگی لەك و لوڕ (لێدوان و بەراوردکردنی : مەحمود زامدار) ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٢٣٧ .

لە نێوان مۆرفێمی (هە)ی خاوەنێتی و جێناوی هەیی (هی)دا [٢٠٧]، لە ڕووی فۆرمیش و ناوەرۆکیشەوە وێکچوون و نێزیکی بەدی دەکرێ .

لەباری فۆرمەوە جیاوازییان تەنیا لە بزوێنی (ە)و (ی)دایە و لە زمانی کوردیشدا گۆڕینەوەی ئەو بزوێنانە بە یەکتر یاساییێکی باوە .

هەرچی مەسەلەی ناوەرۆکە ، ئەوەیە هەردووکیان واتای خاوەنێتی دەگەیەنن . بەوێنە :

| | |
|---|---|
| من ماڵم هەیە | ئەو ماڵە هی منە |
| م هەیە | هی منە |
| ئێمە ماڵمان هەبوو | ئەو ماڵە هی ئێمە بوو |
| مان هەبوو | هی ئێمە بوو |

ئەو ئەڵێ بەخوا نایدەم هیی منە

ئەم ئەڵێ ڕابورد ، دەستت بەم گوێنە

(بێکەس ، ل٩٢)

* * *

(ویستن) :

ئەم کردارەش وەك کرداری (هەبوون)ی خاوەنێتی ، کە لە گەردانی کاتی ڕانەبوردوودا جێناوی کەسیی لکاو وەردەگرێ ، لە سەرجەمی کردارەکانی دی زمانی کوردی جیادەبێتەوە - واتە لە بریتی ئەوەی جێناوی جۆری بێ‌هێز (م ،

[٢٠٧] بۆ باسی جێناوی هەیی (هی) ، بڕوانە ، ل ٢٧٨ – ٢٨٠ی بەشی دووەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە .

ی ، . ، ین ، ن ، ن)ی پێوە بلکێ ، کەچی جێناوی جۆری بەهێز (م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان)ی دەچێتە سەر .[٢٠٨]

| ڕابەبوردووی ئیخباری | ڕابەبوردووی ئینشائی |
|---|---|
| دەمەوی | بمەوی |
| دەمانەوی | بمانەوی |
| ... | |

بەپێی دەستوور دەبوو بوترێ

| | |
|---|---|
| دەوێنم | بوێنم |
| دەوێنین | بوێنین |
| ... | |

* *

(چوون) :

(چوون) کردارێکی تێنەپەڕە و لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا جگە لە ڕێژەی داخوازی ، کە دەبێتە (بچۆ) ، ئەمنا سەرجەمی کاتەکانی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائی بە تەواوی بەپێی دەستووری گشتی گەردان دەکرێن . بەڵام لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بۆ پێکهێنانی فۆرمی ئەرێنیی کاتی ئایندەی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائی و فۆرمی داخوازی (هەڕ) دەبێتە بنەما . هەرچی فۆرمی نەرێنیی ئەو حاڵەتانە و گشت کاتێکی ڕابوردوویەتی ، بەپێی دەستوور دەڕوا و لە (چوون)ەوە[٢٠٩] وەردەگیرێ :

[٢٠٨] لە زمانی کوردیدا تەنیا ئەو دوو کردارە – واتە (هەبوون)ی خاوەنێتی و (ویستن) لە گەردانی کاتی ڕابەبوردوویاندا بە شێوەیەکی بەرچاو جێناوی کەسیی لکاو وەردەگرن .

[٢٠٩] ... قەسابچی چوو مالا خوە ...

(کوردیلز ، ل١٦٦)

ئەو و قەسابچی بەر ب خەزنێ چوون .

(کوردیلز ، ل ١٦٨)

*کاتی ئایندەی ڕێژەی ئیخباری

| | |
|---|---|
| ئەزێ | هەرم |
| توێ | هەرِی |
| ئەوێ | هەرە |
| ئەمێ / هوونێ / ئەوانەیە | هەرِن [٣١٠] |

*کاتی ئایندەی ڕێژەی ئینشائی

| | | |
|---|---|---|
| ئەگەر | ئەز | هەرِم |
| ئەگەر | تو | هەرِی |
| ئەگەر | ئەو | هەرِە |
| ئەگەر | ئەم | هەرِن |
| ئەگەر | هوون | هەرِن |
| ئەگەر | ئەو (ان) | هەرِن |

*ڕێژەی داخوازی

هەرِە [٣١١]

هەرِن

[٣١٢] ...

---

[٣١٠] گاڤا خوەدێ کر و قەدەر ، ئەمێ هەرِن ، توێ بی بووك و ئەز زاڤانە .

(مەمێ ئالان ، ل ١١٢)

[٣١١] پاشێ تو هەرِە گازی قەساپچی بکە .

(کوردێل ، ل١٦٦)

[٣١٢] شایانی باسە ، مامۆستا قەناتی کـوردۆ پەنجەی بـۆ بەشـێکی زۆری ئـەو زاڵیاریـیانـە ڕاکێشـاوە (بڕوانە : ق. کوردۆیـێـف ، دەسـتووری زمـانی کـوردی "بـە کەرەسـتەی دیـالێکتی کرمـانجیی ژووروو و خوارووو" ، مۆسـکۆ ، ١٩٧٨ ، ل٣٢١ – ٣٢٢ .

(هاتن) :

کرداری (هاتن) ، کە ڕەگەکەی (هێ)یە و لە زۆربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا بەر یاسای کورت کردنەوە کەوتووە و بووە بە (ێ) ، لە دوو ڕووەوە لە دەستوور لادەدات :

١-بەتایبەتی لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، لە کاتی ڕانەبوردوودا (د)ی نیشانەی موزارەعەتی دەبێ بە (ت) :

ئەز — تێم
تو — تێی
ئەو — تێ
ئەم / هوون / ئەوان — تێن [٣١٣]

لە هەردوو دیالێکتە سەرەکییەکەی کوردیدا ڕێژەی داخوازی لە بنەمای (وەر)ەوە سازدەبێ :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|
| وەرە [٣١٤] | وەرە [٣١٥] |
| وەرن | وەرن |

(٣١٣) سەد نیلێ وە لێن ر دەمرن فەلەکی مە
پێ ناحەوێن قولزەم دەریایە ئەز
(جزیری ، ل٢١٧)

(٣١٤) جۆبارە ، لالەزارە ، وەرە سەر چەمە ، ولێ ،
ئاشووبە ئەم بەهارە ، بۆ سەیری چەم حەرام
(مەحوی ، ل٢١٢)

(٣١٥) پەرتو وەرە گوهدە لێ نصیحەت
(اما) ژ دل و جان ب (مقت)
(بەرشوی: هەکاری ، ل٣٧)

(زانین)و (کارن)[٣١٦] :

ئەم دوو کردارە تێپەڕە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە دوو ڕووەوە لە دەستووری گشتی لادەدەن :

١-فۆرمی ڕابوردووی تەواویان نییە :

ڕابوردووی نزیك - من زانی

ڕابوردووی بەردەوام - من دزانی

ڕابوردووی دوور - من زانیبوو

ڕابوردووی تەواو - Ø

٢-لە گشت کردارەکانی زمانی کوردیدا تەنیا ئەم دوو کردارە دەشێن حاڵەتی نەرێنییان بە یاریدەی (ن، - ni) پێك بهێنرێ :

ئەز نزانم

ئەز نکارم

... ئەز نزانم من هند دیت دەرکەهـ هاتە ڤەکرن

(خالید حسەین ، ل٨٩)

سەبری گۆت : "ئاپۆ ئەم نکارن ب وی چەمێرا دەرباز بن ..." .

(کوردۆ ، ل١٧٢)

---

[٣١٦] کارن = توانین

# نەرێتیی کردار

لەزمانی کوردیدا بۆ نەفی کردار سێ ئامرازی سەرەکی هەیە :

١-نا

٢-نە

٣-مە

ئامرازی (نا)

ئەم ئامرازە تەنیا لەگەڵ فۆرمی کرداری ڕانەبوردووی ڕێژەی ئیخبارییدا بەکاردێنرێ . کردارەکەش تێپەڕ بێ یان تێنەپەڕ ، سادە بێ یان ناسادە ، شوێنی (نا) هەر پێش ڕەگەکەیە . وەك :

تێنەپەڕ :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | : | دەکەوم | – | ناکەوم |
| | | دەبم | – | نابم |
| داڕێژراو | : | هەڵدەکەوم | – | هەڵناکەوم |
| | | دادەبم | – | دانابم |
| لێکدراو | : | سەردەکەوم | – | سەرناکەوم |
| | | ئازاددەبم | – | ئازادنابم |

تێپەڕ :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ساده | : | دەگرم | - | ناگرم |
| | | دەکەم | - | ناکەم |
| دارێژراو | : | دادەگرم | - | داناگرم |
| | | ڕادەکەم | - | ڕاناکەم |
| لێکدراو | : | ڕێگادەگرم | - | ڕێگاناگرم |
| | | بەخێودەکەم | - | بەخێوناکەم |

... [٢١٧]

تێبینی :

١-نیشانەی (دە / ئە)ی کاتی ڕانەبوردوو لە کرداری ئەرێنی‌دا لە کوێدا بێت ، لە حاڵەتی نەرێنی‌دا (نا) لە هەمان شوێنی ئەودا دادەنرێ . وەک :

تێنەپەڕ :




(٢١٧) دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە ، جەوابی نادەم
مەودەولێکە لە قەفەسدایە ، بەقابی نادەم

(نالی ، ل ٢٠٥)

وەک لەو گوڵەی ئەمڕا لەسەر نازداری ،
لێر نابێ لێی هەر چاوێ بۆی ئەنواڕێ !..

(گۆران ، ل١٧٤)

مژدەیان ئەدا پشیلە هاتبەد
ئەزمەر لە مێکە ناگات زاتیدە

(پیرەمێرد ، ل١٠٨)

٢-له کرداری ئاسادەدا بێگومان پارچەی یەکەم (پێشگر یان وشەی وا: دار) سەر بە ڕەگی کردار نی‌یە و (نا) هەمیشە دەکەوێتە پێش ڕەگەوە :

دا - نابم ، ڕا - ناکەم

سەر - ناکەوم ، بەخێو - ناکەم

٣-ئەگەر کردارەکە لە دۆخی کارا بزری‌دا بێ ، بە هەمان شێوەی کارا دیاری ، (نا) وەردەگرێ . وەك :

ناگرم - ناگیرێم

داناگرم - داناگیرێم

٤-لە دیالێکتی ژووروی زمانی کوردیدا ، (نا) بە هەمان شێوەی کرمانجیی خواروو خۆی دەنوێنێ - واتە تەنیا لەگەڵ فۆرمی کرداری ڕانەبوردووی ڕێژەی ئیخباریدا دێت :

دکەڤم - ناکەڤم

دنڤیسم - نانڤیسم

ئامرازی (نە)

کرداری ڕانەبوردووی ئینشائی و گشت جۆرێکی ڕابوردووی ئیخباری و ئینشائی و تەنانەت هەندێ حاڵەتی داخوازیش بە (نە) نەفی دەکرێن :

-١-

# ڕانەبوردووی ئینشائی

**تێنەپەڕ :**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | : | ببم | - | نەبم |
| | | بکەوم | - | نەکەوم |
| داڕێژراو | : | دابیم | - | دانەبم |
| | | دابکەوم | - | دانەکەوم |
| لێکدراو | : | ئازادبیم | - | ئازادنەبم |
| | | سەربکەوم | - | سەرنەکەوم |

**تێپەڕ :**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | : | بگرم | - | نەگرم |
| | | بکەم | - | نەکەم |
| داڕێژراو | : | داگرم | - | دانەگرم |
| | | ڕابگرم | - | ڕانەگرم |
| لێکدراو | : | ڕێگابگرم | - | ڕێگانەگرم |
| | | بەخێوبکەم | - | بەخێونەکەم |

... هتد [٣١٨]

---

(٣١٨) چاوی لە وەعدی کوشتنی من چاوی دزییەوە
خوێنکاری وا ، دەبێ لە قسەی خۆی نەکا نکووڵ

(مەحوی ، ل٢٠٦)

**تێبینی :**

١-نیشانەی (ب-bi-)ی ئینشائی لە کرداری ئەرێنتیدا لە کوێدا بێت ، لە حاڵەتی نەرێنتیدا (نە) لە هەمان شوێنی ئەو دادەنرێ .

تێبینی :










---

-

جوانترم نەدی وەك بووك وەستابێ ،
سەیرانگای چەمی واهێ ئاوا بێ !..

(گۆران ، ل١٧٧)

خاڵییە شوێنی نازك خەیاڵان
نەما گۆرانیی لەگریە و خاڵان

(پیرەمێرد ، ل٢٤٤)

تێپەڕ :










٢-(نە) هەمیشە دەکەوێتە پێش ڕەگی کردارەوە .

| | | |
|---|---|---|
| | | نەکەوم |
| دا | - | نەکەوم |
| سەر | - | نەکەوم |
| | | نەکەم |
| ڕا | - | نەکەم |
| بەخێو | - | نەکەم |

لە کرمانجیی ژووروودا (نە) لەگەڵ کرداری ڕانەبوردووی ئینشائیدا بە هەمان شێوەی دیالێکتی کرمانجیی خواروو خۆی دەنوێنێ :

| | | |
|---|---|---|
| بکەڵم | - | نەکەڵم |
| بنڵیسم | - | نەنڵیسم |

-٢-

# ڕابوردووی ئیخباری و ئینشائی

١-لە کرداری ڕابوردووی نزیک و تەواو و دووری سادە و ناسادەی تێنەپەڕی ئیخباری و ڕابوردووی نزیك و بەردەوام و تەواو و دووری سادەی تێنەپەڕ و ناسادەی تێپەڕی ئینشائیدا ، (نە) دەکەوێتە پێش قەدەوە :

*سادەی تێنەپەڕ :

أ-ڕابوردووی نزیك

| ئیخباری | | ئینشائی | |
|---|---|---|---|
| بووم | - نەبووم | بووبام | - نەبووبام |
| کەوتم | - نەکەوتم | کەوتبام | - نەکەوتبام |

ب-ڕابوردووی تەواو

| ئیخباری | | ئینشائی | |
|---|---|---|---|
| بووم | - نەبووم | بووبام | - نەبووبام |
| کەوتووم | - نەکەوتووم | کەوتبام | - نەکەوتبام |

ج-ڕابوردووی دوور

| ئیخباری | | ئینشائی | |
|---|---|---|---|
| بووبووم | - نەبووبووم | بووبوومایە | - نەبووبوومایە |
| کەوتبووم | - نەکەوتبووم | کەوتبوومایە | - نەکەوتبوومایە |

د-ڕابوردوی بەردەوام

| ئیخباری | ئینشائی |
| --- | --- |
| × | ببوومایە - نەبووبامایە |
| × | بکەوتبامایە - نەکەوتبامایە |

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروروشدا بە هەمان چەشنە :

ا-ڕابوردووی نزیك

| | ئیخباری | ئینشائی |
| --- | --- | --- |
| ئەز | کەتم - نەکەتم | کەتبم - نەکەتبم |

ب-ڕابوردووی تەواو

| | ئیخباری | ئینشائی |
| --- | --- | --- |
| ئەز | کەتمە - نەکەتمە | بکەتامایە - نەکەتامایە |

ج-ڕابوردووی دوور

| | ئیخباری | ئینشائی |
| --- | --- | --- |
| ئەز | کەتبووم - نەکەتبووم | کەتبووباما - نەکەتبووباما |

*ئاسانەی تێنەپەڕ و تێپەڕ :

ا-ڕابوردووی نزیك

| | | ئیخباری | | | | ئینشائی | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| تێنەپەڕ | دارێژراو | دابووم | دا | - | نەبووم | دابووبام | دا | - | نەبووبام |
| | | داکەوتم | دا | - | نەکەوتم | داکەوتبام | دا | - | نەکەوتبام |
| | لێکدراو | ئازادبووم | ئازاد | - | نەبووم | ئازادبووبام | ئازاد | - | نەبووبام |
| | | سەرکەوتم | سەر | - | نەکەوتم | سەرکەوتبام | سەر | - | نەکەوتبام |

| | | ئیخباری | | ئیلتزامی | |
|---|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | داڕێژراو | دلم گرت | دام – نەگرت | دام گرتبا | دلم – نەگرتبا |
| | | ڕام کرد | ڕلم – نەکرد | ڕلم کردبا | ڕام – نەکردبا |
| | | ڕێنگام گرت | ڕێنگام – نەگرت | ڕێنگام گرتبا | ڕێنگام – نەگرتبا |
| | لێکدراو | بەخێوم کرد | بەخێوم–نەکرد | بەخێوم کردبا | بەخێوم – نەکردبا |

ب–ڕابوردووی تەواو

| | | ئیخباری | | ئیلتزامی | |
|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕ | داڕێژراو | دابووم | دا–نەبووم | دابووبم | دا– نەبووبم |
| | | داکەوتووم | دا–نەکەوتووم | داکەوتبم | دا– نەکەوتبم |
| | | ئازادبووم | ئازاد–نەبووم | ئازادبووبم | ئازاد – نەبووبم |
| | لێکدراو | سەرکەوتووم | سەر–نەکەوتووم | سەرکەوتبم | سە – نەکەوتبم |

| | | ئیخباری | | ئیلتزامی | |
|---|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | داڕێژراو | دام گرتووە | دلم – نەگرتووە | دام گرتبێ | دلم– نەگرتبێ |
| | | ڕام کردووە | ڕلم – نەکردووە | ڕام کردبێ | ڕلم–نەکردبێ |
| | | ڕێنگام گرتووە | ڕێنگام – نەگرتووە | ڕێنگام گرتبێ | ڕێنگام– نەگرتبێ |
| | لێکدراو | بەخێوم کردووە | بەخێوم – نەکردووە | بەخێوم کردبێ | بەخێوم– نەکردبێ |

ج–ڕابوردووی دوور

| | | ئیخباری | | ئیلتزامی | |
|---|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕ | داڕێژراو | دابووبووم | دا–نەبووبووم | دابووبوومایە | دا–نەبووبوومایە |
| | | داکەوتبووم | دا–نەکەوتبووم | داکەوتبوومایە | دا–نەکەوتبوومایە |
| | لێکدراو | ئازادبووبووم | ئازاد–نەبووبووم | ئازادبووبوومایە | سەر–نەکەوتبوومایە |
| | | سەرکەوتبووم | سەر–نەکەوتبووم | سەرکەوتبوومایە | سەر–نەکەوتبوومایە |

| | | ئیخباری | | ئیلتزامی | |
|---|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | داڕێژراو | دامگرتبوو | دام–نەگرتبوو | دلم گرتبووایە | دلم–نەگرتبووایە |
| | | ڕام کردبوو | ڕام–نەکردبوو | ڕام کردبووایە | ڕلم–نەکردبووایە |
| | | ڕێنگامگرتبوو | ڕێنگام–نەگرتبوو | ڕێنگام گرتبووایە | ڕێنگام–نەگرتبوولیە |
| | لێکدراو | بەخێومکردبوو | بەخێوم–نەکردبوو | بەخێوم کردبووایە | بەخێوم–نەکردبووایە |

د–ڕابوردووی بەردەوام

| | | ئیخباری | | ئینشائی |
|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕ | دارێژراو | Ø | دلبووبامایە | دا–نەبووبامایە |
| | | | داکەوتبامایە | دا–نەکەوتبامایە |
| | لێکدراو | Ø | ئازادبووبامایە | ئازاد–نەبووبامایە |
| | | | سەرکەوتبامایە | سەر–نەکەوتبامایە |

| | | ئیخباری | | ئینشائی |
|---|---|---|---|---|
| تێپەڕ | دارێژراو | Ø | دلم بگرتبایە | دلم– نەگرتبایە |
| | | | ڕلم بکردبایە | ڕلم–نەکردبایە |
| | لێکدراو | Ø | ڕێگام بگرتبایە | ڕێگام– نەگرتبایە |
| | | | بەخێوم بکردبایە | بەخێوم–نەکردبایە |

٢–لە کرداری سادەی ڕابوردووی نزیك و تەواو و دووری تێپەڕی ئیخباری و ڕابوردووی نزیك و بەردەوام و تەواو و دووری تێپەڕی ئینشائیدا جێناوی لکاو دەکەوێتە نێوان (نە)و قەدی کردارەوە . وەك :

ا–ڕابوردووی نزیك

| ئیخباری | | | | | | | ئینشائی | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گرتم | نە | – | م | – | گرت | | گرتبام | نە | – | م | – | گرتبا |
| کردم | نە | – | م | – | کرد | | کردبام | نە | – | م | – | کردبا |

ب–ڕابوردووی تەواو

| ئیخباری | | | | | | | ئینشائی | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گرتوومە | نە | – | م | – | گرتووە | | گرتبم | نە | – | م | – | گرتبێ |
| کردوومە | نە | – | م | – | کردووە | | کردبم | نە | – | م | – | کردبێ |

ج-ڕابوردووی دوور

| نەرێنی | | | | | ئەرێنی | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گرتبوولیە | - | م | - | نە | گرتبوومایە | گرتبوو | - | م | - | نە | گرتبووم |
| کردبووایە | - | م | - | نە | کردبوومایە | کردبوو | - | م | - | نە | کردبووم |

د-ڕابوردووی بەردەوام

| نەرێنی | | | | | | ئەرێنی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| گرتبایە | - | م | - | نە | بم گرتبایە | Ø |
| کردبایە | - | م | - | نە | بم کردبایە | Ø |

لەم حاڵەتەدا دیالێکتی ژووروو وەك خواروو نییە - واتە جێناوی لکاو ناکەوێتە نێوان (نە)و قەدی کردارەوە و (نە) لە پێش قەدەوە دێت . وەك :

*لە حاڵەتی بوونی بەرکاردا :

ا-ڕابوردووی نزیك

| | |
|---|---|
| تە ئەز دیتم | تە ئەز نەدیتم |

ب-ڕابوردووی تەواو

| | |
|---|---|
| تە ئەز دیتمە | تە ئەز نەدیتمە |

ج-ڕابوردووی دوور

| | |
|---|---|
| تە ئەز دیتبوو | تە ئەز نەدیتبوو . |

*لە حاڵەتی نەبوونی بەرکاردا

ا-ڕابوردووی نزیك

| | |
|---|---|
| ئەز کر | ئەز نەکر |

ب-ڕابوردووی تەواو

| | |
|---|---|
| ئەز کردییە | ئەز نەکرییە |

ج-ڕابوردووی دوور

ئەز کریبوو      ئەز نەکریبوو

٣-لە کرداری ڕابوردووی بەردەوامی ئیخبارییدا :

أ-لە تێنەپەڕی سادە و تێنەپەڕ و تێپەڕی ناسادەدا ، (نە) دەکەوێتە پێش نیشانەی (دە-)وە - واتە لە نێوان (نە)و قەدەدا (دە-) دێت . وەك :

*تێنەپەڕی سادە

دەبووم      نە-دە-بووم

دەکەوتم      نە-دە-کەوتم

لە کرمانجیی ژووروشدا بە هەمان شێوەیە :

ئەز دکەفتم      نە-د-کەفتم

*تێنەپەڕ و تێپەڕی ناسادە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| تێنەپەڕ | داڕێژراو | دادەبووم | دا - نە - دە - بووم |
| | | دادەکەوتم | دا - نە - دە - کەوتم |
| | لێکدراو | ئازادەبووم | ئازاد - نە - دە - بووم |
| | | سەردەکەوتم | سەر - نە - دە - کەوتم |
| تێپەڕ | داڕێژراو | دام دەگرت | دام - نە - دە - گرت |
| | | ڕام دەکرد | ڕام - نە - دە - کرد |
| | لێکدراو | ڕێگام دەگرت | ڕێگام - نە - دە - گرت |
| | | بەخێوم دەکرد | بەخێوم - نە - دە - کرد |

ب-لە تێپەڕی سادەدا (نە + جێناوی لکاو + دە + قەد) . وەك :

دەم گرت          نە - م - دە - گرت

دەم کرد          نە - م - دە - کرد

لەم بارەدا کرمانجیی ژووروو وەك خواروو نییە و جێناوی لکاو ناکەوێتە نێوان (نە) و (دە)وە . وەك :

*لە حاڵەتی بوونی بەرکاردا

تە ئەز دیتم          تە ئەز نەدیتم

*لە حاڵەتی نەبوونی بەرکاردا

ئەز دکر          ئەز نەدکر

-٢-

# داخوازی

لە زوربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا ، (نە) وەك (مە) بۆ نەفی داخوازی بەکاردێنرێ .

| بووەستە | نەوەستی | نەوەستن |
| --- | --- | --- |
| بفڕە | نەفڕی | نەفڕن |
| بگەڕێ | نەگەڕێی | نەگەڕێن |
| بنوو | نەنووی[٣١٩] | نەنوون |
| ...[٣٢٠] | | |
| بنێیسە | نەنێیسە | نەنێیسن |
| بکەڵە | نەکەڵە | نەکەڵن |

[٣١٩] کاتێ (نە) بۆ نەفی کرداری داخـوازی بـەکاردێ ، لـە حاڵـەتی تـاکدا (ی)یـەك دێتـە ناوانەوە :

ا-ئەگـەر ڕەگـی کردارەکـە بـە نـەبزوێن کۆتـایی هاتبـێ ، بزوێنـی (ی - اْ) لـەجێی (ە) دادەنرێ . وەك :

ب + فڕ + ە      نە + فڕ + ی

ب + نووس + ە      نە – نووس – ی

ب-پێتو دوا دەنگی ڕەگی کردار بزوێن بێ ، ئەوە (ی - y)ی کۆنسـۆنانتی دەخرێتـە سـەر . وەك :

ب + گەڕێ      نە – گەڕێ – ی

ب + نوو      نە – نوو – ی

ب + ڕۆ      نە – ڕۆ – ی

[٣٢٠] ... کورە نەیەنە پێشەوە ئەکوژرێن .

(لە خەوما ، ل٣٢)

**تێبینی :**

ئامرازی (نە) لە هەموو ئەو حاڵەتە کارا دیارانەی سەرەوەدا ، چۆن خۆی دەنوێنێ ، لە باری کارا بزریشدا بە هەمان چەشن دەردەکەوێ . وەك :

نەگیرێم ، دانەگیرێم ...

نەگیرا ، دانەگیرا ...

دانەگیراوە ، دانەگیرابێ ...

دانەگیرابوو ، دانەگیرابووایە ...

نەگیرابام ، دانەگیرامایە ...

نەگیرابوو ...

دانەدەگیرا ...

**ئامرازی ( مە )**

ئەم ئامرازە تەنیا لە نەفی داخوازیدا بەکاردێنرێ و هەمیشە لە شوێنی (بـ – bi)ی داخوازی دادەنرێ . وەك :

بـ / مە ← فڕە

بـ / مە ← مێنە

ب
نوو
مە

ب
بۆ
مە

ب
هەڵ ‹ › گرە
مە

ب
فڕیا ‹ › کەوە
مە

...(٣٢١)

---

(٣٢١) دوور لە تۆ نیدی مەپرسە ، قوربان
حاڵی "نالی" کە نە مرد و نە ژیا !

(نالی ، ١٢٨)

مەثەلی مەحەد و وەفا وەك مەثەلی عەنقایە
پیاوەتی باسی لە کن کەس مەکە ، ئادەم بوە قات

(مەحوی ، ل٦٢)

مەنعی مەکەن (وەفایی) کە خاوی دڵ بڵاوە
سەرێکە مەستی ئازی ، دڵێکە بۆی نەماوە

(وەفایی ، ل ١٩٧)

ئەم دوێنە جێدێڵم ، بێ نیشان ، بێ شوێن بێ ،
ئەی پەری ! سڵمەکە ، لامەدە بۆ لاڕێ !

(گۆران ، ل٣٦)

... جەردە هاتە سەر ڕێگامان ، کوڕە مەڕژێن پووتەوە بێ ...
(لە خەوما ، ل٣٢)

ب
نڤیسە
مە

ب
کە
مە
(٣٢٢)
...

وێڕای ئەو سێ ئامرازە ، لە چەند حاڵەتێکدا (نی)و (تون)و (نـ – ni)ش وەك ئامرازی نەرێتی دەبینرێن .

ئامرازی (نی) لە گەردان کردنی کرداری (هەبوون / هەین)دا بەرچاو دەکەوێ .
(نێ) لە دیالێکتی خوارووردا تەنیا لە کاتی ڕانەبوردوودا بەکاردێ ، بەڵام لە دیالێکتی ژووروودا لە ڕانەبوردووش و ڕابوردووشدا دەبینرێ .

کرمانجیی خواروو

(هەبوون) :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕانەبوردوو | من | هەم | نیم |
| | تۆ | هەی | نیت |
| | ئەو | هەیە | نییە |
| | ئێمە | هەین | نین |
| | ئێوە | هەن | |
| | ئەوان | هەن | |
| ڕابوردوو | Ø | | |

(٣٢٢) واعظ مەبێژە بەیهودە وەعظان
بِ وەعظ و قەولان نابت هدایەت

(پەرتووین هەکاری ، ل ١٠٦)

دبێ : گەلی برا مەگرین ! ڕەبێ عالەمێ دەلیلێ حەیرییانە ئیرۆ
ڕۆژا جەژنە قوربانێیە ، وە دەمێ ژ قوناغێن خوە بەردانە .

(مەمێ ئالان ، ل٤٠)

## کرمانجیی ژووروو

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕانەبوردوو | ئەز | هەمە | نینم |
| | تو | هەیی | نینی |
| | ئەو | هەیە | نینە |
| | ئەم / هوون / ئەوان | | نینن |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕابوردوو | ئەز | هەبووم | نیبووم |
| | تو | هەبووی | نیبووی |
| | ئەو | هەبوو | نیبوو |
| | ئەم / هوون / ئەوان | هەبوون | نیبوون[٣٢٣] |

(تون) تەنیا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێ و بۆ نەرێتیی کاتی ئێستای کردلری (هەبین) - (ئەز تونەمە ... ئەم تونەنە...)و ڕابوردووی ئیخباری و ئینشائی و ، ڕێژەی داخوازی (هەبوون) : (تونەبووم ... تونەبووما ...) ، (تونەبە ... تونەبن) ... بەکاردێ .

ئامرازی (نە ni) هەر لە دیالێکتی ژووروری کوردیدا بەکاردێ و ئەویش تەنیا لە کردلری (کارین ، زانین)دا[٣٢٤]

بەوێنە ؛

لێ ماعرێ قەرقاش کر و نەکر ، نکاربوو ژ ناف دەست و پێنێد وی دەرکەتا ...

(کوردێ ، ل٣٠)

---

[٣٢٣] ق. کوردۆێک ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٦٥ ، ٢١١ - ٢١٢ .

[٣٢٤] هەمان سەرچاوە ، ل١٦٥ .

... ئەز نزانم ، کیژان ماعر بوو ...

(کوردنل ، ل٣٦)



لە زمانی ئاوێستا و فارسیی ناوەڕاستدا شێوەی ئامرازی (نا)ی کوردیی ئەمڕۆ نابینرێ . هەرچی (نە)و (مە)یە بەم جۆرەن :

لە زمانی ئاوێستادا (نە - یت)[٣٢٥] و لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا (نێ)[٣٢٦] بۆ نەرێتیی هەموو ڕێژەکانی کردار (جگە لە ڕێژەی داخوازی) بەکاردێنرێ .

هەرچی شێوەی (مە)ی کوردییە لە زۆربەی زمانە ئێرانییە نوێکاندا بە هەمان شێوەی کوردی دەبینرێ[٣٢٧] . لە ئاوێستا و فارسیی ناوەڕاستیشدا لە شێوەی (ما)دا هەیە .[٣٢٨]

---

[٣٢٥] س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل١٠٢ .

[٣٢٦] ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل٨٧ .

[٣٢٧] بڕوانە :

ا-ف. ئا. فورۆنوڤ ، زمانی بلووچی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل٤٦ .

ب-ن. ئا. دفۆریانکۆف ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل٥٣ .

جـ-ئا. ل. گریونبێرگ ، لەبارەی ڕێزمانی ئەفغانییەوە (پشتۆ) ، لێنینگراد ، ١٩٨٠ ، ل١١٧ .

[٣٢٨] بڕوانە :

ا-سەرچاوەی ناوبراو ، زمانی ئاوێستا ، ل١٠٢ .

ب-سەرچاوەی ناوبراو ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، ل٨٧ .

# کرداری کارا دیار و کرداری کارا بزر

بەراوردکردن و بەرانبەر یەکتر ڕاگرتنی کرداری کارا دیار و کارا بزر (چالاك و سست – Active and passive) بە ڕێگەی جیاکردنەوە لە خودی پرۆتسێسدا ناڕوات ، بەڵکو بە ڕێگەی جیاکردنەوە لە ڕێڕەوی پرۆتسێسدا تێدەپەڕی ، کە بە کردار دەربڕاوە . ئەم ڕێڕەوەی پرۆتسێس لە ڕووی هاوجووتی و پێوەندیی وشەی چەسپاو بە قاڵبی ڕێزمانیی کردارەوە تەماشا دەکرێ . هەرچی وشەی چەسپاویشە دەوری کارا دەبینێ : (منداڵەکە نووسی ...) ؛ (نامەکە نووسرا ...) . لەگەڵ ئەوەشدا حاڵەتی ئەوتۆش هەیە ، کە کردار پێوەندیی بە کاراوە نییە و بە ئەندامێکی دی ڕستەوە بەندە : (سەبارەت کوڕەی نووسی ...) ؛ (باسی نامە نووسراوەکە ...)

جیاوازیی بنەڕەتیی نێوان کارا دیاری و کارا بزری لەم ڕوونکردنەوەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

فۆرمی کارا دیار نیشانی دەدا پرۆتسێسی دیاریکردنی کردار لەو شتەوە دێ ، کە بۆ ئەو وشەیە تەرخان کرابێ و لەگەڵیدا فۆرمی کردارەکە هاوجووت بێ و لێیەوە بەرەو ناوەوە بچێ . بەڵام بە نیسبەت فۆرمی کارا بزرەوە ، مەسەلە بەپێچەوانەوەیە و پرۆتسێسی دیاریکردنی کردار بۆ ئەو شتە ئاراستە کراوە ، کە وشە تەرخان کراوەکە لەگەڵ فۆرمی کردارەکە هاوجووت بێ و لە ناوەوە بەرەو دەرەوە بچێ .[٣٢٩]

---

[٣٢٩] ئا. ئی. گولانۆف ، وشەسازیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٢٢ .

بۆ نموونه له ڕستەی (ئازاد نامەی نووسی)دا ، کردارەکه فۆرمی دیاری هەیه و واتای پرۆتسێسێك دەگەیەنێ ، که له کەسێکی ناسراو (ئازاد)ەوه پەیدا بووبێ و ئاراستەی ئاوەوه کرابێ . ئەوەی پێوەندی به نیشاندانی بەرکارەوه هەبێ ، لەم بارەدا هەرگیز شتێکی پێویست نییه ، ئەگەرچی لەو ڕستەیەدا ئەو نیشانانه هەیه . ڕستەی "ئازاد دەتوانێ بنووسێ" ئەگەرچی ڕێژەی کارا دیاره ، بەڵام هیچ ئیشارەتێك بۆ بەرکار نەکراوه (لەبەر نەبوونی تەواوکەری ڕاستەوخۆ) . بەم جۆره ، بوونی تەواوکەر (ئیشارەت کردن بۆ بەرکار) له دیاریکردنی کارا دیاری و کارا بزریدا شتێکی پێویست نییه . بەڵام بوونی تەنیا له جیاکردنەوەی تێنەپەڕی و تێپەڕیدا دەور دەبینێ .[٣٣٠]

به پێچەوانەوه ، له ڕستەی "نامەکه له لایەن ئەوانەوه نووسرا"دا ، کردارەکه له فۆرمی کارا بزریدا خۆی دەنوێنێ و پرۆتسێسی دیاریکراوی هاوجووتی له وشەی (نامە)ەوه نییه ، بەڵکو بۆی ئاراسته کراوه . لەم نموونەیەدا ، هەروەها ئەوەش ئاشکرایه ، که سەرچاوەی ڕوودان له کۆتاوه هەڵدەقوڵێ : لێرەدا کارکەر به ڕستەی تەواوکەری (له لایەن ئەوانەوه) دەربڕراوه . لەگەڵ ئەوەدا (دیاری کردنی کارکەر) شتێکی پێویست نییه . ئەگەر دیاریکردنی کارکەر له ئاواندا نەبێ ، ئەوه له حاڵەتێکی یەکجار زۆردا فۆرمی کردار به شێوەی سست دەمێنێتەوه .

پێویسته ئەوەش یادداشت بکەین ، که وا کاتێ به بۆنەی حاڵەتی کارا دیاری و کارا بزرییەوه باسی ئاراستەکردنی پرۆتسێس دەکرێ ، ئەوه بێگومان لەم بارەدا مەبەست ڕێڕەوی "ڕێزمانی"یەتی ، نەك ڕێرەوێکی دی ، که وا له واتای تایبەتی لێکسیکی ئەو وشەیەره هەڵهێنجرابێ .[٣٣١]

---

[٣٣٠] سەرچاوەی ئاوبراو ، سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، ل ٣٦٩ .

[٣٣١] هەمان سەرچاوه ، ل ٢٧٠ .

چالاکی یان سستی دەشێ واتای لێکسیکیی خودی کردارەکە بێت : بۆ نموونە ، پێوەندیی لێکسیکی نێوان کرداری (کارکردن)و (خۆڕاگرتن) لە پێوەندیی نێوان حاڵەتی چالاکی و حاڵەتی سستی دەچن . ئەو گرانییەی پێوەندی بە جیاکردنەوەی لێنوانی حاڵەتی کارا دیاری و کارا بزرییەوە هەیە ، بەر لە هەر شت لەوەدایە ، کە واتای ڕێزمانیی ئەم حاڵەتی بە ناوەرۆك لە واتای لێکسیکی کردارەوە نێزیکە . جا بۆیە گەڵ جار لێکدانی ئەو واتایەی بە فۆرمی ڕێزمانیی کارا دیاری و کارا بزری دەربڕراوە و ئەو واتایەی بە کردار وەك وشە ڕاگەیەنراوە ، ڕوودەدات . بەو پێیە لە حاڵەتی ئاشکرای واتای ڕێزمانیی کارا دیاری و کارا بزری بە فۆرمی کردار ڕاگەیەنراو ، خاسیەتی چالاکی و سستی واتای تایبەتی لێکسیکی وشە بەرانبەر یەك ڕادەگرێ . بۆ نموونە ، لە حاڵەتی (ئەو ئەوانی دی)دا ، لێکدانەوەی ڕێزمانی وا دەگەیەنێ ، یەکەم شت (ئەو) بە سەرچاوەی پرۆتسێسی - (دیتن) وەربگیرێ ، کە ئاراستەی شتێکی دی (ئەوان) کراوە . بە پێی بۆچوونی واقعی ، پێوەندیی نێوان شتی دیاریکراو - (ئەو ، ئەوان)و ئاراستەکردنی پرۆتسێس بریتییە لە ئەسازیی ڕاستەوخۆ : ئێمە کارناکەینە سەر ئەو شتەی دەیبینین ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ، شتەی لە لایەن ئێمەوە بینراو کاردەکاتە سەر ئێمە ، یان بە واتایێکی ڕاستتر کاردەکاتە سەر ئەندامەکانی هەستمان . بەم چەشنە واتای لێکسیکیی کرداری (دیتن) سستە ، کەچی واتای ڕێزمانیی فۆرمی کردارەکە لە ڕستەی (ئەو ئەوانی دی)دا چالاکە .

ئەم ئەسازییەی نێوان واتای ڕێزمانی و واتای لێکسیکی لە فۆرمی سستی کرداریشدا دەبینرێ . بەوێنە لە حاڵەتی (هەواڵ بیسترا)دا بەپێی بۆچوونی ڕێزمانی (هەواڵ) وەك شتێك خۆی دەنوێنێ ، کە لەژێر تەئسیری لەناوەوە بەرەو دەرەوە چووندا بێ و ئەوساش (هەواڵ) وەك لێکسیك واتای شتێك دەدات ، کە کاربکاتە سەر کەسێك و زۆری لێبکا وەریبگرێ .

نەسازیی نێوان مانای تایبەتی لێکسیکیی کردار و واتای ڕێزمانیی فۆرمی یار و بزر لە کرداری (خۆش‌ویستن ، دانیشتن ، گوێکرتن ... هتد)دا بەرچاودەکەوێ . لە هەندێ زماندا کرداری ڕوودان و ئەو کردارانەی بە هەستەوە بەندن بە شێوەی جیاواز لێك دەدرێنەوە [332]. بۆ نموونە (ئەو ئەوان دەبینێ) و (ئەو ئەوان دەکوژێ) لە ڕووی ڕێزمانیشەوە جیاوازییان هەیە . بەلاّم لە زمانی کوردی و زمانە هیند و ئەورووپاییەکانی دیدا وەك یەك جیاوازی لە نێوان ئەم حالّەتانەدا نییە . ئەم جۆرە حالّەتانە ، وەك (ئەو ئەوان دەبینێ) ؛ (ئەو ئەوان دەکوژێ) ؛ (ئەو دەخوات) تەنیا لە ڕووی لێکسیکییەوە لەیەك جیادەبنەوە ، ئەو جۆرە نموونانە لە زمانی کوردیدا لە ڕووی کارا دیاری و کار بزرییەوە لەیەك جیانابنەوە و گشتیان لە ژێر یەك جۆردا دادەنرێن ، ئەویش کارا دیارییە ، ئەگەرچی ڕەنگە بەشێك لە کرداری ئەو نموونانە چالاك نەبن .

پێوەندیی نێوان واتای لێکسیکی و واتای فۆرمی ڕێزمانیی کارا دیاری و کارا بزری دەستەی جیاوازی کردار ، دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە نیشان بدرێ :

ئەو دەکوژێ

لێکسیلە : ←———

ڕێزمان : ←———

(ڕووکاری تیراساییی جودا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشێ ، کە ئەو بابەتی لێکسیکی و ڕێزمانییەی بە جێناوی "ئەو" دیاری کراوە ، وەك سەرچاوەی ڕوودان خۆی دەنوێنێ) .

---

[332] ن. س. پۆسپێلۆڤ ، پێوەندیی نێوان حالاّتی ڕێزمانی و بەشەکانی ئاخاوتن ، کتێبی "کێشەی پێکهاتنی ڕێزمانی" ، مۆسکۆ ، 1955 ، ل 178 .

ئەو دەنوێنێ




(ڕووکاری تیرئاسایی جودا ، نیشانیدەدا ، کە بابەتی ڕێزمانی بە جێناوی "ئەو" دیاریکراو ، وەك سەرچاوەی ڕوودان خۆی دەنوێنێ . هەرچی ڕووی لێکسیکی‌یە ، وەك بەرکارێك کە کەوتبێتە ژێر کارتێکردنەوە ، دەردەکەوێ ) .

حاڵەتی سست لە کاتێکدا بەکاردێنرێ ، کە کارا لە ئارادا نەبێ . ئەگەر کارا دیار ئیشارەت بۆ سەرچاوە یاخود کارا بکا ، ئەوە کارا بزر ئەو ئیشارەتە ناکات . جا بوون و تایبەتێتی بەکارهێنانی حاڵەتی سست لەمەدایە . لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوەش یادداشت بکەین ، کە حاڵەتی ئەوتۆ هەیە ، ئەگەرچی ڕێژەی کارا بزری‌یە و کارلە ناونەبراوە ، کەچی سەرچاوە و کارا ناسراوە . بۆ نموونە ، کاتێ نووسەری کتێبێ دەڵێ : وەك پێشتر نیشاندرا (لە بریتی : وەك پێشتر نیشانم دا). بێدەنگی خۆنیشاندان لەم ڕاستی‌یە ، دەگەڕێتەوە بۆ لەخۆبوردوویی نووسەر . دەشێ ئەم جۆرە حاڵەتانە بە (کارا بزری لە خۆبوردوو) ناوببرێ [٣٣٣]. ئەم بارودۆخە - (توانستی نیشان نەدانی کارا) ، جارێکی دی ئەوە ئیسپات دەکا ، کە وا بۆ حاڵەتی کارا بزری گرنگ ئەوە نی‌یە بزانرێ ڕوودان لە کوێوە دێ ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بزانرێ ئەو ڕوودانە بۆ کوێ ئاراستە کراوە .

---

[٣٣٣] ئا . مایە ، شێوازی بەراوردکاری لە زمانناسیی مێژوویدا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٤ ، ل ٨٣ .

به پێچەوانەشەوە لە حاڵەتی کارا دیاریدا پرۆتسێسی ئەوتۆ هەیە ، کە سەرچاوەی ئاشکرا نییە ، بۆ نموونە : (ئازاد ئەما) ...

بەم بۆنەیەوە پێویستە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین ، کە کرداری تێنەپەڕ تەنیا لە فۆرمی چالاکدا بەکاردێنرێن ، بەتایبەتی بە هۆی هێزی تایبەتی لێکسیکییانەوە . بەکارنەهێنانی ئەو کردارانە لە حاڵەتی سستدا ، هۆی ئەوەیە ، کە ئەو ڕووداوانەی ئەم جۆرە کردارانە دیاری دەکەن ناتوانن ببنە مەفهوومی ئاراستەکراو بۆ شتێك .[٣٢٤]

هەروەها دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین ، کە ئەگەرچی لە ڕێژەی کارا بزریدا نیشاندانی کارای ڕووداو پێویست نییە ، کەچی لە هەندێ حاڵەتی سستدا سێبەری کارای پرۆتسێس خۆی نیشان دەدا . بۆ نموونە ، لە حاڵەتی (هەواڵ بیسترا)دا تا ڕادەیێك ئاشکرایە ، کە کەسێك هەواڵەکەی بیستووە . جا ئەمەیە کرۆکی جیاوازیی کارا بزری و سستی واتای خودی کردار . ئێستاش با سەیرێکی ئەم بەراوردە بکەین : (دەرگاکە داخرا) - لێرەدا پرۆتسێس وای دەردەخا ، کە دەرگاکە خۆی لە خۆیەوە داخراوە . جا لەبەر ئەوە سەرنج تەنیا بۆ بزووتنەوەی دەرگاکە ڕادەکێشرێ ، نەك بۆ ئەوەی کێ دایخست . بە پێچەوانەوە ، لە حاڵەتی (دەرگاکە داخرابوو)دا ، کە ناوەرۆکی چەسپاوی پرۆتسێس هەر یەك شتە ، سەرنج بۆ ئەوە دەچێ ، کە داخستنی دەرگاکە بریتییە لە ئەنجامی کارتێ کردنی دەرەکی ، ئەگەرچی لەم بارەدا ئیشارەت نەکراوە ، کە ئەو کارتێکردنە لە کوێوە هاتووە .

---

[٣٢٤] ف. ف. فینۆگرادۆف ، زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ - لینینگراد ، ١٩٤٧ ، ل ٦٠٧ .

بەو باسەی سەرەوەدا دەردەکەوێ ، ئەو ڕایە ڕاست نییە ، کە وا ڕادەگەیەنن ، گوایا گشت حاڵەتێکی چالاك دەشێ بگۆڕێ بە سست ، یان بە پێچەوانەوە هەموو حاڵەتێکی سست دەکرێ بکرێ بە حاڵەتی چالاك . وەك نیشانمان دا ، لە لایەکەوە ڕوودانی چالاك مەرج نییە هەمیشە بەرکاری ڕوودان بخاتە ڕوو . لە لایێکی دیەوە لە حاڵەتی ڕوودانی سستدا دەشێ کارا ئاشکرا نەبێ ، ئەگەرچی لە بیر و خەیاڵدا هەیە .

حاڵەتی کارا دیاری و کارا بزری چ لە زوودا و چ ئەمڕۆ بە بابەتێکی گرنگ و بایەخداری گەورە و بەپێزی لێکۆڵینەوەی دەلێك لە زمانناسان دادەنرێ . "... ڕێزمانناسانی جیا بە جۆری جیاواز لە قەوارە و ناوەرۆکی ڕێزمانیی حاڵەتی کارا دیاری و کارا بزری گەیشتوون . هەندێکیان لەم کێشەیەدا تەنیا ڕەنگدانەوەی پێوەندیی ڕوودان بۆ بەرکاریان بینیوە . بەشێکی دی بۆ نێو چەزی واتای کارا دیاری و کارا بزری لەگەڵ پێوەندیی بەرکاری ، هەروەها پێوەندیی جۆراوجۆری ڕوودان بەرانبەر کاراشیان خستووەتە ناو . بەشی سێیەم کۆششی دیاری کردنی مەفهورمی کارا دیاری و کارا بزرییان کردووە ، کە بە پێوەندی بە کاراوە دەردەبڕدرێ " . [٣٣٥]

لەباری پێوەدیی ڕوودان بە کاراوە هەندێ لە زمانناسانی زووی ئەورووپا شەش جۆریان دیاری کردووە . ئەگەرچی زوربەی زمانناسانی هاوچەرخ لەسەر دوو جۆری کارا دیار و کارا بزر ڕێکەوتوون ، [٣٣٦] بەڵام لە لێکدانەوەیاندا ڕای جیاوازیان هەیە .

---

[٣٣٥] بۆ نموونە ، م. ف. لۆمۆنۆسۆفی زانای ڕووس لە لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی ڕووسیدا شەش جۆری جیاکردووەتەوە و تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم پەیرەوی کراوە .

[٣٣٦] بەڵام ئێستاش زمانناس هەیە لە دوو جۆر پتری باس کردبێ .

بەشێك لە زماننـاسانی ئەمڕۆ وەك حاڵەتی دەربڕینی پێوەندیی ڕوودان بە بەرکارەوە دەڕواننە کارا دیاری و کارا بزری . بەپێی ئەم مەفهوومەش باسەکە لەگەڵ تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندندا هاوشان ڕادەگرن . بەشێکی دی لە زانایان حاڵەتی تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندن لە حاڵەتی کارا دیاری و کارا بزری جیادەکەنەوە و لەو ڕایەدان ، کە مەسەلەکە بریتی‌یە لە پێوەندیی ڕوودان بە کاراوە . کۆمەڵی سێیەم وەك دەربڕینی حاڵەتی پێوەندیی کارا بە بەرکارەوە لێك دەدەنەوە .[٣٣٧]

لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ، کە پێوەندیی ڕوودان بە بوون و نەبوونی کاراوە مەرجی بنەڕەتیی دیاریکردنی کرداری کارا دیار و کارا بزرە . کێشەکەش بەبێ ڕەچاوکردنی تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندن بەرێوە ناچێ . وێڕای ئەوە ڕێژەی کارا بزر هەر لە کرداری تێپەڕەوە پەیدا دەبێ و پاشگری (-ر)ش نیشانەی ڕێزمانی‌یەتی .
ئەو کردارە تێپەڕانەی واتای ڕوودانێك ، کە کارا ئەنجامی دابێ و چالاکانە ئاراستەی بەرکار کرابێ ، بە کارا دیار ناوبەبرێن . حاڵەتی کارا دیاری خاوەنی

---

-

بڕوانە :

أ-ق. کوردۆئیێف ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالیکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١٨٨ - ١٩٣ .

ب-د. نەسرین محەممەد فەخری ، کردار لە زمانی کوردیدا (کورتەی نامەی دوکتۆری) ، باکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١٣-١٤ .

[٣٣٧] ن. س. ڤالگینا ، د. ێ. ڕۆزنتال ، م. ئی. فۆمینا ، ڤ. ڤ. لاپکیتیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٤٦ .

ئەو خاسیەتە ڕستەسازی‌یەیە ، کە کارای ڕوودان نەبهادە و بەرکاریش - گوزارەیە .

کرداری کارا بزر لە ڕووی واتاوە هاوشانی کرداری کارا دیارە ، بەڵام خاوەنی خاسیەتی وشەسازی و ڕستەسازیی خۆیەتی . لە زمانی کوردیدا کرداری کارا بزر بە زۆری بە لکاندنی پاشگری (-ر) بە کرداری کارا دیارەوە دەردەبڕێ و ئەمەش ڕێگەی وشەسازی‌یە . وێڕای ئەمە ڕێگەی ڕستەسازی و شیکاریش هەیە ، کە لە ئەنجامی جیاوازیی ڕستەسازی لە دەربڕینی کارا و بەرکاری ڕووداندا ، یان بوونی بەرکاری ڕوودان و نەبوونی یەکجارەکی ، یاخود جیاوازیی فۆرم و واتای ئەو ناوانەی کردارەکە ئاراستەدەکەن ... پێك دێ .

دەستووری گشتیی هەموو زمانێك لە گۆڕینی ڕستەیێکی کارا دیار بۆ کارا بزر بریتی‌یە لە دەرهاویشتنی کارا و سپاردنی ئەرك بە بەرکار (بەڵام بەرکار هەمان ئەرك و مەفهوومی خۆی دەمێنێ) . ئاشکراشە هەر زمانە خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی :

نیشانەی کارا بزری کاتی ئێستا لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری (-یە)ە . کاتی ئێستای کارا بزر بە لکاندنی ئەو پاشگرە بە ڕەگی کرداری کاتی ئێستاوە دروست دەبوو و بە دوا ئەویشدا کۆتایی پێویست دادەنرا . بەوێنە کرداری "کارتان" (کردن) بۆ کەسی سێیەمی تاکی کرداری کارا بزری کاتی ئێستا دەبێ بە "کونیهێت" . کرداری "خوارتان" (خواردن) لە کەسی سێیەمی تاکی کارا بزری کاتی ئێستادا دەبێ بە "خواریهێت" ... کاتی ڕابوردووی کارا بزریش ، هەروەها لە ڕەگی کرداری کاتی ئێستا و هەمان پاشگری کارا بزریی (-یە) سازبووە . بەڵام کۆتایی تایبەتی (یست)ی وەرگرتووە . بۆ نموونە ، کرداری "داتان" (دان) لە کەسی سێیەمی تاکی کارا بزری کاتی ڕابووردوودا

دەبێ بە "داهیهیست" . کرداری "کارتان" (کردن) لە ڕابوردووی کارا بزریدا ڕەگی کۆنی بەکاردێ - "کاریهێنست" .[٣٢٨]

لە زمانی فارسیی نوێدا ئەگەرچی "شد" و "گشت"و "گردید" یاریدەی سازکردنی کرداری کارا بزر دەدەن ، بەڵام "شد" پتر بەکاردێنرێ . بۆ نموونە "بردەشد" (برا) ؛ "خوردەشد" (خورا) ؛ "زدەشد" (لێدرا) .[٣٢٩]

لە دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا کارا بزر بە هاتنی چاوگ لەگەڵ فۆرمی گەردان کراوی کرداری "بایاگ" (بوون)دا دروست دەبێ . بۆ نموونە "مان کوشاگابان" (من دەکوژرێم) ؛ "ئێ کوشانگا بیت" (ئەم دەکوژرێ) ... هتد . لە دیالێکتی ڕۆژهەڵاتیشدا کارا بزر لە فۆرمی ڕەگی کاتی ئێستای کردار و پاشگری (-یێ)ی لە زمانی هیندییەوە وەرگیراو و کۆتاییەکانی کردار پێک دێت .[٣٤٠]

لە زمانی پشتۆدا حاڵەتی کارا بزر لە کرداری تێپەڕەوە دروست دەبێ . بۆ پێکهێنانی ئەم ڕێژەیە ، کرداری یاریدەدەری (کیدل) و هاوتاکانی (سول ، شول) دەوردەبینن .[٣٤١]

کارا بزر لە زمانی ڕووشانیدا لە ڕەگی کاتی ڕابوردووی کردار + پاشگری (-اك) + کرداری یاریدەدەری "ساو ، سوت" (بوون) پێك دێ .[٣٤٢]

---

[٣٢٨] ل. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ١١٢ – ١١٣ .

[٣٢٩] ذو النور ، دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی ، تەهران ، ١٣٤٣ ، ل ٨٧ – ٨٨ .

[٣٤٠] ل. ئ. فۆرولۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٥٥ .

[٣٤١] ن. ئا. دفۆریانکۆف ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل٥٦ .

[٣٤٢] ت. ن. پاخالینا ، زمانە پامیرییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ٣٨ .

لە زووەوە بەکارهێنانی پاشگری (ـڕ) وەک کەرەستەی سازکردنی حاڵەتی کارا بزری بە تایبەتێتی‌یێکی زمانی گرووپی ئیتالی تەماشا ئەکرا ، بەڵام دواتر زمانناسان لە قووڵبوونەوەی لێکۆڵینەوەی بەراوردی ڕێزمانی زمانە هیند و ئەوروپاییەکاندا تا ئەهات ڕووتر پێوەندیی و نیزیکیی ئەو زمانانەیان ئاشکرا ئەکرد . یەکێك لەو دۆزینەوانە نیشاندانی خاسیەتی بەکارهێنانی هەمان پاشگری (ـڕ)ە لە زمانە کەلتی‌یەکاندا[٣١٣] . ئەم ڕێکچوونە بووە هەوێنی وەدەستهێنانی ئەنجامی گەورەتر .[٣١٤]

"لە لێکۆڵینەوەی بەراوردی تایبەتێتی ڕێزمانی زمانە هیند و ئەوروپاییەکاندا بەڵگەی هەندێکی (الجزئي) هاوجووتی ئەوتۆ سەرنج ڕائەکێشێ ، کە ئەك سەرجەمی زمانە هیند و ئەوروپاییەکان ، بەڵکو بەشێکیان ئەگرنەوە . یەکێك لە نموونەی ئەو دیاردەیە ، بریتی‌یە لە پێکهاتنی حاڵەتی ناوەندیی کارا بزری بە یاریدەی (ـڕ) ، کە تا دۆزینەوەی بەڵگەنامەکانی

(٣١٣) هەرچەندە ئاخاوتنی زۆری هۆزە کەلتی‌یەکان لە هەزارەی یەکەمی پێش زایندا دەوریکی گەورەی مێژوویی بینیوە ، بەڵام ئەوەی گەیشتبێتە ئێمە ، پاشماوەیێکی هەژاری زمانی گالی (بە شێوەیێکی سەرەکی نووسراوی سەر کێل )و چەند نووسینێکی ئیرلەندیی سەدەکانی ٦-ی پێش زایینە .

زمانە کەلتی‌یە زیندووەکانی ئەمڕۆ ئەمانەن : ئیرلەندی ، سکۆتلەندیی ، وێلشی ، کە نزیکەی ملیۆنێ کەس لە ناوچەی وێلزدا پێی ئەدوێن ، بریتۆن - زمانی دانیشتوانی هەرێمی بریتان لە فەرەنسا (لە سەدەکانی ٦-٥ی پ. ز دا بریتۆنەکان لە ئەنجامی دەست درێژی کردنی ئەنگلۆ - ساکسۆنەکانەوە بەریتانی نیشتمانی خۆیان بەجێ هێشتووە) . پاشماوەی ئاخاوتنی کەلتی هەروەها لە زمانی مێن دا (کە لە دوورگەی مێن ئەژین ) ماوە .

(٣١٤) ڤ. ل. ڤلینسکایا ، کێشەی لێکۆڵینەوەی خزمایەتیی زمانە هیند و ئەوروپاییەکان ، مۆسکۆ - لێنینگراد ، ١٩٥٥ ، ل ١٤٥ .

تۆخاری[٢١٥] و هیتی ، تەنیا وەك تایبەتێتی خاسیەتی گرووپی زمانی ئیتالی و کەلتی تەماشادەکرا " .[٢١٦]

لە زمانی لاتینیدا[٢١٧] فۆرمی کرداری کارا بۆ بەڕێگەی ئیزافەکردنی کۆتایی بۆ سەر ڕەگی کردار پێك دێ . ئەگەر کردارەکە بەر گەردانی یەکەم یان دووەم یان چوارەم بکەوێ ، کۆتایی (ri) وەردەگرێ ، بەڵام بێتو سەر بە گەردانی سێیەم بێت ، ئەوە (i)ی دەخرێتە سەر .[٢١٨]

| گەردان | ڕەگی کردار | فۆرمی کۆتایی | واتای بە کوردی |
|---|---|---|---|
| ١- | Cur-ā- | Cur-a-ri | چارکران |
| ٢- | Misc-ē- | Misc-e-ri | تێکەڵکران |
| ٤- | Sud-ī- | Sudi-ri | بیستران |
| ٣- | Defend- | Defend-i | بەرگرییکران |

---

[٢١٥] زمانە تۆخارییەکان ، دوو زمانی خزمی یەکجار لە یەك نزیکن و لقێکی سەربەخۆی زمانە هیند و ئەوروپایەکان (مێژووی مانانیان بە زمانی هیند و ئەوروپایی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٨ ، کە زانایانی ئەڵمان : ئی . زیگ و ف . زیگلین ئیسپاتیان کرد . تۆخارییەکان لە سەدەکانی ٦-٧ دا لە ڕۆژهەڵاتی تورکستان ژیاون . تا ئێستا نەزانراوە کە ناوی ئەو میللەتە لە چییەوە هاتووە . بۆیە وا بووە بە باو یەکێك لەو دوو زمانە - تۆخاریی ڕۆژهەڵات - بە تۆخاریی A ناوببرێ و ئەوی دوویان - تۆخاریی ڕۆژئاوا - بە تۆخاریی ب .

[٢١٦] سەرچاوەی ناوبراو ، کێشەی لێکۆڵینەوەی خزمایەتیی زمانە هیند و ئەوروپاییەکان ، ل ١٤٩ .

[٢١٧] زمانی لاتینی یەکێکە لە زمانە دێرینەکانی گرووپی ئیتالی . کۆنترین بەڵگەنامەی لاتینی دەگەڕێتەوە بۆ شەش سەد ساڵ پ. ز. هەرچی زۆربەی بەڵگەنامەکانیشێتی هی سەدەکانی ٣-٢ی پێش زایینن .

[٢١٨] ن. م. لێمیک ، زمانی لاتینی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٥٢ .

کـرداری تێنەپـەڕ بـە فۆرمـی هەمەچەشـنییەوە نـاتوانی پێوەندیـی جۆربەجۆری ڕووداو یان بارودۆخ بە کاراکەیەوە یان بەرکارەکەیەوە نیشان بدا (جگە لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی نەبێ)و هەروەها کرداری تێپەڕیان لێ دروست نابێ . کرداری تێنەپەڕ پێوەندی بە کێشەی کارا دیاری و کارا بزری‌یەوە نی‌یە و کرداری کارا بزری لێ پەیدا نابێ . لە کرداری تێپەڕەوە دەکرێ کرداری تێنەپەڕ دروست بکرێ و کرداری تێپەڕیش دەتوانێ پێوەندیی ڕووداو بە کارا و بەرکارەوە ڕابگەیەنێ .[349]

وەسیلەی باو و چالاکی دەربڕینی پێوەندیی هەمە جۆری ڕووداو بە کارا و بەرکارەوە ، لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا ، بوون یان نەبوونی پاشگری (ـرـ)ە . گشت کردارێکی تێپەڕ ، کە ئەو پاشگرەی وەرگرت دەبێتە کارا بزر .

پاشـگری (ـرـ)ی کـارا بـزر بـە کۆتـایی ڕەگـی کـرداری ڕانـەبوردووەوە دەلکێ[350] . لە هاتنی ئەو پاشگرە بە دوا ڕەگی کرداری ڕانەبوردوودا سێ حاڵەت هەیە :

١-ئەگەر فۆرم چاوگ بێ و چاوگەکەش بە هەر چەشنێك کۆتایی هاتبێ - (ان ، ین ، وون ، دن ، تن) ، ئەوە سەرپاکیان دەبن بە (ان) - واتە : ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو + ر + ان . بۆ نموونە :

---

[349] ی. ی. ڤێنۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسیی لەمڕۆ (وشەسازی) ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ ، ل ٣٢٨ - ٣٣٩ .

[350] هەرچەندە کە بوونی ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو بە بناغەی سازکردنی کرداری کارا بزر دەستوورێکی گشتیی زمانی کوردییە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ حاڵەتی بێزۆك هەیە (دواتر لێیان دەدوێین) .

| کۆتایی | چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | پاشگر | کۆتایی | چاوگی کارا بزر |
|---|---|---|---|---|---|
| ان | هێنان<br>کێلان<br>شێلان | هێن<br>کێڵ<br>شێل | ر | ان | هێنران<br>کێڵران<br>شێلران |
| ین |ماڵین<br>چنین<br>بینین | ماڵ<br>چن<br>بین | ر | ان | ماڵران<br>چنران<br>بینران |
| وون | جوون<br>دروون<br>گروون | جوو<br>دروو<br>گروو | ر | ان | جووران<br>درووران<br>گرووران |
| دن | ناردن<br>ژەندن<br>خوێندن | نێر<br>ژەن<br>خوێن | ر | ان | نێرران<br>ژەنران<br>خوێنران |
| تن | هێشتن<br>کوشتن<br>شوشتن | هێڵ<br>کوژ<br>شۆ | ر | ان | هێڵران<br>کوژران<br>شۆران |

٢-کردار لە ڕێژەی ڕانەبوردوودا بێ ، نیشانەی (ێ) وەردەگرێ - واتـە : نیشانەی (دە / ئە)ی ڕانەبوردوویی + ڕەگی ڕانەبوردوو + ر + ێ . بەوێنە :

| چاوگ | (دە/ ئە )ی نیشانەی ڕانەبوردوویی | ڕەگی ڕانەبوردوو | پاشگر | کۆتایی | کرداری کارا بزر لە دەمی ڕانەبوردوودا |
|---|---|---|---|---|---|
| هێنان<br>کێلان<br>شێلان | دە / ئە | هێن<br>کێڵ<br>شێل | ر | ێ | دەهێنرێ<br>دەکێڵرێ<br>دەشێلرێ[٣٥١] |

(٣٥١) شێلم و برێش تێک هەڵ ئەشێلرێ
چاڵێکی قووڵی بۆ هەڵ ئەکەنرێ

(پیرەمێرد ، ل ٣٧٢)

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| مالین<br>چنین<br>بینین | دە / نە | مال<br>چن<br>بین | ر | ێ | دەماڵرێ<br>دەچنرێ<br>دەبینرێ |
| جوون<br>دروون<br>گروون | دە / نە | جوو<br>دروو<br>گروو | ر | ێ | دەجوورێ[٣٥٢]<br>دەدروورێ<br>دەگروورێ |
| ناردن<br>ژمندن<br>خوێندن | دە / نە | نێر<br>ژمن<br>خوێن | ر | ێ | دەنێررێ<br>دەژمنرێ<br>دەخوێنرێ |
| هێشتن<br>کوشتن<br>شوشتن | دە / نە | هێل<br>کوژ<br>شۆ | ر | ێ | دەهێلرێ<br>دەکوژرێ[٣٥٣]<br>دەشۆرێ |

٣-ڕێژەی ڕابوردووی کردار نیشانەی (ا)ی پێوە دەلکێنرێ واتە : ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو + ر + ا . وەك :

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | پاشگر | کۆتایی | کرداری کار بزر لە دەمی ڕابوردوودا |
|---|---|---|---|---|
| هێنان<br>کێلان<br>شێلان | هێن<br>کێل<br>شێل | ر | ا | هێنرا<br>کێلرا<br>شێلرا |

(٣٥٢) پارووی هەلا نەجوورێ ، قووت نادرێ .

(پەندی پێشینان ، ل ١٣٠)

(٣٥٣) ... ئەموت ئەما هەر ئێستا ئەکوژرێم

(لە خەوما ، ل ٣٠)

... کورە ئەیمە پێشەوە ئەکوژرێن

(لە خەوما ، ل ٣٢)

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ماڵین<br>چنین<br>بینین | ماڵ<br>چن<br>بین | ر | ا | ماڵرا<br>چنرا<br>بینرا |
| جوین<br>دروین<br>گروین | جوو<br>درو<br>گرو | ر | ا | جوورا<br>دروورا<br>گروورا |
| ناردن<br>ژەندن<br>خوێندن | نێر<br>ژەن<br>خوێن | ر | ا | نێررا<br>ژەنرا<br>خوێنرا |
| هێشتن<br>کوشتن<br>شوشتن | هێڵ<br>کوژ<br>شۆ | ر | ا | هێڵرا<br>کوژرا[٢٥٤]<br>شۆرا[٢٥٥] |

[٢٥٤] کە کوژرا ، شاهی عالی جاهی عیشقە
هەلا مەیدت نەکەن ئاگەیە لیتراك

(مەحوی ، ل١٨٦)

سەر بوو بنا گوێ و دەنگوباس پرسین
"کێ مرد لە بەرلین ؟ کێ کوژرا لە چین ؟"

(گۆران ، ل١٤٦)

[٢٥٥] مەگەر هەر یاری نەقشینم بیئە نەقشبەندی دڵ
کە نەقشی غەیری ڕەنگی ئەو بە ئاوی دیدە شۆرابێ

(نالی ، ل٦٠٠)

بەو پێیە دەرکەوت ، کە پاشگری کرداری کارا بزر لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا نە (ران)ە و نە (رێ)یە و نە (را)یە و نە (درا)... یە ، بەڵکو تەنیا (-ر)ە[٢٥٦] . هەرچی هەڵکەوتی (ان)و (ێ)و (ا)یشە ، ئەمەیە :

(ان)- نیشانەی چاوگە لە حاڵەتی کارا بزریدا .

(ێ)- نیشانەی کاتی رانەبوردووی کردارە لە حاڵەتی کارا بزریدا .

(ا)- نیشانەی کاتی ڕابوردووی کردارە لە حاڵەتی کارا بزریدا .

کرداری کارا بزر لە گەردان کردندا وەك کرداری تێنەپەڕی کارا دیار جێناوی لکاو وەردەگرێ . بۆ نیسپاتی ئەمە با تەماشای ئەو خشتەیەی خوارەوە بکەین .



[٢٥٦] لەنیا ماموستایان ، کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا (دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل٧٦)و زارێ یووسف (دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، لینینگراد ، ١٩٨٥ ، ل١٠٤ ؛ کرداری کارا بزر لە زمانی کوردیدا - بە کەرەستەی دیالێکتی خواروو- "نووسراوە ملیۆنەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی رۆژهەلات" ، لینینگراد ، ١٩٧٣ ، ل١٤٧)و محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردەدا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل٢١٢)، (-ر)یان بە پاشگری کارا بزر داناوە ، دەنا سەرجەمی نووسەرانی دی بە (-ران) یان (رێ) یان (را)یان لە قەڵەم داوە .

| جێناوی کەسیی جودا | کارا دیار | | | | | کارا بزر | | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| | ڕانەبوردوو | ڕابوردوو | | | | ڕانەبوردوو | ڕابوردوو | | | |
| | | نزیک | بەردەوام | تەواو | دوور | | نزیک | بەردەوام | تەواو | دوور |
| من | دەمرم | مردم | دەمردم | مردووم | مردبووم | دەبینرێم | بینرام | دەبینرام | بینراوم[257] | بینرابووم |
| تۆ | دەمری (یت) | مردی (یت) | دەمردی (یت) | مردووی (یت) | مردبووی (یت) | دەبینرێی (یت) | بینرای (یت) | دەبینرای (یت) | بینراوی (یت) | بینرابووی (یت) |
| ئەو | دەمرێ (یت) | مرد | دەمرد | مردووە | مردبوو | دەبینرێ (یت)[258] | بینرا | دەبینرا | بینراوە | بینرابوو |
| ئێمە | دەمرین | مردین | دەمردین | مردووین | مردبووین | دەبینرێین | بینراین | دەبینراین | بینراوین | بینرابووین |
| ئێوە | دەمرن | مردن | دەمردن | مردوون | مردبوون | دەبینرێن | بینران | دەبینران | بینراون | بینرابوون |
| ئەوان | | | | | | | | | | |

---

(٢٥٧) بزوێنی (وو) ، کە بە هوا بزوێنی (ا)دا دێت ، هەمیشە کۆنسۆنانتە .

(٢٥٨) دوو (ێ) ، کە دەکەونە دوای یەکیان تێدا هەڵدەچێ .

هەرچەندە بوونی ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو بە بناغەی سازکردنی کرداری کارا بزر دەستوورێکی گشتیی زمانی کوردییە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ حاڵەتی بێژۆك و هەندێ گۆڕانی فۆنەتیکی بەرچاو دەکەوێ :

أ)حاڵەتی بێژۆك :

١-بوونی ڕەگی کاتی ڕابوردوو بە بناغە . بۆ نموونە :

| چاوگ | کاتی ڕەگی ڕانەبوردوو | کاتی ڕەگی ڕابوردوو | کارا بزر |
|---|---|---|---|
| وتن / گوتن | لێ | وت / گوت | وتران / گوتران ، دەوترێ / دەگوترێ ، وترا / گوترا ... |
| ویستن | ەوێ | ویست[٢٥٩] | ویستران ، دەویسترێ ، ویسترا ... |
| ... هتد | | | |

٢-بوونی ڕەگی کرداری ڕانەبوردووش و ڕابوردووش بە بناغە .

بۆ نموونە :

| چاوگ | ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو | کارا بزر | ڕەگی کاتی ڕابوردوو | کارا بزر |
|---|---|---|---|---|
| هاویشتن | هاوێژ | هاوێژران ، دەهاوێژرێ ، هاوێژرا ... | هاویشت | هاویشتران ، دەهاویشترێ ، هاویشترا ... |
| خواستن | خوازێ | خوازران ، دەخوازرێ ، | خواست | خواستران ، دەخواسترێ ، |

(٢٥٩) بۆ کرداری (بەستن ، فرۆشتن ، لێستنەوە ، پەستن ، ڕنستن ...) کە دەشێ : ١-(بەسترا ، فرۆشترا ، لێسترایەوە ، پەسترا ، ڕنسترا ...) یاخود ٢-(بەسرا ، فرۆشرا ، لێسرایەوە ، پەسرا ، ڕنسرا ...)ش بووترێ ، هۆی ئەوە نییە ، کە ئەوانەی دەستەی یەکەم بەبناغەی ڕەگی کاتی ڕابوردوو دروست کراون و ئەوانی کۆمەڵی دووەمیش لە ڕێگەی ڕەگی کاتی ڕانەبوردووەوە سازکراون ، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە ، کە لە حاڵەتی دووەمدا بۆ مەبەستی سووك وتن (ت)ەکە دەسوێ . بەڵگەیێکی دی بۆ ئیسپات کردنی ئەوەی ، مەسەلەکە هۆی بوونی ڕەگی جیاواز نییە ، وشەیێکی وەك (ویستن) دەکەینە نموونە . ئەم وشەیە ، کە لەسەر بناغەی ڕەگی ڕابوردوو دەبێتە کارا بزر ، هەمان بوودانی (ت)ی تێدا دەبینرێ : (ویست – ویسترا / ویسرا)و چاکیش دەزانین (ەوێ) ڕەگی کاتی ڕانەبوردوویەتی ، نەك (ویس) .

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| [illegible] | | خوازرا ... | | خواسترا ... |
| ...ستن | خە | خران ، دەخرێ ، خرا[360] | خست | خستران ، دەخسترێ ، خسترا |
| ...تد | | | | |

ب)گۆڕانی فۆنەتیکی :

١-ئەو کردارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان کۆتایی بە (ۆ) هاتبێ ، دەبنە (و) .

وەك :

| چاوگ | ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو | دوا دەنگی ڕەگ | گۆڕان | کرداری کاتی بڕبڕ |
|---|---|---|---|---|
| خواردن | خۆ | ۆ | و | خوران ، دەخورێ[361] ، خورا[362] |
| ... هتد | | | | |

٢-ئەگەر دوا دەنگی ڕەگی کردارێکی ڕانەبوردوو (ە) یان (ێ) بێ ، ئەوە لە حاڵەتی کردنی بە کارا بزردا دەبن بە بزرۆکەی ( ا ) یاخود تێدا دەچن[363]. بۆ نموونە :

---

(360) هێولر بە ماڵە چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا سەدمان لێ خرا

(پێکەس ن ل ٥٨)

(361) ئەیر هەیە گۆشتی ئەخورێ ، ئەیر هەیە گۆشتی ئەمرێنێ .

(پەندی پێشینان ، ل ١٦٢)

(362) بە هەرچ دەردێك بوو نان و چا خورا
دیسان بۆ ڕێگا ناوی خوا برا

(گۆران ، ل١٤٠)

(363) لە حاڵەتی چاوگی و کاتی ڕابوردوودا دەبن بە (ا) ، وەك ، (bira , biran) ، ( dira و diran) ، (kira , kiran) ، (debrê) ، (dedrê) ، (dekrê) ، (dexrê)...

| چاوگ | ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو | دوا دەنگی ڕەگ | گۆڕاو | کارا بزر |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| بردن | بە | | | بران ، نەبرێ ، برا ...[٣٦٤] |
| دان | دە | | | دران ، نەدرێ[٣٦٥] ، درا ...[٣٦٦] |
| کرد | کە | ـە | | کران ، نەکرێ ، کرا ...[٣٦٧] |
| خستن | خە | | | خران ، نەخرێ ، خرا |
| ... هتد | | | | |
| نان | نێ | ێ | Ø, I | نران ، نەنرێ ، نرا ...[٣٦٨]،[٣٦٩]،[٣٧٠] |

(٣٦٤) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٣٦)

(٣٦٥) جوانی لە پیری گەر مارە بکرێ
بێشک زەرییە لە ئەخلاق نەدرێ

(بێکەس ، ل ١٢٧)

(٣٦٦) ... خەبەر بە برایم پادشای درا

(تحفة مظفریە ، ب١ ، ل٢٤٦)

(٣٦٧) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٢٤)

(٣٦٨) حوققەیکی زەری سافی لەسەر بانی نرا بێ
نەخچیکی بەمەد مەنمەلی (مانی) قەڵەمشابێ !!

(نالی ، ل٦١٤)

(٣٦٩) زۆربەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەبەر نیشکی ناتەواویی نموونی نیگار بۆ بزوێنی (ا) لە نووسینی کوردی بە ئەلفوێتی عەرەبیدا ، وایان داناوە ، کە (ە) و (ێ)ی دوا دەنگی ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو لە حاڵەتی کردنیان بە کارا بزر تیدا دەچن . ئەگەرچی ئەم ڕێنووسە لە ڕەچاونەکردنی بزوێنەکەی ( ا )دا ناتەواوە ، بەڵام ئەوانەی لە باسی زمان دەدوێن ، نابێ وا ساکار تەنیا تەماشای ڕواڵەت و ڕوخساری نووسین بکەن . بۆ نموونە ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد وتوویە ، "کە دوو کاری (دەکەم ، دەبەم) بزوێنی دوای کاف و بێیەکە نامێنێ و دەبێتە (کرا ، برا) " (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ل ١٣٩) .

(٣٧٠) د. زارێ یووسف لە وتاری "کرداری کارا بزر لە زمانی کوردیدا" وای داناوە ، کە (ێ) تیدا دەچێ ، کەچی لەو نموونانەدا کە هێناویەتییەوە ، بە ئاشکرا ( ا ) دیارە ،

.. هتد [٣٧١]

٣-کـردارى (گرتـن) ، کـه ڕەگەکـەى (گـر - gir)ە ، (ا)ەکـەى دەبـێـن بـە (ى - ا) . [٣٧٢]




٤-ئـەو کردارانـەى ڕەگـى کـاتى ڕانـەبوردوویان بـە دەنگـى (پ) یـان (ر) کۆتایى دێت بە سێ چەشن دەبینرێن :

---

-

"nan (nê) > niran" (ل ١٤٨) ... شایانی باسـه ، لـه کتێبـى "دیـالیکتى سـلێمانى زمـانى کوردى"دا ئەو هەڵەیەى ڕاست کردووەتـەوە و نیشـانى داوە ، کـه لـەو جـۆرە حاڵەتانـەدا "(ى) دەگۆڕێ بە (ا) " (ل١٠٤) .

[٣٧١] وا پێدەچێ ئەم کۆمەڵە کردارە (بران ، دران ، کران ، خران ، نران ... )و هـەندێکى دى ، کە دواتر کراونەتە نموونە ، (شـۆران ، کـوژران ، گـۆڕان ...) لەگـەڵ (بـران ... نـران ... شۆران ... گۆڕان ...)ى تێنەپەڕدا هاوبێژ (مشترك لفظى - Homonym )بن .

[٣٧٢] کردارى (گرتن) له حاڵەتى کارا بزربدا ئەو فۆرمەشى هەیە ، کـه بـه پـارێدەى ڕەگـى کاتى ڕابوردوو پێک دێ . وەک :

گرتن     گرت     گرتران
دەگرترێ
گرترا

[٣٧٣] بەڵاێک هات و پێی گیرا ، بە بابێک نووری کوژراوە
درێغا ! شەمسی عیرفان و چرای تاریکە ڕێگاکەم

(وەفایی ، ل ٧٨)

تەدارکی کاکە مەمی گیرا فوقەرە بە فوقەرە

(تحفە مظفریە ، ب١ ، ل ٢٤٦)

أ)ناخێوەری هەندێ ناوچە (د) دەخەنە نێوان ڕەگی کردارەکە و پاشگری (ـڕ)ی کارا بزرییەوە . وەك :

گێران - گێڕ + د + ڕ + (کۆتایی) - گێڕدران / دەگێڕدرێ / گێڕدرا

گۆڕین - گۆڕ + د + ڕ + (کۆتایی) - گۆڕدران / دەگۆڕدرێ / گۆڕدرا

هارین - هاڕ + د + ڕ + (کۆتایی) - هاڕدران / دەهاڕدرێ

بڕین - بڕ + د + ڕ + (کۆتایی) - هاڕدرا / بڕدران / دەبڕدرێ / بڕدرا

کڕین - کڕ + د + ڕ + (کۆتایی) - کڕدران / دەکڕدرێ / کڕدرا

... هتد . (۳۷۱)

ژماردن - ژمێر + د + ڕ + (کۆتایی) - دەژمێردرێ / ژماردرا

(۳۷۱) ئەمە هەر لە وشەی (بواردن)دا ، بەڵکو لە نموونەکانی دیشدا دەشێ بیر بۆ ئەوە بچێ ، کە ئەو (د)ەی نێوان ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو و پاشگری کارا بزرە لە دەرەوە نەهاتبێ ، بەڵکو کارا بزریی ئەم جۆرە حاڵەتانە لە ڕەگی کاتی ڕابوردووەوە سازدەبێ .

بژاردن – بژێر + د + ر + (کۆتایی) – دەبژێردرێ / بژێردرا

سپاردن – سپێر + د + ر + (کۆتایی) – دەسپێردرێ / سپێردرا

بووردن – بوور + د + ر + (کۆتایی) – دەبووردرێ / بووردرا

هتد ...[٣٧٥]

ب)لە هەندێ شێوەدا تەنیا یەك (ر) تەلەفوز دەکرێ و یەکێکیان تێدا دەچێ . وەك :

بڕین – بڕ + ر + (کۆتایی) – بڕا ...[٣٧٦]

دڕین – دڕ + ر + (کۆتایی) – دڕا ...

گۆڕین – گۆڕ + ر + (کۆتایی) – گۆڕا...

هتد ...

ژماردن – ژمێر + ر + (کۆتایی) – ژمێرا...

بژاردن – بژێر + ر + (کۆتایی) – بژێرا...

بوواردن – بوور + ر + (کۆتایی) – بوورا...

هتد ...

---

[٣٧٥] لە هەندێ ناوچە تەنانەت کـــرداری (کـــردن ، بـــردن)یـــش شـێوەی (کـــردرا ، بـــردرا) ، (دەکردرێ ، دەبردرێ) ... یان هەیە .

[٣٧٦] سەیر ئەکەی شەخسێکی مەئموور گەر وەزیفەی لێ بڕا
هیچی پێ ناکرێ لەبەر عەیب ، ماڵی خۆی تاڵان ئەکا

(پێکەس ، ل٨٨)

ج) لە ئاخاوتنی گەلێ شێوەدا (ـڕ)ی پاشگری کارا  ێزی بە ئاسانی بە دوا (ڕ)و (ر)ی کۆتایی ڕەگی کردارەکەدا دەردەبڕێ . بەوێنە :

بڕڕا

سڕا

گۆڕڕا

... هتد .[377]

ژمێررا[378]

بژێررا

بوورا

... هتد .[379]

٥-هەندێ کرداری وەك (بیستن ، فرۆشتن ، لێستنەوە ، پەستن ، ڕێستن...) لە حاڵەتی کارا بزریدا بە دوو جۆر دەبینرێن :

ا)دەنگی (ت)ی پێش (ن)ی چاوگ دەوترێ .

ب) بۆ مەبەستی سووك وتن ئەو (ت)ە فووت دەدرێ .

---

[377] کەرێك بە پارەی بەفر بکڕڕێ ئەبێ لە ئاوا بخنکێ .

(پەندی پێشینان ، ل ٢٤٤)

[378] جووجەڵە لە پاییزدا ئەژمێررێ

(پەندی پێشینان ، ل ١٦٢)

[379] ... ئەترسم ئەم جارەش بێ فائیدە بێ ، چونکە ئەمە سەری چەند جارەیە کە پیاو ئەنێررێت و بێ فائیدەیە .

(لە خەوما ، ل٦٢)

| -ا- | -ب- |
|---|---|
| بیسترا | بیسرا |
| فرۆشترا | فرۆشرا[٢٨٠] |
| لێسترایەوە | لێسرایەوە |
| پەسترا | پەسرا |
| ڕێسترا | ڕێسرا |
| ... هتد . | |

٦-ئەو چاوگانەی بە هۆی پاشگری (-اندن)ەوە کراون بە تێپەڕ لە دوو ڕێگەوە دەکرێن بە کارا بزر :

ا) ڕێگەی سەرەکی و باو بە پەیڕەوی کردنی دەستووره گشتییەکەیە ، کە دەخرێتە سەر بناغەی کاتی ڕانەبوردووی کردارەکە . وەك :

| تێنەپەڕ | تێپەڕ | ڕەگی ڕانەبوردوو | کارا بزر |
|---|---|---|---|
| ڕژان | ڕژاندن | ڕژێن | ڕژێنرا، دەڕژێنرێ ... |
| سووتان | سووتاندن | سووتێن | سووتێنرا ، دەسووتێنرێ... |
| لەرزین | لەرزاندن | لەرزێن | لەرزێنرا ، دەلەرزێنرێ ... |
| خەوتن | خەواندن | خەوێن | خەوێنرا ، دەخەوێنرێ ... |
| مردن | مراندن | مرێن | مرێنرا ، دەمرێنرێ ...[٢٨١] |
| ... هتد . | | | |

ب) لە هەندێ شێوەدا لەسەر بناغەی ڕەگی کاتی ڕابوردوو پێك دێنرێ .

وەك :

[٢٨٠] حاجی تووتەکەت ساغەم فرۆشرا
فیرووسیا لەمەد کوشتن و هەرا

(بێکەس ، ل٥٧)

[٢٨١] بۆ بەشی زۆری ئەم جۆرە وشانە ، لە هەندێ شوێن (د) دەخەنە نێوان ڕەگ و پاشگرەکەوە . واتە دەڵێن ، ڕژێندرا ، سووتێندرا ...

| تێنەپەڕ | تێپەڕ | ڕەگی ڕابردوو | کارا بزر | |
|---|---|---|---|---|
| ڕژان | ڕژاندن | ڕژاند | ڕژاندرا ... | |
| سووتان | سووتاندن | سووتاند | سووتاندرا ... | |
| لەرزان | لەرزاندن | لەرزاند | لەرزاندرا . . | |
| پەڕان | پەڕاندن | پەڕاند | پەڕاندرا .. | |
| خەوتن | خەواندن | خەواند | خەواندرا . . | |
| مران | مراندن | مراند | مراندرا ... | [٢٨٢] |
| ... هتد[٢٨٣] | | | | |

ئەگەرچی مەرج وایە لە باری کارا بزریدا کارا دیار نەبێ ، بەڵام لە زمانی کوردیدا حاڵەتی ئەوتۆ بەرچاو دەکەوێ ، کە بە ڕێگەی وەسفی ڕستەسازیدا پەنجە بۆ کارا ڕابکێشرێ :

١-بە یاریدەی دەستەواژەی وەك (لە لایەن ... ەوە ؛ لە ڕێگەی ... ەوە ؛ بە هۆی ... ەوە ... هتد ) . وەك :

ئازاد لە لایەن ئەوزادەوە نێرراوە .

ئازاد لە ڕێی ئەوزادەوە نێرراوە .

ئازاد بە هۆی ئەوزادەوە نێرراوە .

... هتد .

٢-بە یاریدەی پاشبەندی (بە ، لە ...) . وەك :

زەوی‌یەکە بە گاسن کێڵراوە .

[٢٨٢] لەو شێوانەشدا کە کلۆرکردن و فووت دان و سوان باوە ، (د)ی نێوان (ن)ی چاوگەکە و (-ر)ی کارا بزری لێدا دەبڕێ ، دەوترێ ، ڕژانرا ، سووتانرا ، لەرزانرا ، پەڕانرا ، خەوانرا ، مرانرا ....

[٢٨٣] شایانی باسە ، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد "ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی" (ل ١٥٢ - ١٤٥)و د. زاری یووسف "دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی" (ل ١٠٤ - ١٠٥)دا لە بەشێکی ئەو تایبەتێتی‌یانەی حاڵەتی کارا بزری دواون .

بەرەکە بە قۆچەقانی هاوێژراوە .

وڵات بە سەرباز دەپارێزرێ .

...

باج لە دەوڵەمەند دەستێنرێ .

زانیاری لە کتێب وەردەگیرێ .

... هتد .[٣٨٤]

لە ناوچەی هەورامان[٣٨٥] و هەندێ شوێنی دی کوردستان[٣٨٦] (-ی) پاشگری کارا بزرییە و (ا)ش نیشانەی کاتی ڕابوردوو و (ۆ)- ڕانەبوردووە . بۆ نموونە :

| | |
|---|---|
| دزیا = دز + ی + ا | واتە : دزرا = دز + ر + ا |
| دریا = در + ی + ا | واتە : دڕا = دڕ + ر + ا |
| ... | |
| مەدزیۆ = مە + دز + ی + ۆ | واتە : دەدزرێ = دە + دز + ر + ێ |
| مدریۆ / مەدریۆ = م / مە + در + ی + ۆ | واتە : دەدڕێ = دە + دڕ + ر + ێ[٣٨٧] |
| ... | |

... هتد[٣٨٨]

---

[٣٨٤] د. ئەوڵانی کوردۆ لە کتێبی "دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) " (ل ١٨٩)و د. زاری یووسف لە وتاری "کرداری کارا بزر لە زمانی کوردیدا" (ل ١٤٩)دا باسی هەندێ لەو حاڵەتانەیان کردووە .

[٣٨٥] محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراوردا ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٢١١ .

[٣٨٦] لە شیعرەکانی مەلا عەباس حیلمی کاکەیی و خەلیل مونەوەر و هەندێکی دیدا ، لەو بارەیەوە گەلێ نموونە بەرچاودەکەون .

[٣٨٧] سەرچاوەی ناوبراو ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی ل ٢١١ - ٢١٢ .

[٣٨٨] چەند نموونەیێک:

ئەو ڕۆ ڕەستاخێز پەی شیرین کریا

فرێ زوڵف و خاڵ بە غارەت دریا

(خانای قوبادی ، ل٩٦)

دەستووری سازبوونی حاڵەتی کارا بزربی کردار لە کرمانجیی خواروو و ژووروودا یەك ناگرنەوە . وەك باسمان کرد لە دیالێکتی خوارووودا پاشگری (ـر) کرۆکی پێکهێنانی ئەو حاڵەتیە و ئەمەش ڕێگەیێکە , وشەسازییە ، بەڵام لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا حاڵەتی کارا بزربی کردار بە هۆی کرداری تێنەپەڕی یاریدەدەری (هاتن)ەوە دەردەبڕدرێ ، کە هەمیشە دەکەوێتە پێش کردارە سەرەکییە تێپەڕەکەوە . کرداری (هاتن) گەردان دەکرێ . هەرچی کردارە سەرەکییەکەشە گەردان ناکرێ و لە شێوەی چاوگدا دەمێنێتەوە و بە سێ جۆر خۆی دەنوێنێ :

١-لە زۆربەی بەشە دیالێکتەکاندا هیچ نیشانەیێك وەرناگرێ . وەك :

هاتن گرتن

هاتن کوشتن

... هتد .

٢-لە هەندێ بەشە دیالێکتدا نیشانەی (ێ)ی دۆخی تیان وەردەگرێ . وەك :

هاتن گرتنێ

هاتن کوشتنێ

... هتد .

٣-لە چەند شێوەیەکدا (ە) لە بریتی (ێ) بەکاردێنرێ .وەك :

هاتن گرتنە

هاتن کوشتنە

... هتد .

ئەم جۆرە دەربڕینەی کارا بزری لە زمانناسیدا بە ڕێگەی ڕستەسازی ناسراوە .

لە گەردان کردنی فۆرمی کارا بزری‌دا کرداری یاریدەدەری (هاتن) بۆ ئەوەی پێوەندی بە خاسیەتی کردارە سەرکی‌یەکەوە هەبێ ، گۆڕانی بەسەردا دێ و لە ڕووی ژمارە و کەس و کاتەوە لەگەڵ نیهاددا هاوجووت دەبێ - واتە کرداری کارا بزر (سست) لە ڕووی فۆرمەوە ، گەردانی چالاکە:[٢٨٩]

## کاتی ڕابوردوو







(٢٨٩) ق. کوردۆیێف ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووی) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل٢٥٤-٢٥٥ .

(٣٦٠) ئەو ئەسپێ هات کوشتن ، ئێدی فەنەکەرییا ل مالا خوە و خودیانە .

(مەمێ ئالان ، ل٤٤)







(٣٩١) ئەڤ چەند چیرۆکێن کەڤن ، مە ، ژ بیر و کاڵێن خوە وەرگرتینە نە ئەڤ چیرۆک ئێن ژ مەرا ، هاتنە گۆتن ...

(خالید حسەین ، ل٢)

# کاتی ڕانەبوردوو

**کاتی ئێستا.**

| | | |
|---|---|---|
| ئەز | تێم | گرتن / گرتنێ ... |
| تو | تێیی | |
| ئەو | تێ | |
| ئەم | | |
| هوون | تێن | |
| ئەو | | |

**کاتی ئاینده :**

| | | | |
|---|---|---|---|
| | ئەزێ | بێم[392] | گرتن / گرتنێ ... |
| | توێ | بێیی | |
| | ئەوێ | بێ[393] | |
| جۆرە یەکەم | ئەمێ | | |
| | هوونێ | بێن | |
| | ئەوێ | | |

[392] کەسەک من ناسناکە نافێ تێکا لەدا ،
ئەز بێمە کوشتن ، نابە کەسەر دلدا
(سیاپەند و خەجێ ، ل٤٨)

[393] وەکی سیاپەند بێ کوشتن ، نەکەدمرە .
(سیاپەند و خەجێ ، ل٥٠)

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | ئەزێ | | بێم | |
| | تویێ | | بێ‌یی | |
| | ئەوێ | | بێ | |
| جۆری دووەم | ئەمێ | وێ | | گرتن / گرتنێ ... |
| | هوونێ | بێن | | |
| | ئەوێ | | | |

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە یاریدەی هەندێ دەستەواژە یان ئامراز دەکرێ پەنجە بۆ کارا رابکێشرێ . ب (بە ، وە) دەستێ : ب (بە ، وە) کۆمەکیا ... کەرەستەی ئەم رێگە وەسفی رستەسازیێمن . بەوێنە :

ڤان دارانا گشك ب دەستێ شاگرتا هاتنە چەقاندنێ .

باخچێ زارا ب کۆمەکیا سۆڤخوزێ تێ خوەیکرنێ .[394]

[394] ج . خ . باکایێڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل٢١١ .

# نیشانەی نموونەکان

١- (ئەدەب)

مێژووی ئەدەبی کوردی ، عەلائەددین سەجادی ، بەغدا ، ١٩٥٢ .

٢-(ئەسیری)

دیوانی ئەسیری ، مستەفا عەسکەری کۆی کردۆتەوە و لەسەری نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

٣-(بێکەس)

دیوانی بێکەس ، محەمەدی مەلا کەریم رێکی‌خستووە و سەرەتای بۆ نووسیوە و سەرپەرشتیی لە چاپدانی کردووە ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٤-(پەرتووین هەکاری)

دیوانا پەرتووین هەکاری ، بەرهەڤکرن و توێژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٥-(پەندی پێشینان)

پەندی پێشینان ، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خال ، چاپی دووەم ، ١٩٧١ .

٦-(پیرەمێرد)

پیرەمێردی نەمر ، محەمەد رەسووڵ هاوار ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

٧-(تحفەء مظفریە ، ب١)

ئۆسکارمان ، تحفەء مظفریە ، بەرلین ، ١٩٠٥ ، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر رێنووسی کوردی : هێمن موکریانی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٨-(جزیری)

دیوانا مەلایێ جزیری ، تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٩-(خالید حسەین)

چەند چیرۆك ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

١٠-(خانای قوبادی)

شیرین و خوسرەو ، شاکاری شاعیری ناوداری کورد : خانای قوبادی . محەمەدی مەلا کەریم ساغی کردووەتەوە و فەرهەنگی بۆ رێك خستووە و پێشەکی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

١١-(سیابەند و خەجێ)

سیابەندۆف سەمەند ، سیابەند و خەجێ (شوکور مستەفا لە رێنووسی سلاڤییەوە خستوویەتیە سەر رێنووسی کوردی و فەرهەنگۆکی بۆ کردووە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

١٢-(صەبری)

عوسمان صەبری ، باهۆز و چەند ئەڵیسارێن دی ، شام ، ١٩٥٦ .

١٣-(صەیدی)

دیوانی صەیدی ، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی : محەمەد ئەمین کاردۆخی ، سلێمانی ، ١٩٧١ .

١٤-(فۆلکلۆر)

فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری ، کۆکردنەوەی محەمەد کەریم شەریف ، کەرکووك ، ١٩٧٤ .

١٥-(کوردۆ)

کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی ، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە زاری کوردەکانی سۆڤێتەوە تۆماری کردووە . شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر رێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

١٦-(کوردی)

دیوانی کوردی ، چاپی سێیەم ، لەسەر ئەرکی چاپخانەی کوردستان گرد و کۆ و چاپکراوە ، هەولێر ، ١٩٧٣ .

١٧-(گۆران)

سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەکەم ، دیوانی گۆران ، محەمەدی مەلا کەریم کۆی کردووەتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

١٨-(لە خەوما)

جەمیل صائب ، لە خەوما ، پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی جەمال بابان ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

١٩-(مەحوی)

دیوانی مەحوی ، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و محەمەدی مەلا کەریم ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٢٠-(مەمن ئالان)

مەمن ئالان ، چیرۆك نڤیس کۆی کردووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە ، صالح عەلی گوللی و ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕێنووسی لاتینییەوە هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٢١-(میرزا ئۆلقادر)

میرزا ئۆلقادر ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

٢٢-(نالی)

دیوانی نالی ، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٢٣-(هەردی)

ڕازی تەنیایی ، ئەحمەد هەردی ، چاپی دووەم ، ١٩٨٤ .

٢٤-(وەفایی)

دیوانی وەفایی ، لێکۆڵینەوەی : محەمەد عەلی قەرەداغی ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

# سەرچاوە

## بە زمانی کوردی

(١)ئەحمەد تاقانە ، لقە کۆمەڵە چاوگی (ست)یی ، گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان" ، ژ٤٩ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل٥٩ - ٦٢ .

(٢)ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، پێشگر و پاشگر ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب ٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل٣١٩ - ٣٥٧ .

(٣)ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٤)د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕابەری سەرچاوە لەبارەی زمانی کوردییەوە ، بەغدا ، ١٩٨٩ .

(٥)د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم - (ناو) ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

(٦) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی دووەم - (جێناو) ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

(٧)د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی سێیەم - (ئاوەڵناو) ، بەغدا ، ١٩٩٢ .

(٨)د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی چوارەم - (ژمارە و ئاوەڵکردار) ، بەغدا ، ١٩٩٨ .

(٩)د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٠)د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

(١١)د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(١٢)د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نووسان و پێکەوە نەنووسانەوە ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد ، ب٩ ، بەغدا ١٩٨٢ ، ل٤٥٠ - ٤٨٨ .

(١٣)بەهزاد ، چاوگی کوێرەووەوە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "بەیان" ، ژ٧ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل٢٤ - ٢٥ .

(١٤)د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، بووژاندنەوەی زمان ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب٣ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل١٤٣ - ١٩٧ .

(١٥)تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .

(١٦)جگەر خوێن ، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ .

(١٧)د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .

(١٨)حەمیدی ئیزەد پەناه ، فەرهەنگی لەك و لوڕ (لێدوان و بەراوردکردنی : مەحموود زامدار) ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

(١٩)ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، بەسەردا چوونەوەی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ٢٣ ، ساڵی دووەم ، هەولێر ، ئابی ، ١٩٨٤ ، ل ٢٣ - ٣٥ .

(٢٠)ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، دیاردەیێکی زمانەوانی ، گۆڤاری "نووسەری کورد" ، ژ٨ ، خولی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل٣٦ - ٤١ .

(٢١)ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، کاری هەبوون ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ٢٩ ، شوباتی ١٩٨٥ ، ل ١٥ -٢١ .

(٢٢)ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨١ .

(٢٣)ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، گەردانی (بوون) ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ ٨٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل١٢ - ١٥ .

(٢٤)ڕەفیق محەمەد شوانی ، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن ، نامەی ماجیستێر ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٨ .

(٢٥)ڕەفیق محەمەد شوانی ، لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ١٢٣ ، ئەیلوول ١٩٨٩ ، ل٧١-٨٣ .

(٢٦)ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٧)زاراوە زانستییەکان ، دانان و لێکۆڵینەوەی لیژنەی زاراوە زانستییەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢٨)د. زارێ یووسف ، ڕەگی فرمان لە دیالێکتی هەورامیدا ، "چەند وتارێکی کوردناسی" ، ستۆکهۆلم ، ١٩٨٩ ، ل٢٧ - ٣٤ (د. ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی) .

(٢٩)د. زارێ یووسف ، کار ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ١١٦ ، بەغدا ، ١٩٨٨ ، ل٧١ - ٩٢ (د. کوردستانی موکریانی لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی) .

(٣٠)د. زارێ یووسف ، گرووپەکانی کردار لە دیالێکتی سلێمانیدا ، گۆڤاری "ئاسۆی زانکۆیی" ، ژ٣ ، ساڵی ١ ، کانوونی یەکەمی ١٩٧٧ ، ل ٨٦ - ٨٩ (د. کوردستانی موکریانی لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی) .

(٣١)سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .
(٣٢)شێخ محەمەدی خاڵ ، پێشگر و پاشگر ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب٢ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٥٦ - ٢٧٩ .
(٣٣) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(٣٤)صادق بەهائەدین ئامێدی ، زمانێ کوردی ، گۆڤاری "پێشی کوردستان" ، ژ٥-٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل٤٩-٥١ .
(٣٥)صالح حسێن حەسەن پشدەری ، کورتەیێك لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ .
(٣٦)عوسمان خەزنەیی ، کاتەکانی فرمانی ڕابوردوو لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "بەرەو ڕووناکی" ، ژ٣ ، هەولێر ، ١٩٧٣ ، ل٣٠-٣١ .
(٣٧)عومەر دزەیی ، بەراوردکردنێکی (ڕابوردووی تەواو)ی کوردی لەگەڵ (Perfect)ی زمانە ئەوروپاییەکان ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ٢٤ ، ئەیلوولی ١٩٨٤ ، ل٥-٨ .
(٣٨)عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قاموسی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٧ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ .
(٣٩)عەبدوللا شالی ، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(٤٠)عەبدوللا شالی ، ناوی بکەر (الفاعل) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "پەروەردە و زانست" ، ژ١٥ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٥-٧ .
(٤١)عەبدوللا شالی ، (ە)ی سواو ، گۆڤاری "پەروەردە و زانست" ، بەشی یەکەم ، ژ ١٢ ، سالی ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣-٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ١٣ ، سالی ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل١٤ - ١٩ .
(٤٢)عەبدوللا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سەعدی ، زمان و ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی

یەکەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ، بەغدا ١٩٧٦ ؛ بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٤٣)د. عەبدوڵڵا نەقشبەندی ، پاشکۆی (ـرا) ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٥ - ١٣١ .

(٤٤)د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی ، بەغدا ، ١٩٨٤ (د. کوردستانی موکریانی لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی ) .

(٤٥) د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی ، چاپی یەکەم ، یەریڤان ، ١٩٤٩ .

(٤٦)د. قەناتی کوردۆ ، زمانی کوردی ، چاپی چوارەم ، یەریڤان ، ١٩٧٠ .

(٤٧)د. قەناتی کوردۆ ، زمانی کوردی ، فرانکفۆرد ، ١٩٨١ .

(٤٨)د. کوردستانی موکریانی ، چۆنیەتی نووسینی چاوگەی نسادە ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد" ، ب٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٨٦ - ٢١١ .

(٤٩)د. کوردستانی موکریانی ، سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

(٥٠)لیژنەی دەستووری زمانی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد ، هەندێ لە بابەتە کێشەدارەکان لە ڕێزمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

(٥١)لیژنەی زمانی کوردی ، بەراوردکاریی لە نێوان زارە کوردییەکاندا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد" ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٧٧ - ٣٣٧ .

(٥٢)محەمەد ئەمین هەورامانی ، بەراوردێکی سەرپێیی نێوان زمانی ئاڤێستا و زمانی ئەمڕۆی کوردی ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ٥٥ ، هەولێر ، ١٩٨٧ ، ل ٢٤ – ٣١ .

(٥٣)محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ .

(٥٤)محەمەد ئەمین هەورامانی (سۆکۆلۆڤ ، زمانی ئاوێستا – وەرگێڕان و لێدوان و بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی کوردیی ئەمڕۆدا) ، بەغدا ، ١٩٨٨ .

(٥٥)محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

(٥٦)محەمەد ئەمین هەورامانی ، فەرهەنگی ئێریان ڤاچ ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

(٥٧)محەمەد ئەمین هەورامانی ، (کە) لە زمانی یەککگرتووی ئەدەبیی کوردیدا ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ١٣ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ١٩ – ٢٨ .

(٥٨)محەمەد مەعرووف فەتتاح ، کارپۆلێن کردن بەپێی ڕۆنان ، گۆڤاری "ڕۆشبیری نوێ" ، ژ ١٢١ ، ١٩٨٩ ، ل ٤٠ – ٥٩ .

(٥٩) مەسعوود محەمەد ، بەسەرداچوونەوە ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ١٣٥ – ١٧٦ .

(٦٠)مەسعوود محەمەد ، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ – ١١٤ .

(٦١)مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٦٢)مەسعوود محەمەد ، لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشکی چەند چرایەك ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ٢٠ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ١٧ – ٢٥ .

(٦٣)مەسعوود محەمەد ، هەڵدانەوەی چەند پووپەرەیێکی زمانی کوردی ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٦٤ – ٣١١ .

(٦٤)د. نەسرین فەخری ، پاشگری (–اندن) لە زمانی کوردیدا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، ب٢ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ – ٢٤٣ .

(٦٥)د. نەسرین فەخری ، (ڤە) یان (وە/ ەوە) لە زمانی کوردیدا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد" ، بەغدا ، ب١ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ . ل ٢٣٤ – ٢٧٢ .

(٦٦)د. نەسرین فەخری ، چاوگی بێ واتا لە زمانی کوردیدا ، نەجەف ، ١٩٧٢ .

(٦٧)د. نەسرین فەخری و د. کوردستانی موکریانی ، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٢ .

(٦٨)نووری عەلی ئەمین ، چاوگی "بوون" و "هەبوون" لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، ژ١٠٩ ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ٢٢٩ – ٢٥٦ .

(٦٩)نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

(٧٠)نووری عەلی ئەمین ، شێوازی ئەرێ و نەرێ لە ئاخاوتنی کوردیدا ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد" ، ب١٤ ، بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل١٣٩ – ١٨١ .

(٧١)نووری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

(٧٢)نووری عەلی ئەمین ، قەواعیدی زمانی کوردی (لە صرف و نەحو)دا ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٥٦ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

(٧٣)نووری عەلی ئەمین ، نیشانەکانی ڕێژەی فرمان ، گۆڤاری "ڕۆشنبیری نوێ" ، بەشی یەکەم ، ژ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل٥٠ – ٥٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ١٠٧ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل٢٠١ –٢١٥ .

(٧٤) وريا عومەر ئەمين ، تينەپەڕ فرمانيكى بكەر ناديارە ، گۆڤارى "ڕوشنبيرى نوێ" ، ژ١٠٧ ، ئەيلوولى ١٩٨٥ ، ل ١٩٦-٢٠٠ .
(٧٥) وريا عومەر ئەمين ، ڕستەی بكەر ناديار ، گۆڤارى "ڕۆشنبيرى نوێ" ، ژ٩٥ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٤-٣٥ .
(٧٦) وريا عومەر ئەمين ، كات و ڕەگى فرمان ، گۆڤارى "ڕۆژى كوردستان" ، ژ٦٥ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٧٨ - ٨٢ .
(٧٧) وريا عومەر ئەمين ، ياساييكى فۆنۆلۆجى ، گۆڤارى "ڕۆژى كوردستان" ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٥١-٥٢ .
(٧٨)هەژار ، هەنبانە بۆرينە (فرهنگ كردى فارسى) ، تاران ، ١٣٦٩ .

## بەزمانی فارسی

(٧٩)دكتر ابراهيم پور ، دستور زبان كردى ، تهران ؟
(٨٠)دكتر پرويز ناتل خانلرى ، تاريخ زبان فارسى ، جلد اول ، ١٣٥٤ ؛ جلد دوم ، ١٣٥٤ ؛ جلد سوم ، ١٣٥٤ .
(٨١)ذو النور ، دستور پارسى در صرف و نحو و املاى فارسى ، تهران ، ١٣٤٣ .
(٨٢)سيد كمال طالقانى ، دستورزبان فارسى ، چاپ ششم ، ١٣٥١ .
(٨٣)على برناك ، دستور زبان فارسى ، ١٣٤٧ .
(٨٤)محمد صديق مفتى زاده ، درس زبان كردى ، جزوه ١-٢ ، تهران ، ٢٥٣٦ .
(٨٥)محمد كيوان پور ، نامهاى پرندگان در لهجههاى كردى ، تهران ، ١٣٢٦ .

## به زمانی عەرەبی

(٨٦)الدكتور ابراهيم انيس ، من اسرار اللغة ، الطبعة الرابعة ، القاهرة ، ١٩٧٢ .

(٨٧)الدكتور ابراهيم السامرائي ، فقه اللغة المقارن ، بيروت ، ١٩٦٨ .

(٨٨)الدكتور ابراهيم السامرائي ، مباحث لغوية ، النجف ، ١٩٧١ .

(٨٩)توفيق وهبي ، اصل الاكراد و لغتهم ، "مجله المجمع العلمي الكردي" ، المجلد ٢ ، العدد ٢ ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ص ١-٢٤ .

(٩٠)توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، الباب الثاني ، بيروت ، ١٩٥٦ .

(٩١)توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول (الف باء) ، مجموعة من المحاضرات التي القيت في نادى الارتقاء الكردى ببغداد في سنة ١٩٥٥ - ١٩٥٦ ، بغدا ، ١٩٥٦ .

(٩٢)زبير بلال اسماعيل ، تأريخ اللغة الكردية ، بغداد ، ١٩٧٧ .

(٩٣)صلاح سعدالله ، حول اللغة الكردية ، بغداد ، ١٩٨٥ .

(٩٤)عبدالباقي الصافي ، دراسة و مقارنة للكلمة و علم الصرف في اللغتين العربية و الانكليزية ، مستل من مجلة كلية الاداب جامعة البصرة ، العددان ٤ و ٥ .

(٩٥)عبدالهادى مطر ، دراسات في قواعد اللغة العربية ، الجزء ١-٣ ، النجف ، ١٣٨٥ هـ.

(٩٦)الدكتور عبده الراجحي ، التطبيق الصرفي ، بيروت ، ١٩٧٩ .

(٩٧)الدكتور علي عبدالواحد وافي ، علم اللغة ، الطبعة السابعة ، القاهرة ، ١٩٧٢ .

(٩٨)فتحية توفيق صلاح ، التيسير فى النحو والصرف ، عمان ، ١٩٧٨ .

(٩٩)الدكتورة كوردستان موكرياني ، قواعد اللغة الكردية ، بغداد ، ١٩٩٠ .

(١٠٠)محمد التقى الحسيني الجلالى ، نزهة الطرف فى علم الصرف ، النجف ، ١٩٧٧ .

(١٠١)محمد سعيد عبدالرحمن ، قواعد اللغة العربية فى النحو و الصرف ، بغداد ، ١٩٧٠ .

(١٠٢)مسعود محمد ، لسان الكرد ، بغداد ، ١٩٨٧ .

(١٠٣)ميريللا غاليتي ، التراث الكردي فى مؤلفات الايطاليين ، "گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد" ، ب٨ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٢٢٥-٣٠٠ (ئەم بەرهەمە د. یووسف حبی لە زمانی ئیتالییەوە کردوویە بە کوردی) .

## بە زمانی ڕووسی

(١٠٤)ئۆ. س. ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

(١٠٥)یو. یو. ئاڤالیانی ، جۆرەکانی واتای کرداری ڕابوردووی نزیك لە زمانە ئێرانییەکاندا (بە کەرەستەی زمانی کوردی) ، "کارەکانی زانکۆی ئوزبەکستان" ، ١٩٥٦ ، ب ٦٢ ، ل ١٣٢- ١٤١ .

(١٠٦)یو. یو. ئاڤالیانی ، دابەش کردنی کرداری ناسادە و کێشەی تێپەڕاندن و تێنەپەڕاندن لە کرمانجیدا ، کتێبی "کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی" ، لینینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٣-٥ .

(١٠٧)یو. یو. ئاڤالیانی ، دەستووری ڕێـژەی کـردار لـە زمـانی کوردیـدا (دیـالێکتی کرمـانجیی خـواروو) ، "کورتـەی وتارەکـانی کۆنفرانسـی ڕۆژهەڵاتناسان" ، باکۆ ، ١٩٦٣ ، ل٦-٧ .

(١٠٨)یو. یو. ئاڤالیانی ، کرداری ناسادە لـە زمـانی کوردیـدا ، گۆڤـاری "کارەکانی زانکۆی ئوزبەکستان" ، ب٩٥ ، ١٩٥٩ ، ل١٢٧ - ١٥٠ .

(١٠٩)یو. یـو. ئاڤالیـانی ، کـرداری ناسـادە و کێشـەی کـرداری تێپەڕ و تێنەپەڕ لـە زمـانی کوردیـدا ، "کورتـەی وتارەکـانی کۆنفرانسـی فیلۆلۆژیـی ئێرانی" ، لینینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٣-٥ .

(١١٠)یـو. یـو. ئاڤالیـانی ، کێشـەی جیاکردنـەوەی کـرداری لێکـدراو و ئیدیۆمـی کـرداری (بـە کەرەسـتەی زمـانی کـوردی) ، گۆڤـاری "کورتـەی دەنگوباسی زانکۆی سەمەرقەند" ، سەمەرقەند ، ١٩٥٨ ، ل٤٠-٤٣ .

(١١١)یو. یو. ئاڤالیانی ، لەبارەی جۆرەکانی واتـای کـرداری ڕابوردووی بەردەوامەوە لە زمانە ئێرانییەکاندا (بە کەرەستەی زمانی کوردی) ، "کارەکانی زانکۆی ئوزبەکستان" ، ١٩٥٩ ، ب٦٠ ، ل ٧٩-٩٠ .

(١١٢)یـو. یـو. ئاڤالیـانی ، لـەبارەی هـەندێ ڕێگـەی گەشـەکردنی ڕۆنـانی کـردارەوە لـە دیـالێکتی ژووروی زمـانی کوردیـدا ، "ئیدیـۆم و شـێواز و پێکـهاتنی ڕێزمـانیی زمانـە ڕۆژهەڵاتیـیەکان" ، سـەمەرقەند ، ١٩٧٢ ، ل٢٨-٤٠ .

(١١٣)ك. پ. ئەیووبی و ئـی. ئـا. سمیرنۆڤا ، دیـالێکتی کـوردی موکـری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ .

(١١٤)ئی. م. ئۆرانسکی ، زمانە ئێرانییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .

(١١٥)د. ن. ئوشـاکۆڤ ، فەرهـەنگی زمـانی ڕووسـی ، مۆسـکۆ ، بـەرگی یەکـەم ، ١٩٣٥ ؛ بـەرگی دووەم ، ١٩٣٨ ؛ بـەرگی سـێیەم ، ١٩٣٩ ؛ بـەرگی چوارەم ١٩٤٠ .

(١١٦)ع. خ. باکاییڤ ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢

(١١٧)ع. خ. باکاییڤ ، زمانی کوردەکانی ئازەربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

(١١٨)ع. خ. باکاییڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .

(١١٩)ع. خ. باکاییڤ ، لەبارەی کێشەی گەردانی سوبیەکت و ئۆبیەکتی کرداری تێپەڕەوە لە زمانی کوردیدا ، "کێشەی زمانەوانی" ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ژ ٤ ، ل ١٠٣ - ١٠٦

(١٢٠)س. ف. برۆملیی ، ل. ن. بووڵانۆڤا ، دەربارەی وشەسازیی بەشە دیالێکتەکانی زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ .

(١٢١)ل. بلومفیلد ، زمان (تەرجومەی ڕووسی) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ .

(١٢٢)پ. ئا. بوداگۆڤ ، مرۆڤ و زمانی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ .

(١٢٣)ف. م. بیریزین ، ب ن. گۆڵۆڤین ، زمانناسیی گشتی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ .

(١٢٤)ت. ن. پاخالینا ، زمانە پامیرییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ .

(١٢٥)ن. س. پۆسپێلۆڤ ، پێوەندیی نێوان حاڵاتی ڕێزمانی و بەشەکانی ئاخاوتن ، کتێبی "کێشەی پێکهاتنی ڕێزمانی" ، ، مۆسکۆ ، ١٩٥٥ ، ل ١٦١ - ١٨٥ .

(١٢٦)م. ن. پیتەرسۆن ، لەبارەی بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی ڕووسییەوە ، کتێبی "کێشەی پێکهاتنی ڕێزمانی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٥ ، ل٦١ - ٨٨ .

(١٢٧)ل. ئا. پیرێنکۆ ، بەراوردکردنی تایبەتێتی کرداری ڕابوردووی تێپەڕ لە زمانی کوردی و تالیشی دا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦ (کورتەی نامەی دوکتۆری)

(١٢٨)ئا. م. پیشکۆڤسکی ، ڕستەسازیی ڕووسی لەبەر ڕووناکیی زانستدا . چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦ .

(١٢٩)پ. ل. تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی وشەسازیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

(١٣٠)ئی. ئی. تسوکەرمان ، دیاریکردنی واتای کردای تێپەڕ لە زمانی کوردیدا ، "گۆڤاری فەلەستین" ، ب١١ ، ژ٧٤ ، مۆسکۆ - لینینگراد ، ١٩٦٤ ، ل٣٩ - ٤٤ .

(١٣١)ئی. ئی. تسوکەرمان ، ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ .

(١٣٢)ئی. ئی. تسوکەرمان ، لەبارەی یەکێتی ڕەگەزی نیشانەی کرداری کاتی ئێستا و حاڵەتی حازرەوە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروی زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "کێشەی ڕۆژهەڵاتناسی" ، ١٩٥٩ ، ب٢ ، ل١٤٨ -١٥٥ .

(١٣٣)ئی. ئی. تسوکەرمان ، هاوڕەگەزایەتیی نیشانەی کاتی ئابندە و نیشانەی حاڵەتی غائیب لە زمانی کوردی (کرمانجی)دا ، "کێشەی ڕۆژهەڵاتناسی" ، ١٩٥٩ ، ژ٢ ، ل١٤٨ - ١٥٥ .

(١٣٤)ئا. س. چیکۆباڤا ، سەرەتاییکی زمانناسی ، بەرگی یەکەم ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٥٣ .

(١٣٥)ن. ئا. دڤۆریانکۆف ، زمانی پشتۆ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(١٣٦)م. دۆکوولیل ، کێشەی حاڵەتەکانی وشەسازی ، گۆڤاری "کێشەی زمانناسی" ، ژ٦ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(١٣٧)ئا. ف. دیسنیسکایا ، کێشەی لێکۆڵینەوەی خزمایەتیی زمانە هیند و ئەورووپاییەکان ، مۆسکۆ - لینینگراد ، ١٩٥٥ .

(١٣٨)ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسیی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

(١٣٩)ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(١٤٠)د. زاریێ یووسف ، دیالێکتی سلێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨ .

(١٤١)د. زاریێ یووسف ، کردار کارا بزر له زمانی کوردیدا (به کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی خواروو) ، "نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات" ، لینینگراد ، ١٩٧٣ ، ل ١٤٧ - ١٥٠ .

(١٤٢)د. زاریێ یووسف ، گرووپەکانی کردار له بەشە دیالێکتی سلێمانیدا ، "نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات" ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ل ٢٧٥ - ٢٧٩ .

(١٤٣)گ. ئا. زۆگراف ، کرداری تێپەڕ وەك حالەتێکی وشەسازیی له زمانە هیند و ئەورووپاییە نوێکاندا ، "نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆهەلات" ، لینینگراد ، ١٩٧٣ ، ل١٢٧ - ١٣٠ .

(١٤٤)ێ. ئا. زیمسکایا ، وشە چۆن سازدەبێ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .

(١٤٥)ئا. م. زیمسکی ، س. ێ. کریوچکۆف ، م. ف. شفێتلاینیف ، زمانی ڕووسی ، بەرگی یەکەم ، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

(١٤٦)ف. ئا. ژالێکینسیێف ، زمان و تیۆریی زمانناسی ، مۆکسو ، ١٩٧٣ .

(١٤٧)ئا. ئی. سامیرنیتسکی ، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ .

(١٤٨)یو. س. ستیپانۆف ، بنەماکانی زمانناسیی گشتی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ .

(١٤٩)ئی. ئا. سمیرنۆفا ، پێوەندیی بنەماکانی کردار له زمانی کوردیدا (دیالێکتی سۆرانی) ، "کورتەی هەواڵەکانی ئامۆژگای میللەتانی ئاسیا" ، ژ ٦٧ ، ١٩٦٣ ، ل ٣٨ - ٤٠ .

(١٥٠)ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، گەردانی کردای تێپەڕ لە دیالێکتی خوارووی کوردی (سۆرانی)دا ، کتێبی "کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی" ، لینینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٢٣– ٢٤ .

(١٥١)س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١

(١٥٢)ل. ڤ. شێربا ، بەشەکانی ئاخاوتن لە زمانی ڕووسیدا ، کارە هەڵبژاردەکانی دەربارەی زمانی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل٢١٣ – ٢٤٢ .

(١٥٣)ڤ. ئا. فرۆلۆڤا ، زمانی بلووجی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(١٥٤)ن. س. ڤاڵگینا ، د. ئێ. ڕۆزێنتاڵ ، م. ئی. فۆمینا ، ڤ. ڤ. تساپکینێلیچ ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ .

(١٥٥)ڤ. ڤ. ڤینۆگرادۆف ، زمانی ڕووسیی ، مۆسکۆ - لینینگراد ، ١٩٤٧ .

(١٥٦)ڤ. ڤ. ڤینۆگرادۆف ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ (وشەسازی) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ .

(١٥٧)ک. س. کاچکینا ، کێشەی واتای مۆرفیم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(١٥٨)ڤ. ئی. کۆدزخۆف ، سەرەتایێکی زمانناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ .

(١٥٩)ق. کوردۆ (کوردۆیێڤ) ، دوو بنچینەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، "کورتەی دەنگوباسی ئامۆزگای ڕۆژهەڵاتناسی" ، ١٩٥٩ ، ب ٢٩ .

(١٦٠)ق. کوردۆ (کوردۆیێڤ) ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

(١٦١)ق. کوردۆ (کوردۆیێڤ) ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

(١٦٢)ق. کوردۆ (کوردۆیێف) ، ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، "ڕێزمان و مێژووی زمانەکانی ڕۆژهەلات" ، لێنینگراد ، ١٩٥٨ ، ل ١٠٩ -١٤٢ .

(١٦٣)ق. کوردۆ (کوردۆیێف) ، زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .

(١٦٤)ق. کوردۆ (کوردۆیێف) ، گەردانی تۆبێکتی و سوبێکتی کرداری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(١٦٥)ق. کوردۆ (کوردۆیێف) ، گەردانی کرداری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری "وتاری نوێنەرانی سۆڤێت لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی ڕۆژهەلاتناسیدا" ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(١٦٦)ق. کوردۆ (کوردۆیێف) ، مانا و دەوری ڕێزمانیی کرداری (چوون) لە زمانی کوردیدا ، "نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات" ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ ، ل١٣٨ - ١٤١ .

(١٦٧)ئی. ئۆ. کۆستیتسکایا ، ڤ. ئی. کارداشێڤسکی ، ڕێزمانی فەرەنسی ، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .

(١٦٨)ئا. ل. گریونبێرگ ، لەبارەی ڕێزمانی ئەفغانییەوە (پشتۆ) ، لێنینگراد ، ١٩٨٧ .

(١٦٩)ئا. ن. گڤۆزدێف ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(١٧٠)ئا. ئی. گولانۆڤ ، وشەسازیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

(١٧١)ب. ن. گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .

(١٧٢)ن. م. لیمپیل ، زمانی لاتینی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

(١٧٣)ئا. مابیە ، شێوازی بەراوردکاری لە زمانناسیی مێژووییدا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٤ .

(١٧٤)د. مەکسیمی خەمۆ ، زمانی کوردەکانی باد بنانی کوردستانی عێراق ، کتێبی "ولاتان و میللەتانی ڕۆژهەلاتی نیزیك و ناوەڕاست" ، ب٧ ، یەریڤان ، ١٩٧٥ ، ل٢٧٣ – ٢٨٢ .

(١٧٥)ف. ن. یارخۆ ، ف. ئی. لۆبۆدی ، زمانی لاتینی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ .

### بە زمانە ڕۆژئاواییەکان

(176)H. W. Bailey , The Persian Language , - "The Legacy of Persia" , ed by A. J. Arberry , Oxford , 1953 .

(177)C. E. Bazel , Linguistic typology , London , 1958 .

(178)C. E. Bazel , Meaning of the morpheme "Word" , V.18 , 1962 , No. 1-2 .

(179)Bedir – Khan Kamuran , Languga Kurda , Paris , 1964 .

(180)G. O. Curme , A Grammar of English Language , London , N.-Y, 1931 .

(181)C. J. Edmonds , Prepositions and Personal Affixes in Southern Kurdish . – BSOAS , 1955 , Vol.17 , pt.3 .

(182)Ernest N. Maccarus , A Kurdish Grammar , New – York , 1958 .

(183)J. R. Firth , Papers in Linguistics (Oxford University Press , 1957) .

(184)H. A. Gleason , Linguistics and English Grammar , New – York , 1966 .

(185)M. P. Garzoni , Grammatca e vocabolario della Lingua Kurda , Roma , Socra Congregazione di Propogande Fide , 1787 .

(186)Z. Harris , From Morpheme to Utterance , USA , 1946 .

(187)C. F. Hockett , A course in modern Linguistics , New – York , 1958 .

(188)James Sledd , A Short Introduction to English Grammar , Chicago , 1959 .

(189)R. F. Jardine , Bahdinan Kurmanji , a grammar of the Kurmanji of the Kurds of Mousul division and surtounding districts of Kurdistan , Baghdad , Govermant Press , 1922 .

(190)Joyce Blau , Manuel De Kurde , Paris , 1980 .

(191)F. Justi , Kurdishe Grammatik , S. – pb , 1880 .

(192)D. N. Mackenzie , Kurdish , Dialect Studies , London , 1957 .

(193)D. N. Mackenzie ,Kurdish Dialects Studies , London , 1961 .

(194)J. C. Nesfield , English Grammar , Past and Present , London , 1931 .

(195)Norman C. Stageberg , An Introductory English Grammar , New – York , 1965 .

(196)H. E. palmer , A Grammar of Spoken English (W. Heffer and Sons Ltd , Cambridge , 1950) .

(197)Paul Roberts , Patterns of English , New – York , 1956 .

(198)E. B. Soane , Elemantary Kurmanji Grammar , Baghdad , 1919 .

(199)E. B. Soane , Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language , 1913 .

(200)A. V. Wiliams Jackenzie , Avesta Grammar , Part I , Stuttgart W. Kohlhammer , 1892 .

# ناوەرۆک

د. عبدالرحمن الحاج معروف

# قواعد اللغة الكردية

المجلد الأول

## (المورفولوجيا)

القسم الخامس

## - الفعل -

Dr. AWRAHMANI HAJI MARF

# KURDISH GRAMMAR

Volume 1

## (MORPHOLOGY)

Part 5

## -VERB-



Sulaimany- 2000